


# نیتشە و پاش تازەگەری

نووسینی : د. محەمەد کەمال

بابەت: فەلسەفی

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٣٥٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ١٨٢٦ ی ٢٠٠٩

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی: دووەم ساڵی ٢٠٠٩

کوردستان- سلێمانی

www.serdam.org

بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرە کتێبەوە: kteb@serdam.org

# ناوەڕۆک

# پێشگوتار

ئەم نووسراوە هەوڵدانێکە بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفەی نیتشە. لە سەرەتاوە مامەڵە لەگەڵ وەڵامی ئەو پرسیارە دەکات بۆچی پێویستە لە نیتشە تێبگەین؟ ئەمەش هاوکات، ئەو جێگەیە دیاریدەکات کە بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە لە سەردەمەکەماندا و لەم قۆناغەی گەشەکردنی شارستانیەت و مێژووی بیردا داگیری کردووە. لە مێژووی فەلسەفەدا، هەر یەکێک لە فەیلەسوفەکان، ڕۆڵی خۆیان لە گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا بینیوە، بەڵام چەند فەیلەسوفێک توانیویانە سەرەتایەکی نوێ و نەریتێکی مێتافیزیکی جیاوازتر بخەنەگەر. من لێرەدا، لەگەڵ شیکردنەوەی بیروباوەڕی نیتشەدا، ئاماژەم بۆ ڕۆڵی سەرەکی نیتشە کردووە. ئەو خاڵەم ڕوونکردۆتەوە، کە ئەم بیریارە چۆن سەرەتایەکی نوێ و نەریتێکی مێتافیزیکی بۆ دامەزراندوین، کە بە پاش تازەگەری ناوزەد کراوە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە دوو نیوە پێکهاتووە. نیوەی یەکەم شیکردنەوەی بیری فەلسەفی نیتشەیە لەسەر تراجیدیا و هەڵوەشاندنەوەی بناخەی مێتافیزیکی ڕووناکبین و بەستنەوەی تراجیدیای بوونی مرۆڤ بەو (هەڵوەشاندنەوەیە)وە و لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز و گەڕانەوەی هەمیشەیی و داهێنانی بەهاکان و بەکارهێنانی میتافۆر لە شێوازی دەربڕینی فەلسەفیدایە.

نیوەی دووەم، مامەڵە لەگەڵ فەلسەفەی نیتشە پاش نیتشە دەکات و لە سەر بە (نازیکردنی) بیروباوەڕی نیتشە و پاک کردنەوەی ناوی نیتشە لەم گەندەڵییە ڕامیارییە لە لایەن هایدیگەر و تێگەیشتنی

هایدیگەر لە نیتشە و کاریگەرێتی نیتشە بەسەر بۆچوونەکانی پاش تازەگەری دەدوێت. هەر دوو بەشە سەرەکییەکە بۆ مەبەستی پرۆژە فەلسەفیەکەی ئەم نووسراوە گرنگن چونکە دەمەوێت زەمینەیەکی لۆجیکمەندانە بۆ کێشەکە خۆش بکەم و بیسەلمێنم، کە سەردەمەکەمان سەردەمی نیتشەیە و ئەم فەیلەسوفە مەزنە نەریتێکی مێتافیزیکی نوێی دامەزراندووە. پرۆژەی هیچگەرایەتی نیتشەم ناوناوە هیچگەرایەتی بەرنامەگەری، تاکو لە هیچگەرایەتی ڕەشبینانەی جیابکەمەوە و لەسەر بناخەی ئەم پرۆژەیەوە یان لەم بەستێنەوە مامەڵەم لەگەڵ بوونی مرۆڤی بەرز و مردنی (خۆ)ی تازەگەری و هەڵوەشاندنەوەی بەها هەمەکی و نەگۆڕەکان کردووە. هەوڵمداوە بیسەلمێنم، کە هیچگەرایەتی بەرنامەگەری پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی و لۆجیکمەندانەیە بۆ لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز. لەم ڕووەوە، شیکردنەوە و تەفسیرکردنی ئەم بوونەمان لە بەر ڕۆشنایی هیچگەرایەتی و لەو ڕوانگەیەوە ئامادە کردووە. ئەمەش بە بیروڕای من خاڵێکی هەرە گرنگ و ناوەڕۆکی فەلسەفەی نیتشەیە. هاوکات، لەوە دواوم، کە هیچگەرایەتی لەگەڵ خۆیدا و دژوەستانی بەرانبەر مێتافیزیکی ڕووناکبینی هۆشگەرییەکانی، وەک سوکرات و ئەفلاتون و ئەریستۆ، بناخەی بەها و زانین و ڕاستییە هەمەکییەکان هەڵدەوەشێنێتەوە و جەخت لەسەر داکەوتی ڕێژەگەرایەتی و (جیاوازی) یەکان دەکات.

ڕێژەگەرایەتی و مردنی (خۆ)ی تازەگەری و سەرهەڵدانی (جیاوازی) یەکان و هەڵوەشاندنەوەی مێتاگوتارەکان بوونەتە سەرەتایەکی نوێ بۆ بیرکردنەوەی فەلسەفیانە و سەرهەڵدانی بۆچوونەکانی پاش تازەگەری. پاش ڕوونکردنەوەی پاکردنەوەی ناوی نیتشە و بە (نازی نەکردنی) بە تایبەتی لە لایەن هایدیگەر و تێگەیشتنی هایدیگەر لە

نیتشە، کاریگەرێتی ئەم فەیلەسوفەم بە سەر بیروباوەڕەکانی ڕۆلاند بارتس و میشێل فوکۆ و جین فرانسوا لیۆتارد و بۆدلیرالد و گلیس دیلوز و ژاک دێریدا ڕوون کردۆتەوە.

بێگومان هەموو دەق و بەرهەمێکی فەلسەفی بە شێوازی جیاواز دەخوێنرێتەوە و تەفسیر دەکرێت. ئەم نووسراوەش یەکێکە لەو تەفسیرە جیاوازانەی فەلسەفەی نیتشە و هەوڵدانێکە بۆ تێگەیشتن لە بۆچوونە فەلسەفیەکانی. ئومێدەوارم توانیبێتم بیرۆکەی ئەم پرۆژەیەم سەرکەوتوانە بە خوێنەر گەیاند بێت. دڵنیام لەوەی خوێنەر لە هەندێک شوێندا لەگەڵ بۆچوون و شیکردنەوەکانمدا هاوڕا نیە، ئەمەش ڕێگرتن لە تێگەیشتن نیە. هەموو بیرێکی گەورە و پرۆژەیەکی فەلسەفی لە نێو ناکۆکییەکان و مشتومڕ و ڕەخنەگرتندا گەشە دەکات و جێگەی خۆی دیاری دەکات.

لە کۆتاییدا، حەز دەکەم سوپاسی ئەو هاوڕێیانە بکەم بۆ ئامادە کردنی ڕەشنووسەکە بۆ لە چاپدان ئەرکیان کێشا، بە تایبەتی ئاسۆس کەمال، کەریم مستەفا و تابان کەمال. سوپاسی هونەرمەند ڕوشدی ئەنوەر دەکەم بۆ ئامادەکردنی بەرگی ئەم پەرتووکە و دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، کە ئەم نووسراوەیان خستە بەر ڕۆشنایی بوون و بۆیان لە چاپ دام.

د. محەمەد کەمال
زانکۆی مالبۆرن
The University of Melbourne

# بەشی یەکەم
# ئێمە و نەریتی مێتافیزیکی زاڵبووی سەردەم

هەموو سەردەمێک بیرکردنەوەی مێتافیزیکی خۆی هەیە و "ئاگامەندی" لە پەنجەرەی ئەو بیرکردنەوە میتافیزیکییەوە ڕۆشنایی دەخاتە سەر داکەوتی دەوروبەری و لە چییەتی داکەوتەکە دەکۆڵێتەوە. لەوێوە مامەڵە لەگەڵ گرفت و مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان، زانین (ئەپستمە) و بەهاکاندا دەکات. لەبەر ئەو ڕۆشناییەدا، کە لێرەدا بە نەریتی متافیزیکی زاڵبوو ناوزەدی دەکەین گۆڕانکارییەکان دادەهێنێ و پێشوازی لە قۆناخێکی نوێتر دەکات. مەرجیش نیە سەردەمێک خاوەنی یەک جۆر نەریتی مێتافیزیکی بێت و ئاگامەندی نەتوانێت ئاوەڕ لە لایەنێکی دیکە یان چەند لایەنێک بداتەوە. دەگونجێت لە سەردەمێکدا نەریتی مێتافیزیکی فرە جۆر هەبێت یان بۆچوون و بیرکردنەوەی جیاواز بۆ لێکدانەوەی واتای بوون سەرهەڵبدەن. بەڵام یەکێک لەم بۆچوون و بیرکردنەوانە خۆی دەسەپێنێ و دەبێت بە نەریتێکی مێتافیزیکیی زاڵبوو. لە مێژووی پەرەسەندنی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن نەریتی مێتافیزیکی ئەریستۆ دەستەڵاتمەند بوو. ئاگامەندی لە ڕوانگەی سیستەمی مێتافیزیکی ئەریستۆوە لە چییەتی بوونی کۆڵیوەتەوە و لەژێر کاریگەریێتی ئەریستۆدا گەلێک فێرگەی فەلسەفی سەریانهەڵداوە. ئەم فێرگانە، چی لە ڕۆژئاوا یان ڕۆژهەڵات (جیهانی ئیسلامی) ڕاستەقینە و ڕەچەڵەکی "بوون" یان بۆ جۆرێک، وەکو سەدەمی یەکەم یان جوڵێنەری یەکەم گەڕاندۆتەوە

بەبێ ئەوەی ئەو ڕاستییە ڕەچاو بکرێت، کە ئەم جۆرەش، لە بەر ئەوەی بوونێکی تاکە، بۆ ئەوەی هەبێ پێویستی بە "بوون" ـە. ئەم فێرگانە گشتگری و هەموویایەتی بوونیان بۆ جۆرێک لە "بوون" کەم کردۆتەوە. ئەمەش لە خۆیدا نا لۆجیکمەندانەیە چونکە بوونێکی هەندەکی "تاک" ـی لە پاشتر ناکرێت بە بناخەی بوونی هەمەکی لە پێشتر. جوڵێنەری یەکەمیش، ئەگەر بوونی بسەلمێنرێت، ئەوا بەبێ "بوون"، کە دەبێت بە ڕاستیەکی ئۆنتۆلۆجی لە پێشتر نیە و نابێت. لە لایەکی دیکەوە، نەریتی مێتافیزیکی ئەریستۆ نەیتوانیوە بوونی ئاگامەندی و هەبووەکان لە یەکدی جیابکاتەوە و لەسەر دوو بونیادی ئۆنتۆلۆجی جیاواز توێژینەوەکەی دابمەزرێنێت. بێجگە لەم دووخاڵە، کە بە نەرێ دەیانخوێنینەوە و لەگەڵ شوێنکەوتوانی ئەو نەرێییەدا خۆمان بە هاوڕا دانانێین. جوڵێنەری یەکەمیش بوونێکی نەگۆڕ و وەستاوی پێدراوە. لێرەدا ئەو پرسیارە خۆی دەسەپێنێت، چۆن بوونێکی نەگۆڕ و وەستاو گۆڕان و جوڵان دەخوڵقێنێ؟ ئایا هەبوویەکی نەگۆڕ یان وەستاوی، وەک جوڵێنەری یەکەم، دەبێتە هۆ بۆ گۆڕان و جوڵانی جیهان؟ ئایا دەتوانین بڵێین گۆڕان هۆیەکی نەگۆڕی هەیە؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە لای ئەریستۆ و شوێنکەوتوانی نەریتە مێتافیزیکیەکەی ئاشکرایە و ئەوان باوەڕیان بە نەگۆڕی جوڵێنەری یەکەمە. بەڵام بیریان لەو کێشەیە نەکردۆتەوە، کە بۆ جوڵانی جیهان جوڵێنەری یەکەمیش پێویستی بە خۆ جوڵان هەیە. نەریتی مێتافیزیکی ئەریستۆیی لەگەڵ ناکۆکی و کەموکورتیەکانیشیدا، دەربارەی پەیوەندی نێوان جوڵێنەری یەکەم و جیهان و بچووک کردنەوەی بوون بۆ ئۆنتۆلۆجی ناوچەگەرێتی، کە بە تیۆ-

ئۆنتۆلۆجی ناسراوە، توانی جێگای خۆی قایمکات و گەلێک لە بیریارانی ئاینیش پەیڕەویی بکەن. توانی زەمینەش بۆ چۆنیەتی بیرکردنەوەی فەلسەفیانەی سەدەکانی ناوەڕاست خۆش بکات. هەر لەو زەمینەیەشەوە دەستەڵاتی داهێنان و ڕەهایەتی بە جوڵێنەری یەکەم بەخشی و ئاگامەندی لێ نامۆ کرد. یان باشتر وایە بڵێین، کە ئاگامەندی بە بەخشینی ئەو خەسڵەتانە بە جوڵێنەری یەکەم خۆی لێ بێ بەشکرد و لێکدانەوەیەکی هۆیەکی بۆ بوون کرد و سەرچاوەی گۆڕانکارییەکانی بۆ جوڵێنەری یەکەم گەڕاندەوە. بەم شێوەیە، لە بۆچوونی ئەریستۆوە ئەو ڕاستییە دەردەکەوێت، کە مرۆڤ بە زەبوون و نامۆ دادەنێت و لە لای فەلسەفەی ئاینی پاش ئەریستۆشدا، بە تایبەتی لەناو بیروڕای مەسیحایەتیدا، نامۆ بوونەکەیان کرد بە بناخەی هەستکردن بە گوناە و پەشیمانی و بە نزمدانان و سوکایەتی بە ئاگامەندی بەرانبەر جوڵێنەری یەکەم.
لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕێنەسانس و ڕۆشنگەری و تەوژمی تازەگەرێتیدا، بە نیازی یاخیبوون لە مێتافیزیکی ئەریستۆیی[1] و هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەریتە و دامەزراندنی نەریتێکی نۆی، سەرەتایەکی نوێ بۆ گەشتە فەلسەفیەکە دۆزرایەوە. دێکارت، کە بە پێشەوای ئەم قۆناغە دادەنرێت، لە بۆچوونە هۆشەکایەتیەکەیدا، دەستەڵاتی ناسینی ڕاستەقینە و زانینی لە گومانبەدەری دایەوە بە مرۆڤ و کۆجیتۆ بەڵگە نەویستەکەشی "من بیردەکەمەوە، کەوابوو من

1- لێرەدا، لە باتی نەریتی ئەریستۆ (نەریتی ئەریستۆیی)م بەکار هێناوە چونکە نەریتی مێتافیزیکی ئەریستۆ، لە ئاکامی گۆڕانکارییەکان و پەرەسەندنی بۆچوونی فەلسەفیانە لە لایەن شوێنکەوتوانی ئەریستۆوە لە (ئەسکەندەری ئەفرۆدرساس) و (پرۆفری) یەوە، تاکو (ئەلبرتی گەورە) و (تۆماس ئەکویناس) گەشەیکرد و تەفسیری فرە جۆری بۆ کراوە و بیروباوەڕی نوێی خراوەتە سەر.

هەم.“ کرد بە سەرەتای گەشتەکەی. ئەو گەشتە فەلسەفییەی بوو بە نەریتێکی نوێ و جێگای نەریتی زاڵبووی ئەریستۆیی گرتەوە. بە بیروڕای من دژوارە ئەو خاڵە بسەلمێنرێت و بە تەواوی ئاماژەی ئەو کێشەیە بکرێت، کە گوایە، دێکارت توانیویەتی شۆڕش بەسەر شێوازی مێتافیزیکی ئەریستۆدا بکات و نەریتەکەی هەڵبوەشێنێتەوە. بێگومان نکۆڵی لەوە ناکرێت و چاویش لە ئاستی ئەو ڕاستیەدا داناخەین، کە بۆچوونەکانی دێکارت لێکدانەوەیەکی نوێی بۆ بوونی (خۆ) کردووە و جێگایەکی گرنگی لە فەلسەفەکەیدا بۆ داناوە. کۆجیتۆکەی سەرەتا و دەست پێکردنێکی نوێی ڕەخساندووە و تەفسیرێکی نوێی بۆ بوونی مرۆڤ کردووە. هاوکات، (خۆ) لە مێتافیزیکی دێکارتدا بونیادێکی ئۆنتۆلۆجی نەگۆڕ و خۆرسکێکی چەسپاوی پێدراوە. لە لای دێکارت (خۆ) جەوهەرێکی گیانەکییە و ناسنامەی خۆی لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی لەش و ڕووداوەکانی ناو مێژوودا ون ناکات و هەمیشە، وەکو خۆی دەمێنێتەوە. خۆیەکە لە ژوور گۆڕانکارییەکانەوە و لەو دیو پەیوەندییەکان و خۆبەستنەوە بە جیهانی ئەستوو یان لەشەوە. خۆیەکە چەق چەسپاو و خۆ بە حەقزان. (خۆ) کەی نێو نەریتی مێتافیزیکی دێکارت بەرهەم و هۆکردی تێگەیشتنی تازەگەرایەتیانەیە بۆ بوونی مرۆڤ و سەر بە بەستێنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگای لیبراڵە. بەردەوام بوونی ئەم جۆرە بۆچوونەش وابەستە بە بەردەوامی بەستێنەکەوە. (خۆ) یەکە لە ڕوانگەی خۆ بە حەقزان و لایەنگیرییەوە دەڕوانێتە دەوروبەر و خۆشی بە چەق و سەنتەری ڕووداوەکان دادەنێت. بێجگە لە بوونی خۆی، (وەکو جەوهەرێکی گیانەکی و خاوەن ناسنامەیەکی نەگۆڕ)، داکەوتی دەرەکی دەخاتە بەر کاریگەرایەتی گۆڕانکارییەکانەوە. بۆ سەقامگیرکردنی یۆتۆپیاکەی و وەدیهێنانی خەونەکانی، ئەم (خۆ)یە

باوەڕی بە جیاوازی و پێکەوەژیانی جیاوازییەکان نیە. جیاوازییەکان بۆ ئەم دەبن بە دەستەڵاتی هەڕەشەکەر و هەڵوەشاندنەوەی بناخەی یۆتۆپیاکەی. جیاوازییەکانی (خۆ) لە نێوان خۆی و خۆیەکانی دیکەدا، (بە تایبەتی ئەگەر دیکە جیاواز بێت) هەروەها لەگەڵ جیهانی دەرەکییدا (سروشت) ناحەز و سەرچاوەی ناکۆکین. ئەمەش لەبەر ئەو هۆیە نیە، گوایە (خۆ) هێندە خۆنەویستە و دیکەخوازە نایەوێت جیاوازی لە نێوان خۆی و ئەوانی دیکەدا ببینێت. هەڵوێستی نەرێی (خۆ) بەرانبەر جیاوازییەکان لەوێدایە، کە بۆ ئەم جیاوازییەکان دەبن بە نەیار و هێزی هەڕەشەکەر. تەنیا ڕێگەچارەیەکیش بۆ لەناوبردنی ناکۆکیەکان و ئەم هێزە هەڕەشەکەرە سڕینەوە و ڕوخاندنی بناخەی جیاوازییەکانە. ئەمەش لە ڕێگەی "داگیرکردن" ی کەسانی دیکە و سروشتەوە وەدەست دەکەوێت. (خۆی دێکارتی) یان باشتروایە بڵێین (خۆی تازەگەرایەتی) لەناو سیستەمە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکەیدا و لەو بونیادە ئۆنتۆلۆجیەوە، کە لەلایەن دێکارتەوە بۆی دامەزراوە، بورژوا و خاوەن دەستەڵاتی ڕامیاری قۆناخەکەیەتی. خۆیەکی فاشیستە و نایاری جیاوازییەکانە و لە دەستگای خێزانیشدا خاوەن دەستەڵاتی باوکایەتییە و ڕۆڵی (منی بەرز) ی دەرونشیکاری فرۆید دەبینێت. بەو شێوەیەی ڕوونمان کردەوە، خۆی تازەگەری خاوەنی بەستێنێکی کۆمەڵایەتییە، بەڵام دێکارت بە "لە مێژووبەدەر" لە قەڵەمی دەدات و خۆرسکێکی نەگۆڕ و سەربەخۆی پێداوە، کە ئەو خۆیە، دەکات بە هەبوویەکی نەگۆڕ و خۆبژێو. دەبێت بە بوونێک لەو دیو لەش و دیاردەی گۆڕانکارییەکانی لەشەوە خۆی دەنوێنێ. خۆیەکە لە بەر ئەوەی جەوهەرێکی گیانەکییە و وەکو لەش ناکەوێتە بەر ڕۆشنایی زانینی ئەزموونگەرێتییەوە و لە دەرەوەیدا بە تەواوی ناناسرێت. ئەمەش

گرفتێکی بنەڕەتی ئەپستمۆلۆجی بۆ ناسینی ئەم بوونە پێکدەهێنێت و کەموکورتی دەستەڵاتی زانینمان لە ئاستیدا دەخاتەڕوو. شاراوەیی و نەناسینی خۆ، لە لایەن خۆیەکی دیکەوە، کەمدەستەڵاتی تێگەیشتن و هەژاری زانینە لە نێوانیاندا، کە لەهەمان کاتدا کاریگەرێتی نەرێ دەکاتە سەر پەیوەندییەکانی نێوانیان. تاکەکانی ناو کۆمەل، کە هەر یەکێک لەوان جەوهەرێکی گیانەکی نەگۆڕ و سەربەخۆیە، بە ڕێگەی تێگەیشتن یان ناسین بە بێگانەیی دەمێننەوە. چونکە ناوەڕۆکی گیانەکی بە پێچەوانەی هەبوویەکی ئەستوییەوە، وەک لەش، شتێک نیە بە ڕێگەی هەستکردن بناسرێت. هەروەها دێکارت زانین بە تاکە پردی پەیوەندییەکانی نێوان (خۆیەکان) دادەنێت و خۆیەک بە زانین دەتوانێت خۆیەکی دیکە بناسێت و لە بوونی تێبگات. نەریتی خۆی تازەگەری، وەکو باسمان کرد، بە تەنیا لە "بە مێژوو نەکردنی" ئەم بوونەدا نیە، بەڵکو لە سەرو ئەمەشەوە، خۆیەکی شاراوە و نەناسراوە، دوورگەیەکە، کە هەرگیز ناتوانین بە هەموو لایەکییدا بگەرێین و بە تەواوی بیناسین. ئەم گرفتە ئەپستمۆلۆجییە بۆتە جێگەی ئاکامە کۆمەڵایەتییە نەرێکان و ڕەگ و ڕیشەی لەناو نەریتی مێتافیزیکی دێکارت و ئەو بویناده ئۆنتۆلۆجییەدایە، کە ئەم بیریارە بوونی مرۆڤی لەسەر دامەزراندووە.

دێکارتیش، وەک ئەفلاتون، لە ئەپستمۆلۆجییەوە ڕوو لە ئۆنتۆلۆجی دەکات، بەبێ ئەوەی بزانێت، کە ئۆنتۆلۆجی بناخەی ئەپستمۆلۆجییە و لە پێشترە. بونیادی ئۆنتۆلۆجی خۆ، لە مێتافیزیکی دێکارتدا، جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان خۆ و هەبووەکاندا دەستنیشان کردووە. خۆ، وەکو هەبوویەک، خاوەنی چییەتییەکی پڕ و نەگۆڕە و خۆرسکێکی نەگۆڕی پێدراوە. بۆ دێکارت، پێناسکردنی خۆ، وەک

پێناسکردنی شتێکی هەبووی گونجاوە و ئاسانە، چونکە خۆ، سەر بە جەوهەرێکی نەگۆڕ و چەسپاوە و بوونێکی پڕی هەیە، کە لە پێشتردا بۆی سازکراوە. نەریتی زاڵبوی مێتافیزیکی دێکارت، بە تایبەتی بۆچوونەکانی بەرانبەر بونیادی ئۆنتۆلۆجی خۆ، لە لایەن چەند بیریارێکی تازەگەرێتیخوازەوە خراوەتە بەر ڕەخنەکاری. بەڵام یەکێک لەو بیریارانەی بە توندی ڕەخنەی لە نەریتی دێکارت گرتبێت و هەوڵی دابێت ڕادیکاڵانە مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا بکات (مارکس)ە. ئەم بیریارە بوێرانە، بناخە مێتافیزیکییەکەی دێکارتی هەڵوەشاندۆتەوە و جیاوازتر مامەڵەی لەگەڵ بوونی مرۆڤدا کردووە. (خۆی نەریتی زاڵبوی دێکارتی) لە لای مارکس، خۆیەکی بورژوایە و هەڵوەشاندنەوەی بناخە ئابوورییەکەی دەکات بە ڕوودانێکی حەتمی بۆ ئەو خۆیە. لەم ڕێگەیەوە، لەگەڵ داگیرکردنی دەستەڵاتی ئابووری (خۆی نەریتی دێکارتدا)، یۆتۆپیای خۆی بورژوا دەڕوخێنێ و یۆتۆپیایەکی نوێتر بناخەڕێژ دەکات. یۆتۆپیا نوێکەی مارکس لە سەدەی ڕابردوودا هێندە کاریگەر و سەرنجڕاکێشەر بوو کەم بیریار و ڕۆشنبیر توانیویەتی ئاوەڕی لێنەداتەوە و بە باش و خراپ نەکەوتبێتە ژێر کاریگەرێتییەوە. بەڵام یۆتۆپیاکەی مارکسیش لە کەموکورتی بێبەش نیە و نەیتوانیوە بە تەواوی خۆی لەناو ناکۆکییەکانی تازەگەرێتیدا دەرباز بکات. مارکس لە دژوەستانیدا بەرانبەر "خۆی بورژوای نەریتی دێکارتی" یان "خۆی تازەگەرایەتی" ئەو نەریتەی ڕەتداوەتەوە و لە (خۆ) یەک دەدوێت، کە بە (کۆمەڵ و مێژوو) ەوە گرێدراوە. لە هەمان کاتدا (خۆی نەریتی مارکسی)، وەکو (خۆی نەریتی دێکارتی)، ئاسەواری جیاوازییەکان دەسڕێتەوە و سەرکوتیان دەکات. میتۆدی دیالێکتیکی مارکس یان دیالێکتیک بەگشتی، لە هیگڵەوە هەموویەتی لە سەروو ڕاستی هەندەکی و

قۆناغەکانەوە ڕادەگرێت. ئەگەر بەرنامەیەکی Totalityفەلسەفی ڕادیکاڵ هەبێت، ئەوا پێویستە گۆڕانکاری لە (هەموو) دا بهێنێتە کایەوە و گشت لایەنەکانی ئەم (هەموو)ە بگێڕێتەوە و لایەنێک لە لایەنێکی دیکە بە کەمتر و نزمتر دانەنێت. مارکس، کە شوێنکەوتوی میتۆدی دیالێکتیکە باوەڕی بەم خاڵە هەیە بەڵام پەیڕەوی نەکردووە. ئەو (هەموو)ی لە سەر لایەک ڕاگرتووە یان لایەکی ئەو هەمووە لە لایەکانی دیکە بە گرنگتر و لە پێشتر ڕیز دەکات. لەو باوەڕەدایە گۆڕانکاری لە ژێرخانی ئابووری، کە لایەنێکی (هەمووەکەیە)، گۆڕانکارییە بنەڕەتیەکانی نێو (هەموو) دەخولقێنێت. سەرەڕای ئەمەش، مارکس و مارکسیەکان، وەکو شوێنکەوتوانی تازەگەرایەتی کۆمەڵ و سروشت و بوون و هەبوون بە بێ دەستنیشانکردنی جیاوازییە ئۆنتۆلۆجیەکان لە نێوانیاندا دەخەنە بەر ڕۆشنایی توێژینەوەی زانستانەوە و یاساکانی سروشت بە سەر کۆمەڵدا دەسەپێنن و لە ئێستاوە یان لە پێشوەختەوە بە دڵنیاییەوە لەمەڕ ڕووداوەکانی داهاتوو دەدوێن. هەڵوێستیان لە ئاستی میتۆدەکەیاندا تازەگەرێتیانەیە و بەئامێرێکی هەمیشە نەگۆڕی دادەنێن و لەو باوەڕەدان میتۆدەکەیان دەتوانێت تەفسیری هەموو دیاردە و ڕووداوێکی ناو مێژوو بکات و تەفسیرەکەش دوا تەفسیر و تاکە بۆچوونێکی زانستییانە بێت. ئەمەش لەسەر ئەو خاڵە وەستاوە، کە مارکس و مارکسیەکان بیردۆزەکەیان بە (مێتا-گوتار) و هەمەکی و هەمیشە دروست نیشان دەدەن. لەبەر ئەم هۆکارەش ڕەتدانەوەی (خۆی بورژوازی نێو نەریتی دێکارتی) لە لایەن مارکس و مارکسیەکانەوە ڕادیکاڵانە نیە و تازەگەرایەتی ڕەتنەکردووە، بەڵکو لەناو دۆگمای تازەگەرایەتیدا پەنگیخواردۆتەوە. مانەوەیان لەناو نەریتی فەلسەفییانەی تازەگەرایەتیدا و سەپاندنی مێتا-گۆتارەکەیان

بەسەر هەموو دیاردەیەکی ناو مێژوودا و لەناوبردنی جیاوازییەکان بوونەتە ڕێگر و کۆسپ بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەڵوێستی خۆویستی (نێرسیستی) و خۆ بەحەقناس لەلای (خۆی مارکسیانە). (خۆ) لە نەریتی مارکسیدا هەرچەندە بناخەیەکی مێتافیزیکی جیاوازتری هەیە بەڵام، وەکو(خۆی بورژوای نەریتی دێکارتی) لەناو خەونی خۆویستی و دەستەڵاتی تەنیاخۆییدا دەژی و خەون بە ڕوخاندنی جیاوازییەکانەوە دەبینێت.

بانگەشەکردنی مێتافیزیکییەکی نوێ پاش ڕەتدانەوەی نەریتی زاڵبووی دێکارتی و تازەگەرایەتی بە گشتی پێویستی بە ڕەچاوکردنی ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە هەیە،

یەکەم، هەڵوەشاندەنەوەی بناخەکانی مێتا-گۆتارو بیردۆزە.

دووەم، هەڵوەشاندنەوەی بونیادی ئۆنتۆلۆجی (خۆی دێکارتی) و کۆتایی هێنان بە بوونی ئەو (خۆ)یە.

سێیەم، هەڵوەشاندنەوەی بەها هەمەکییەکان.

چوارەم هەڵوەشاندنەوەی زانینی هەمەکی و دامەزراندنی ئەپستمۆلۆجیەکی نوێ.

پێنجەم، هەڵوەشاندنەوەی ڕاستی هەمەکی و گەڕانەوە بۆ ڕاستیەکان.

شەشەم، گەڕانەوە بۆ ڕێژەگەرایەتی.

پەیڕەویکردنی ئەم خاڵانە سەرەتایەکی بیرکردنەوەی فەلسەفیانەی نوێمان بۆ ئاماژە دەکات. سەرەتایەک، کە لەگەڵ خۆیدا کۆتایی بە قۆناغی پێشوتر دەهێنێت و لە سەرەڕێی گەشتێکی نوێتر ڕامان دەگرێت. ئەگەر بەرنامە ڕادیکالییەکەی مارکس بۆ

ڕەخساندنی گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو لەگەڵ ڕەتتدانەوەی نەریتی مێتافیزیکی دێکارتییدا نەتوانێ گۆڕانکارییە بنەڕەتییە فەلسەفییەکە بهێنێتەکایەوە و بەرەو سەرەتایەکی نوێمان بەرێت و کۆتایی بە سەردەمی تازەگەرایەتی و قۆناغی لە پێشوتر بهێنێت، ئەوا دەتوانین بڵێین بیروباوەڕی فەلسەفیانەی مارکس شێوازێکی بیرکردنەوەی تازەگەرایەتییە و خۆی لە نێو دۆگمای بنەڕەتخوازی و مێتا-گوتار ڕزگار نەکردووە. ئاوەڕدانەوە لە بۆچوونی فەلسەفیانەی پاش مارکسیش ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە (نیتشە) تاکە فەیلەسوفێکە بیرکردنەوە مێتافیزیکییەکەی و بۆچوونە فەلسەفیەکانی لەگەڵ ئەو شەش خاڵانەدا ناکۆک نین و دەگونجێن. هەڵوێستی ئەم فەیلەسوفە بەرانبەر تازەگەرایەتی، بەپێچەوانەی هەڵوێستی مارکسەوە، ڕادیکاڵترە و بنەڕەتایەتی و مێتا-گوتار هەڵدەوەشێنێتەوە. لەگەڵ تێکشکاندنی دۆگمای تازەگەرایەتیدا بانگەشەی ڕێژەگەرایەتی زانین و ڕاستی و بەهاکان دەکات. دژوەستانی بەرانبەر دۆگمای تازەگەرایەتی لە پێناوی دامەزراندنی دۆگمایەکی دیکەدا نیە و هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەتایەتی و ڕووبەڕوو بوونە لەگەڵ (هیچ) دا. مێتافیزیکی پاش-تازەگەریایەتی ئەگەر لە سەر ئەم خاڵە هاوڕابین، دەگەینە ئەوباوەڕەی لە (هیچ)ەوە یان لە هیچگەرایەتی نیتشەوە گەشتەکەی دەخاتە گەڕ. لێرەدا دەبینین پاش-تازەگەرایەتی، وەک تازەگەرایەتی خاوەنی بۆچوونی مێتافیزیکی خۆیەتی و ئەو بۆچوونەشی بووە بەبناخەی ئەپستمە و ڕاستی و بەهاکان. هەموو سەردەمێک لە سەر بناخەی بۆچوونی مێتافیزیکیانە، شێوازەکانی دیکەی بیر بەرجەستە دەکات و ڕۆشناییان دەخاتە سەر. سەرەتا نوێکەمان لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفیانەدا لەگەڵ خۆیدا نەریتێکی نوێی مێتافیزیکی بەناوی هیچگەرایەتیەوە بۆ دامەزراندووین. لەم

ڕووەوە، سەرەتای سەرەتا نوێکەمان، کە کۆتایی تازەگەرایەتیە سەربەنەریتی مێتافیزیکی هیچگەرایەتیە و ئەم شێوە مێتافیزیکەش لەم قۆناغەدا لە فەلسەفەی نیتشەوە سەر هەڵدەدات. هیچگەرایەتی هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەتی بوون و گەڕانەوەی ڕەچەڵەکی بوونە بۆ (هیچ). ئەم هەڵوەشاندنەوەیەش چوار شێوازی گرنگی هەیە: هیچگەرایەتی ئۆنتۆلۆجی، مێژوویی، ئەپستمۆلۆجی و ئاکاری یان ڕەوشتگەری. هیچگەرایەتی ئۆنتۆلۆجی، بناخەی شێوازەکانی دیکەیە و لە هەموویان لە پێشترە. بەبێ هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەتی بوون، یان بەبێ ئۆنتۆلۆجی، بیر لە لایەنەکانی دیکە ناکرێتەوە. لەبەر ئەم هۆکارە و لە پێشترێتی ئۆنتۆلۆجی، پێویستە لە سەرەتاوە واتای هیچگەرایەتی ئۆنتۆلۆجی لێک بدەینەوە و لە وێوەوە مامەلە لەگەڵ شێوازەکانی دیکەدا بکەین. هیچگەرایەتی بە واتا ئۆنتۆلۆجیەکەی گەڕانەوەی ڕەچەڵەکی بوونە بۆ (هیچ). لێرەدا ئەو پرسیارە یەخەمان دەگرێت، ئایا بنەڕەتی بوون چییە؟ ئەم پرسیارە هاوکات داوای مەبەست وغایەیەکی لە پێشترمان لێدەکات. لە مێژووی فەلسەفەدا لە سەردەمی ئەریستۆوە گەلێک لە بیریاران پەیڕەوی مێتافیزیکی ئەرستۆیان کردووە و لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا بنەڕەتی بوونیان بۆ (سەدەمێکی هۆشەکی) یان (جووڵێنەری یەکەم) گەڕاندۆتەوە[2]. هەروەها لەو باوەڕەدا بوون، کە سەدەمی هۆشەکی،

2- سەدەم، هۆ: ئەم زاراوەیەم بۆ "هۆ" بەکارهێناوە بە تایبەتی بۆ هۆی مێتافیزیکی، کە ئەرستۆ بە جوڵێنەری یەکەمی دادەنێت. لەم ڕووەوە، سەدەم هۆیەکی هۆشەکی و ئاگامەندە و لە واتای زانستانەی "هۆ" وە جیاوازە. سەدەم و هۆ یەک واتایان هەیە، بەڵام من بەکارهێنانی ئەم دوو زاراوەیەم جیاکردۆتەوە. لە کاتێکدا دەڵێین (ئاگر هۆیە بۆ سوتاندن.) لەمەڕ"هۆ" ی زانستانە دەدوێین، کە لە سەدەمەوە جیاوازە.

مەبەست و غایەی لە پێشتری بۆ بوون داناوە و بۆ گەیشتن بەو مەبەستە (تیلیۆ *Teleo*) بوون لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی سەدەمی هۆشەکییدا لە جوڵاندایە. لە بەر ڕۆشنایی ئەم لێکدانەوەیە بۆ بوون و دامەزراندنی مەبەستێکی لە پێشتر، هیچگەرایەتیی ئۆنتۆلۆجی لەگەڵ ڕەتدانەوەی ئەم بنەڕەتە و مەبەستی لە پێشتر بۆ بوون دەست پێدەکات. وەڵامی نەرێی ئەو پرسیارەیە، کە داوای بنەڕەتی بوونمان لێدەکات و دەمانگەیەنێتە باوەڕهێنان بە بێ واتایی و لە غایە بەدەرێتی بوون. لە شێوازی هیچگەرایەتی ئۆنتۆلۆجییەوە خۆمان دەگەیەنینە شێوازەکانی دیکە، چونکە ئۆنتۆلۆجی پێشمەرجە بۆ زانین و ڕاستی و بەهاکان. لەم ڕووەوە، ڕەتدانەوەی بنەڕەتی بوون (بنەڕەت، وەک سەدەمێکی هۆشەکی) بێ واتایی و لە غایە بەدەرێتی مێژوو دەردەخات و گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو، لەم بۆچوونە هیچگەرایەتیەوە، بۆ غایەیەکی لە پێشتر دانراو ناگەڕێنەوە و دەستەڵاتێکی هۆشەکی مێتافیزیکیش سەرپەرشتیان ناکات. مێژووش، وەک بوون، بێ خاوەن و بێ ئاگایە و هەرچ واتا و مەبەستێکیشی تێدا بێت، ئەوا لە پاشتر بە مێژوو دراوە. زانین و ڕاستی و بەهاکانیش، بە هەمان شێوە، دەبن بە هەندەکی و داهێنراوی لە پاشتر و لە ژێر کاریگەرێتی گۆڕانکارییەکان و لە ناو بەستێنی مێژوویی خۆیاندا بەردەوام گۆڕانیان بەسەردا دێت. سەرچاوەیەکی هەمەکی و نەگۆڕ و لە پێشتریان نیە. بەم جۆرە، لەگەڵ مێتافیزیکی هیچگەرایەتییدا لە زەمینەیەکی نەگۆڕ و ژووربالاو ڕەهاگەرێتیەوە بۆ سەر زەمینەی ڕێژەگەرایەتی دەگوێزینەوە. ئەمەش ڕوودانێک نیە ئاوڕی لێنەدرێتەوە و بایەخێکی بۆ دانەنرێت، بەڵکو، دەرەنجامێکی زەروری لۆجیکمەندانەی ڕەتدانەوەی نەریتی مێتافیزیکی دێکارتییە. هیچگەرایەتی و ڕێژەگەرایەتی پەیوەندی بنەڕەتییان لە نێواندا هە یە

و ناتوانرێت لەگەڵ هیچگەرایەتییدا باوەڕ بە ڕێژەگەڕایەتی نەکرێت. بە پێچەوانەشەوە، کێشەکە وەک (سێ گۆشەی چوارلا) پارادۆکسە (دژوازی) و پێکەوە دانانیان ناگونجێت.

بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی ئەمڕۆ، ئەگەر بیەوێت ڕەخنەگرانە و داهێنەرانە بڕوانێتە کێشەکانی بوون، ناتوانێت نیتشە بە جیدی وەرنەگرێت. سەردەمەکەمان سەردەمی نیتشەیە. بۆ سەلماندنی ئەمەش دەبێت بە وردی مامەڵە لەگەڵ بیروباوەڕییدا بکەین و ئەو بۆ چوونانەی شیبکەینەوە، کە دەبنە سەرەتای بیرکردنەوەی پاش تازەگەرایەتی و نەریتێکی مێتافیزیکی نوێ. پێش هەستان بەم کارە با ئەم چەند خاڵەش ڕەچاو بکرێت: نیتشە یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی، وەک هایدیگەر لێکدانەوەی ناڕەوای بۆ کراوە و لۆمەی خراوەتە پاڵ. بێگومان ناڕەوایکردن بەرانبەر نیتشە تاکو ڕادەیەک لەوەی هایدیگەرەوە جیاوازە چونکە نیتشە پێش سەقامگیربوونی ڕژێمی نازییەکان مردووە، هەروەها هایدیگەر بۆ مەبەستی تایبەت پەیوەندی بەو ڕژێمەوە (بۆ ماوەی نۆمانگ) کردووە، کە تاکو ئەمڕۆش نەیارانی ئەم دوو فەیلەسوفە تاوانی نازییەت دەخەنە پاڵیان[3]. بە نازیکردنی نیتشە دەگەڕێتەوە بۆ ئەلیزابێتی خوشکی ئەم فەیلەسوفە و بانگکردنی هیتلەر بۆ کردنەوەی ئەرشیفی نیتشە و بە زۆر خزانی بۆچوونەکانی نیتشە بۆ ناو ئایدۆلۆجی نازی لە لایەن

---

3- لێرەدا بواری ئەوە نیە لەمەڕ هایدیگەر و ئەو هەڵوێستەی بدوێین. بۆ ئەوەی خوێنەر باشتر ئاگاداری ئەم مەسەلەیە بێت دەتوانێت چاوپێکەوتنی هایدیگەر لە گۆڤاری *Der Spiegel* بخوێنێتەوە، کە من لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی وەرمگێڕاوە و دەستگای سەردەم وەکو پەرتووکی گیرفان بڵاوی کردۆتەوە.

ئەلیزابێتەوە. هایدیگەریش، کە بوو بە سەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ بۆ پاراستنی زانکۆ و ڕاگیرکردنی دەستەڵاتی خوێندکارە نازییەکان چووە ناو پارتی دەسەڵاتدارەوە. کاتێک زانی کارەکەی بێهودەیە و ناتوانێت زانکۆکەی بپارێزێ وازی لە سەرۆکایەتی زانکۆ هێنا و لەلایەن نازییەکانەوە سزادرا[4].

نیتشە بە پێچەوانەی زۆربەی فەیلەسوفەکانی دیکە بۆ چوونە فەلسەفییەکانی بە زنجیرەیی و سیستەماتیکی نەنووسیوە. خوێنەر بۆ ئەوەی لە لایەنێکی فەلسەفەکەی بگات دەبێت زیاد لە بەرهەمێکی بخوێنێتەوە. بۆچوونە فەلسەفییەکانیشی خراونەتە ناو کاڵای ئەفۆریزم و شوبهاندنەوە، ئەمەش هۆکارێکی دیکەیە بۆ ماندووبوونی خوێنەر.

لە ئاست تێگەیشتنی واتای کێشە فەلسەفیەکانییدا لەم لێکۆڵینەوەیەدا بێجگە لە سوود وەرگرتن و گەڕانەوە بۆ بەرهەمە سەرەکیەکانی نیتشە پەنام بردۆتە بەر بۆچونەکانی یاسپەرز، هایدیگەر، ڤاتیمۆ، کاوفمان و گەلێک بیریاری دیکەش، کە لە سەر نیتشەیان نووسیوە و کاریگەرێتی خۆیان لە پێشخستن و گەشەکردنی فەلسەفەکەیدا هەیە. پەرتووکەکەی کاوفمان، کە بۆ یەکەمجار ساڵی١٩٥٠ بە زمانی ئینگلیزی لە چاپدرا، یەکەم هەنگاوە هەوڵی دوورخستنەوەی نیتشە لە نازیزم و پاککردنەوەی ناوی ئەم فەیلەسوفە بدات. پەرتووکەکەی یاسپەرز ساڵی ١٩٣٦ بە ئەڵمانی و ساڵی١٩٦٥ بە ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە. هایدیگەریش لە ساڵی

4- هایدیگەر و کارڵ بارت لە لایەن نازییەکانەوە سزادران و بۆ چاڵ هەڵکەندن ڕەوانەکران چونکە بە بیروڕای ڕژێم ئەوان نیشتمان پەروەر نەبوون.

١٩٣٦ تا١٩٤٠ چوار کۆرسی لە سەر نیتشە لە زانکۆی فرایبۆرگ ئامادە کرد و لە ساڵی١٩٦١ وانەکانی بڵاوکرایەوە و دەیڤید فارێل کرێل وەریگێڕاون بۆ ئینگلیزی و ساڵی١٩٧٩ لە چوار بەرگدا لە چاپدران. گیانیی ڤاتیمۆ لە ساڵی١٩٨٥ پەرتووکێکی لەسەر نیتشە بڵاوکردەوە. گەلێک پەرتووک و سەرچاوەی دیکەش هەن بۆ نووسینی ئەم باسە سودم لێوەرگرتون و لە کاتی پێویستدا لەناو باسەکەدا ئاماژەیان بۆ دەکەم.

# بەشی دووەم

## بیرکردنەوەی فەلسەفییانە و ناوەڕۆکی تراجیدیا

پەیوەندی نێوان بیرکردنەوەی فەلسەفییانە و ناوەڕۆکی تراجیدیا لە بۆچوونی هیچگەرایەتییەوە، وەک شێوە و ناوەڕۆکی بەرهەمی هونەری لە یەکدی دانابڕێن. مادامەکی فەلسەفە لە واتای بوون دەکۆڵێتەوە و بوونیش تراجیدییە، ئەوا تراجیدیا بابەتی لێکۆڵینەوەی فەلسەفییانەیە. فەلسەفە لە بێبنەڕەتایەتی و کاتیەتی بوون و حەتمیەتی کۆتایی پێهێنانی ئەو بوونە دەکۆڵێتەوە. بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لە لێکۆڵینەوەکەیدا وێنەیەکی لێوەرگیراوی تراجیدیاکە دەرخات و هەوڵی گۆڕانی ئەو تراجیدیایە دەدات. تراجیدیای بوون لە نێو کاتییەت و بڕانەوەی ئەم بوونە خۆی دەنوێنێت. مرۆڤ (هەیە)، بۆیە دەبێت بمرێت و بڕانەوە و کۆتایی هێنانی دەرەنجامێکی نەگۆڕ و حەتمییە. (مردن) دەسەڵاتی دیار و نادیاری تراجیدیاکەیە، بۆیە سیلنۆس لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی میدیاس دا گوتی؛ بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو کەسەیە، کە لە دایک نەبووە[5]. ئەم وەڵامەی سیلنۆس ناوەڕۆکی تراجیدیای بوونمان بۆ دەردەخات. ئەو ڕاستیەمان بۆ ئاماژە دەکات، کە بڕانەوەی بوون وەکو سەرەنجامی ڕەوتی ئەم بوونە بە مردن دەگات و مرۆڤ لەو ساتەوە

---

5 - بڕوانە:
Sophocles. *Oedipus at Colonus*, Lines 1224 ff.

هەروەها بڕوانە:
Lon- Jenny, March. *Cassell' s Dictionary of Classical Mythology*, don : Cassell , 2002. P. 701.

ژیانی (لێرەدا) دەستپێدەکات بەرەو بڕانەوە و مردن دەڕوات. ئەم کێشەیەش هۆکاری سەرهەڵدانی دوو شێوازی بیرکردنەوەی جیاوازە لە ئاستی واتای بووندا. یەکەم بیرکردنەوەی دڵخۆشکەرانە و چاندنی ئومێدێکی بێ بناغە بۆ بەردەوام بوونی ژیان پاش مردن. دووەمیش هەوڵدان بۆ گۆڕینی واتای تراجیدیاکە بە بێ ئاماژەکردن بۆ ئومێدی بەردەوامی و نەبڕانەوەی بوون. شێوەی بیرکردنەوەی یەکەم، کە نامەوێ لەم بوارەدا باسیبکەم، دۆگمای ئایینییە و شێوەی دووەمیش بیرکردنەوەی فەلسەفییانەیە. ئەگەرچی ئەم شێوە بیرکردنەوەیە داکەوتی بڕانەوە و کاتیەتی بوون ناگۆڕێت یان نایەوێت ئەو داکەوتە بگۆڕێت، بەڵام لە توێژینەوەی واتاکەیدا واتایەکی دیکەی پێدەدات و کاڵای بەهایەکی نوێتری بە بەردا دەکات. هەستان بەم کارەش، هەڵگری بیروباوەڕی فەلسەفییانە هەڵوێستی بەرەنگاریکردن و شەڕەنگێزی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت. وەک سوکرات خۆی ئامادەی خواردنەوەی پیاڵەی ژەهرەکە دەکات و دەبێت بە یاخیبوویەکی نەترس. ئەو دەیەوێت بە تراجیدیای بوونی خۆی واتای تراجیدیای بوون بگۆڕێت و لە مردندا ژیان و لە بڕانەوەدا نەبڕانەوە بدۆزێتەوە. ئەگەر سوکرات پیاڵەی ژەهرەکەی نۆش نەکردبایە و ئاڵای سپی هەڵبکردایە، ئەوا بیرکردنەوەی فەلسەفییانەش لەگەڵ تەسلیم بوونییدا دەمرد.

بیرکردنەوەی فەلسەفییانە داهێنەرانە و هەڵوەشێنەرانەیە و بەدوای ڕاستییە شاراوەکاندا دەگەڕێت و لەو ڕووداوانە دەدوێت، کە هێشتا ڕوویان نەداوە و دەبێت ڕوو بدەن. سوربوون لەسەر داهێنان و هەڵوەشاندنەوە بە بێ بەرهەڵستیکردن و بەرەنگێزیکردن ڕوونادات. ئەم دوو خەسڵەتە بیرکردنەوەی فەلسەفییانە بێ دابەزین لە

ئاستی تێگەیشتن دەکات بە هێز دژی نەریتی باو و بیرکردنەوەی مێتافیزیکی سەردەم و هەوڵی ڕەتکردنەوەی دەدات. هەڵگری بیروباوەڕی فەلسەفییانەش مرۆڤی ئازاد کراوە لە دۆگمای نێو ئەشکەوتی میتافۆری ئەفلاتونی و ناسراوی ڕاستییەکانی دەرەوەی ئەشکەوتەکەیە. لە پێناوی هەڵوەشاندنەوەی ئەو دۆگمایەدا بۆ نێو ئەشکەوتەکە دەگەڕێتەوە. بەڵام بەو شێوەیەی ئاماژەی بۆ کرا گەڕانەوە بۆ نێو ئەشکەوتەکە و هەڵوەشاندنەوەی دۆگما و نەریتە باوەکە داوای هەڵوێستی ڕادیکاڵانە و شەڕەنگێزی لە مرۆڤە ئازادەکە دەکات. ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بەرهەڵستکاری لە لایەن کەسانێک، کە چاویان بە تاریکی ناو ئەشکەوتەکە فێربووە و ناتوانن ڕووناکی دەرەوە ببین و دەیانەوێت پارێزگاری مانەوە و بەردەوامی دۆگماکە بکەن. لێرەدا کێشەی خۆ بەخت کردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی دۆگماکە خۆی قووت دەکاتەوە و مرۆڤە گەڕاوەکە مەرگ لە پێشوەختدا بانگ دەکات و بە تراجیدیایەک واتای تراجیدیایەکی دیکە دەگۆڕێت و خۆی ئامادەی خواردنەوەی پیاڵەی ژەهرەکە دەکات. گەڕانەوەی هەڵگری بیروباوەڕی فەلسەفییانە بۆ نێو ئەشکەوتەکە پێویستیەکی مێژووییە، لە بەر ئەمە مەرگی هەڵگری بیروباوەڕەکە ڕووداوێکی کتووپڕ و مەرگەساتی نیە و تراجیدیایەکی چاوەڕوان کراوە. ئەگەر ئەو ئامادەی خواردنەوەی پیاڵەی ژەهرەکە نەبێت و جەنگاوەرانە بەرانبەر دۆگما و بەربەستەکانی ڕانەوەستێت، بیر و باوەڕە فەلسەفییە هەڵگیراوەکەی ڕۆڵی مێژوویی خۆی بۆ داهێنانی گۆڕانکارییەکان نابینێت.

ئەمڕۆ، دەستەڵاتی پارێزەری دۆگمای نێو ئەشکەوت ئەو دەستەڵاتەی چاوی لە ڕووناکیدا هەڵنایەت و لەناو تاریکیدا دەژی بێجگە لە

(ژەهر خواردوو کردن) بە ڕێگای دیکەش هەوڵی خەفەکردن و کوشتنی دەنگی فەیلەسوف دەدات و نایەڵێت دەنگی لە منارەی بیرکردنەوەیەوە بگاتە کەسانی نێو ئەشکەوتەکە. هەندێک جار دەستەڵاتەکە فەیلەسوف دەستەمۆ دەکات و خەسڵەتی ڕادیکالانەی لێ دادەماڵێ و بیرکردنەوەی ڕەسەنی لێ ڕووتدەکاتەوە. لەم بارووددۆخەدا گەڕانەوەی فەیلەسوف بۆ ناو ئەشکەوتەکە گرنگێتی نامێنێ و دەبێت بە بڕینی نێوەندی دوو شوێن لە یەکدی دابڕاو. بۆ ئەم فەیلەسوفە سەفەر کردنی بەرەو ڕووناکی دەرەوەی ئەشکەوتەکە، وەک سەفەر نەکردنی وایە. جیاوازییەکانی نێوان دەرەوەی ئەشکەوت و نێو ئەشکەوت نابینێ. خۆشی دەگەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە داکەوتی دەرەوەی ئەشکەوتەکە نەک هەر جیاوازی لەگەڵ داکەوتی نێو ئەشکەوتەکەدا نیە، بەڵکو لە ڕاستیشەوە دوورە و خەونێکە، کە هەرگیز لەناو جیهانی بیرکردنەوەدا بەرەو زەمین پەلکێش ناکرێت. بەم شێوەیە فەیلەسوفی دەستەمۆکراو، نەک تەنیا دەبێتەوە بە کەسێک لە"ئەوان"، بەڵکو لە "ئەوان" زیاتریش بەرگری لە دۆگماکە دەکات و بەردەوامی و مانەوەی بە پێویست دادەنێت، بۆیە خواردنەوەی پیاڵەی ژەهرەکە و مەرگی فەیلەسوف لە دایکبوونی فەلسەفەیە. بەڵام دەستەمۆ کردنی فەیلەسوف مەرگی فەلسەفە و بەنا-فەیلەسوفکردنی فەیلەسوفە. نامۆبوونە لە بیرکردنەوەی (جیدی) و فەلسەفییانە. )گەڕانەوە( لە ناو پڕۆژەی دەستەمۆ بووندا ناگرسێتەوە، چونکە ڕووداوێکی بێ دەربەست و بێ بەرنامە نیە. بێجگە لەوەی گەڕانەوە کاتی دیاریکراوی خۆی هەیە و ئەمەش فەیلەسوف بڕیاری لە سەر دەدات، پرۆژەی کۆدێتایەکی بنەڕەتییە و ڕەتکردنە. هەڵسوڕانی ئەم پرۆژەیەش پێویستی بە دەستەڵاتی داهێنان و ڕوخاندنە. لێرەوە فەیلەسوف ڕۆشنایی

دەخاتە سەر"ساختە" یەتی داکەوتی نێو ئەشکەوت و بناخەی دۆگما دامەزرێنراوەکان هەڵدەوەشێنێتەوە و دەمامەکان هەڵدەبڕێ. لە گەڕانەوەدا داکەوتی نێو ئەشکەوت تاریک دەبینرێت و وەکو ناپێویستییەک خۆی دەردەخات. گەڕانەوە خۆ ئامادەکردنە بۆ تراجیدیایەکی نوێتر و پڕ واتا پێبەخشراوتر. فەیلەسوف دەخاتە ناو جەنگی مان و نەمانەوە. مان و نەمانی دەبن بە دیاردەیەک و یەکدەگرن. نەمان، وەکو مانە و واتای وونبونێکی هەمیشەیی پێنادرێت. لە تراجیدیای مەرگی پێشوەختی فەیلەسوفدا، لەگەڵ بە بینەوەنانی پیاڵەی ژەهرەکەدا و لەو (نەبوون)ە دا، بوونی زیاتر خۆی دەسەلمێنێ و بەردەوام دەمێنێتەوە. مەرگی ڕاستەقینەی فەیلەسوف لە تراجیدیا بانگکراوەکەدا نیە، بەڵکو لە دەستەمۆکردنیدایە. ئەو کاتە فەیلەسوف دەمرێت، کە لە جێگای مێژوویی خۆیدا دەخلیسکێ و جارێکی دیکە تەسلیمی دۆگمای نێو ئەشکەوتەکە دەبێتەوە. پرۆژەی گەڕانەوەکەی دەبێت بەڕووداوێکی بێ بەرنامە و نەبینراو و هەستپێنەکراو. گەڕانەوەی و نەگەڕانەوەی لە ژێر بار و دۆخی دەستەمۆبوون و نامۆبوونییدا، وەکو یەکن. بوون و نەبوونیشی، لەم ڕووەوە یەک واتا دەبەخشن. ئەو دەبێت بە زیندوویەکی لە ئێستاوە مردوو، نەک مردوویەکی هەمیشە زیندوو. بیرکردنەوەی فەلسەفییانە، کە ناوەڕۆکەکەی تراجیدیای بوونی مرۆڤە، هۆکردی سێ پرۆسەیە: ڕزگاربوون لە نێو ئەشکەوت، گەڕانەوە بۆ ئەشکەوت و هەڵوەشاندنەوەی دۆگمای نێو ئەشکەوت. ئەم سێ پرۆسەیە، پەیوەندییەکی نەپچڕاویان لەگەڵ یەکدا هەیە و لە یەکدی دانابڕێن. هیچ کامیان بە بێ دوو پرۆسەکەی دیکە تەواو و پڕ واتا نیە. گۆڕینی واتای تراجیدیای بوونی مرۆڤ و دۆزینەوەی ڕەهەندە نەبینراوەکانی لە تەفسیرکردنی تراجیدیاکەدا نیە، لەگەڵ ڕووخاندنی ئەو بەستێنەوە

سەر هەڵدەدات، کە تراجیدیاکەی بە کاڵایەکی ڕەش لە نێو ئەشکەوتە تاریکەکەدا داپۆشیوە. دۆگما و ژیانی نێو ئەشکەوتەکە لە واتا بەدەر و بێ بەها نین. بەڵام واتاو بەهاکان ناپێویستن و مانەوەیان درێژەی پێدراوە. ناپێویستی مانەوەیان دەبێت بە ڕێگر لە ئاستی گۆڕانکارییەکاندا. ئەم ناپێویستییە پێویستی سەرهەڵدانی کۆتایی هێنانی ئەو سەردەمە و سەرەتا و دەستپێکردنی سەردەمێکی نوێ فەرز دەکات. لە نێو ناپێویستی ژیانی نێو ئەشکەوتدا فەیلەسوف یان مرۆڤی ئازادکراو لە ناپێویستی ئەو ژیانە بە ئاگایە و بەو ئاگاییەوە پرۆژەی دەرچوون لە نێو ئەشکەوتە کە هەڵدەبژێرێت. ئەمەش جەختکردنە لە سەر ناپێویستی دۆگمای ئەشکەوت و ڕۆڵی مێژوویی بیرکردنەوەی فەلسەفییانە بۆ سەرهەڵدانی ئەو سەرەتا نوێیە. ئەگەر مرۆڤی ئازاد کراو پێویستی گۆڕانی دۆگما ناپێویستەکەی لە لا پێویست نەبێت پرۆژەی دەرچوون و گەڕانەوەکەی ڕوو نادات. تێگەیشتن لە ناپێویستی دۆگماکە هاندەرە بۆ هەڵوەشاندنەوەی دۆگماکە و ڕەتکردنی سەردەمی دۆگماکە.

ئەو خاڵە گرنگەی لێرەدا دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە ئەوەیە، کە دەرچوون لە نێو ئەشکەوتە بە جێهێشتنی (شوێن) ێک لە پێناوی گەیشتن بە (شوێن) ێکی دیکە نیە. ئەم پرۆژە ئاگامەندانەیەی مرۆڤی ئازادکراو ڕەهەندێکی جێگۆڕکێی پێنەدراوە و دوورکەوتنەوە و نزیکبوونەوە لە جێگاکان نیە. ئەو پرۆژەیە هەرچەندە لە نێو شوێندا ڕوو دەدات، چونکە مرڤ بوونێکی جیهانی هەیە و ئەو بوونەی بە بێ لە نێو شوێندا نیە و نابێت، مەبەستمان ئەو دەرچوونە ڕەتکردنی (کات) ییە. ئەمەش لە ڕوانگەی هەڵبژاردنی مرۆڤە ئازادەکەوە، وەک پرۆژەیەکی ئاگامەندانە، دەرچوونێکی هەمیشەیی

یە و لە گەڕانەوەشدا هەرگیز خۆی بە سەردەمە بەجێهێڵراوەکەوە گرێ نادات. ئەشکەوت، بۆ ئێمە، شوێنێکی دیاریکراو نیە بەڵکو زادگەی ئەو دۆگما ناپێویستەیە، کە بارودۆخێکی خنکێنەری بەسەر بوونی مرۆڤ و بیرکردنەوەدا سەپاندووە و مرۆڤی ناچارکردووە. شوێنگۆڕین بە بێ ڕەتکردنی سەردەم نابێتە هۆ بۆ سەرهەڵدانی سەرەتای نوێ و کۆتایی هێنان بە دۆگماکە. ئەوەی گرنگی بە پڕۆژەی دەرچوونەکە دەدات و بەهای پێدەبەخشێت خۆ گەیاندنە بە سەردەمێکی دیکە لە داهاتوودا. مرۆڤی ئازادکراو لەم ڕەوتەییدا بەرەو داهاتوو واتا بە دەرچوونەکەی دەبەخشێت و لە مردنا نەمری دەدۆزێتەوە. بە پێچەوانەی ئەمەوە، کەسانی نێو ئەشکەوتەکە تاکو ئەو ڕۆژەی خۆیان ئازاد دەکەن و پرۆژەی دەرچوون هەڵدەبژێرن لە نێو بازنەی چەقیوی ڕابردوو و ئێستادا دەژین. بۆ ئەوان گەیشتن بە داهاتوو تێپەربوونی ساتەکانە لە ڕابردووەوە بۆ ئێستا و لە ئێستاوە بۆ داهاتوو لە نێو خولی تێپەڕبوونەکەدا دوور و جیاواز نیە و پڕۆژەیەکی نوێی لەناو خۆیدا حەشار نەداوە و نابێت بە سەرەتای سەردەمێکی نوێ. بۆ ئەوان، ئەم سێ ڕەهەندەی کات یەک ڕوخسار و ناوەڕۆکیان هەیە و خولەیەکی ماتماتیکی حەتمین، کە دەبێت ڕووبدەن. بیانەوێ و نەیانەوێ مانگەکانیساڵ و ڕۆژەکانی هەفتە دێن و دەڕۆن و هەموویان وەک یەکن، جیاوازییەکانیان تەنیا بە ڕووداوەکانی ڕابردووەوە دەبەسترێنەوە و یادیان دەکرێنەوە. ئێستاش لە نێو یادکردنەوەی یادەکانی ڕابردوودا دەبینرێت. لەبەر ئەمەشە بۆ کەسانی نێو ئەشکەوتەکە پاراستن و یادکردنەوەی یادەکان و ژیان لە نێو ڕابردوودا دەبێت بە کۆڵەکەیەکی ئەستوری دۆگماکە. بەڵام کات بۆ مرۆڤی ئازادکراو تێپەڕبوونی میکانیکی ساتەکان نیە و گەیشتنە بە داهاتوو. داهاتوویەک، کە لە ئاکامی ڕەتکردنی ئێستا و

ڕابردووەوە، وەک پرۆژەیەکی ئاگامەندانە سەریهەڵداوە.
پاش ڕوونکردنەوەی واتای میتافۆری ئەشکەوت، کە لە دایالۆگی کۆماری ئەفلاتونەوە وەرمانگرتووە، بۆ مەبەستی فەلسەفی خۆمان بەکارمانهێناوە، دێینە سەر باسکردنی ڕۆڵی بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لای نیتشە و پێگەی مێژوویی ئەم فەیلەسوفە لە بەستێنی میتافۆری ئەشکەوتەکە و مرۆڤە ئازادکراوەکەوە ڕوون دەکەینەوە. بۆ ئەم فەیلەسوفەش بیرکردنەوەی فەلسەفییانە و هەڵگری بیرکردنەوەکە لە سەردەمی خۆیاندا ناژین. فەیلەسوف مرۆڤی ئازادکراوە و خۆی لە نێو دۆگمای ئەشکەوتەکە دەرهێناوە و دژی سەردەمەکەی جەنگاوەرانە ڕاوەستاوە. فەیلەسوف منداڵی سەردەمەکەیە و لە نێو ئەشکەوتەکەدا هاتۆتە ناو جیهانەوە، بەڵام وەفا و خۆشەویستی ئەو بۆ ژیانی نێو ئەشکەوتەکە جەفا و ڕقو کینەیە[6]. ئەو دەیەوێت سەردەمەکەی بەجێبهێڵێت و لە داهاتوودا بژی. ئەمەش، بەو شێوەیەی لە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، پێویستی ڕوخاندنی دۆگما ناپێویستەکە دەیهێنێتە کایەوە. (دەرچوون) بەو شێوەیەی ئێمە باسی دەکەین لە تێگەیشتنی ئەم پێویستییە و ڕوخاندنی دۆگماکەدایە. مرۆڤی ئازادکراو ڕوخێنەری بناخەی خۆیەتی، ئەو بناخەیەی تێدا دەستەمۆ و نامۆکراوە. هێزێکی دژوەستاوە بەرانبەر ئەو دۆگمایەی دیواری ئەشکەوتەکەی بە چوادەوردا بەرزکردۆتەوە و ڕێگەی هاتنە ژوورەوەی ڕووناکی لێبڕیوە و دەست و پای لە زنجیر ناوە و فۆرمی شتە ساختەکانی بە زۆر خزانۆتە نێو دەلاقەی بیرکردنەوەیەوە. مرۆڤی ئازادکراو خاوەنی

6- Friedrich Nietzsche. *Beyond Goog and Evil*, p. 327
هەروەها بڕوانە:
Friedrich Nietzsche. *Ecce Homo*, 111 2-3.

بیرکردنەوەی خۆیەتی و لاسایی کەسێکی دیکە ناکاتەوە و پەنا بۆ ئیلهام و دەستەڵاتێکی دەرەکی، وەک سەرچاوەی بیرکردنەوە نابات. ئەو لە نێو ئەشکەوتەکە دەرچووە و لە نێو زیندانی نامۆ بوون و دەستەمۆکردن ڕزگاری بووە. خاوەنی بوونی خۆیەتی و لە بەر ڕووناکی دەرەوەی ئەشکەوتەکەدا خۆی دەبینێ و هەست بە بوونی خۆی دەکات. بۆ یەکەمجار جیاوازی نێوان تاریکی و ڕووناکی، ژیانی نێو ئەشکەوت و دەرەوەی ئەشکەوت، کۆیلایەتی و ئازادی، چەقین و ڕۆیشتن، ڕابردوو و داهاتوو، ساختە و ڕاستی بۆ دەردەکەوێت.

بەو جۆرەی واتای بیرکردنەوەی فەلسەفییانەمان ڕوونکردەوە، کە جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ دۆگمای نێو ئەشکەوتدا هەیە، بە بۆچوونی من، هەروەها لە ڕوانگەی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی نیتشەدا، پێناسەکردنی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە پێویستی بە دەرخستنی لایەن و خەسڵەتێکی گرنگتر هەیە، کە بە بێ ئەو بیروباوەڕە فەلسەفییە کە ناتەواوە. ئەم خەسڵەتە گرنگەش (داهێنان)ە. بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی دۆگمای ئەشکەوت ڕاستییەکی نوێ لە داهاتوودا دەخولقێنێ. ئەم خاڵەش لە دەرچوونی فەیلەسوف لە ئەشکەوتەکە و بڕیاردان و خواستی ڕەتکردنی سەردەمەکە، لە لایەن بیرکردنەوە فەلسەفییەکەیدا خۆی دەسەپێنێ[7]. لەگەڵ ناسینەوەی ئەم خەسڵەتە گرنگەدا دەگەینە ئەو باوەڕەی، کە بیرکردنەوەی فەلسەفییانە، تەرجومانی داکەوت نیە، بەڵکو ڕاڤە کردنێکی داهێنەرانە و ڕادیکاڵانەیە.

7- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, translated by Walter Kaufmann and R. J. Hollingdale, New York: Vintage Books, 1968. P. 327.

لەو ڕێگایەوە، خاوەنی بیروباوەڕی فەلسەفییانە، (بە دەستە داهێنەرەکانی خۆی دەگەیەنێتە داهاتوو، ڕێگاکەی ئامێرێکە بۆ گەیشتن بەو داهاتووە.)[8] کاتێک باس لە (داهاتوو) دەکرێت کێشەی نەریت و گۆڕانکارایی خۆیان دەسەپێنن. ڕەوتکردن بەرە و (داهاتوو) داوای دیاریکرنی هەڵوێستمان لە هەمبەر نەریتدا لێدەکات. ئایا فەیلەسوف یان مرۆڤی ئازادبوو لە ئەشکەوتەکە چۆن مامەڵە لەگەڵ نەریتدا دەکات ؟ ئایا دەخوازێت نەریت نە گۆڕێ و بەرێزەوە تەماشای دەکات ؟ ئایا دەرچوونی لە ئەشکەوتەکە یاخی بوونی نیە لە نەریت؟

دۆگمای نێو ئەشکەوتەکە تەنیا باوەڕێکی گیرخواردووی چەقیوی نێو (ئێستا) نیە و پەیوەندییەکی بنەڕەتیشی بە ڕابردووەوە هەیە و لە سەر بنچینەکانی ئێستا و ڕابردوودا خۆی ڕاگرتووە و ڕەگوڕیشەی لە نێو زەمینی نەریت و نەریتایەتیدا داکوتاوە. ئەو زەمینەیە بووە بە بناخەی دامەزرێنراوی دەستەڵاتی دۆگماکە و خۆی لە نێو چوارچێوەی پەیوەندییەکی زەرورییدا گرێداوە. بۆ سەقامگیرکردنی دەستەڵات دۆگماکە پەنا بۆ زەمینەی نەریت دەبات و لەوێوە ڕابردووە مردووەکان لە ئەمڕۆدا بۆ مەبەستی خۆی دەژێنێتەوە. لەم ڕووەوە و لەبەر ڕۆشنایی پەیوەندییە زەرورییەکەدا نەریت و دۆگماکە لە یەکدی جیاناکرێنەوە و دۆگماکە دەبێت بە نەریتی زاڵبووی نێو ئەشکەوتەکە. مێژوو لە ژێر کاریگەرێتی دۆگماکە و داستانە نەگۆڕەکانەوە و زیادەڕۆیش لە گێڕانەوەیاندا دەکات و دەیانکات بە ئەفسانە و چەند ڕووداوێکی ژوور مێژوو. ڕووداوەکانی ڕابردوو

8- Friedrich Nietzsche. *Beyond Goog and Evil*, p 326.

هەندەکین و سەر بەکات و شوێنی خۆیانن، بەڵام لێرەدا دەبن بە پێوەری هەمەکی و ڕاستی چەسپاو، کە تاک ناچار دەکرێت بە پیرۆز و نەگۆڕیان دابنێ و گومان لە دەوری پراکتیکیان نەکات. ئەم زیادەڕۆیی و شوێنکەوتنەی ڕابردوو هەڵوێستێکی فۆرمەلێستانە بە خۆی دەدات. لێرەدا فۆرمەلیزم ئەو واتایە دەبەخشێت، کە تاکەکان خۆیان بە شێوازی کەلتوور و بیروباوەڕێکەوە ماندوو دەکەن بە بێ ئەوەی شێوازەکە ناوەڕۆکێکی کۆک و پراکتیکی هەبێت. شێوازەکە بێ ناوەڕۆک دەمێنێتەوە و بایەخی پێدەدرێت و بە (تابو) دادەنرێت.

ڕەتدانەوەی دۆگماکە هەڵوەشاندنەوەی بناخەکانی نەریت و هەڵوێستە فۆرمەلیستەکەیە و ناکۆکیمان لەگەڵیدا دژوەستانمانە بەرانبەر نەزۆکی و بێ ناوەڕۆکی ڕابردووە ئەفساناوییەکە و گەیشتنە بە داهاتوو. بیروباوەڕی فەلسەفییانە لەم دژوەستانەدا، وەکو هەڵوێست بەرانبەر دۆگما و نەریت (کە لێرەدا هەردووکیان یەک واتایان بۆ ئێمە هەیە) دەتوانێت ببێت بە هێزی ڕوخێنەر و ڕزگارکەر و ڕادیکاڵانە (ئێستا) بەجێهێڵێت و خۆی بە داهاتوو بگەیەنێت. مەبەست لە (ڕادیکاڵانە) ئەو دژوەستانەیە، کە لە بنەڕەتەوە دۆگماکە هەڵدەوەشێنێتەوە. بە بێ بنبڕکردنی دۆگماکە لە ڕەگ و ڕیشەوە بیروباوەڕی فەلسەفی ناتوانێت ئەو سەردەمەی خۆی ڕەتبکات. ڕوخاندنی دۆگماکە لە لایەن هێزە ڕوخێنەرەکەوە دەرچوونە لە نێو ئەشکەوتەکە. گەڕانەوە بە نیازی ڕوخاندنی دۆگماکە دەبێت بە پرۆژەیەکی فەلسەفی. ئەگەر ئەو پرۆژەیە ئاگامەندانە نەخشەی بۆ دانەنرێت و بڕیاری لەسەر نەدرێت، ئەوا بیروباوەڕە فەلسەفییەکەش ناوەڕۆکی پراکتیکی خۆی دەدۆڕێنێ. گرنگ نیە هێزی ڕوخێنەر لە

هەڵوێستە ڕوخێنەرانەکەیدا بۆ ڕوخانی دۆگماکە سەرکەوتوو بێت یان نا، ئەوەی پێویستە ئەوەیە، کە ئەو بیرکردنەوە فەلسەفییە شەڕەنگێزە بە چەک و تفاقی خۆیەوە دژی دۆگماکە ڕاوەستێت و هەوڵی خولقاندنی گۆڕانکارییەکان بدات و ئاماژەی یۆتۆپیایەکمان لە داهاتوو دا بۆ بکات.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە چەند خەسڵەتێکی دۆگمای نێو ئەشکەوتەکە ڕوونبکەینەوە و باس لە چییەتیەکەی بکەین و بزانین چی بارودۆخێکی نا لەبار و ناساز بەسەر بوونی مرۆڤدا ساخدەکاتەوە و بۆچی هەڵگری بیرکردنەوەی فەلسەفییانە دەیەوێت خۆی ڕزگار بکات و لە نێو ئەشکەوتەکە دەرچێت؟ شێوەی بوون لە نێو ئەشکەوتەکەدا لە ژێر دەستەلاتی دۆگما زاڵبووەکە و تێگەیشتن لە واتای (کات)ەوە ڕوون دەکەینەوە. دۆگماکە بە تەنیا شێوازێکی بیرکردنەوەی گیرخواردوو نیە، بەڵکو نەریتێکی گیرخواردووی خۆ بەحەقزانە بە بێ ئەوەی باوەڕی بە گیرخواردوویی خۆی هەبێت. دۆگماکە، لەم ڕوانگەیەوە، وەک لەپێشتریش باسکرا، پێوەرێکی هەمەکی و نەگۆڕی زانین و ڕاستی و بەهاکانە. نەگۆڕینی دۆگماکەش جۆرێکی بیرکردنەوەیە لە (کات) و (مێژوو) ی بیرکردنەوە. بۆ دۆگمای نەگۆڕ (کات) لە داهاتوو دەپچڕێ و دەبێت بە ئێستا و ڕابردوو. هەردوو ئەم لایەنەی (کات) دەبن بە یەکەیەکی هەمیشە نەگۆڕ و ڕەها و ناوەڕۆکی دۆگماکە. ئایا لەگەڵ ئەم دوو خەسڵەتەی دۆگماکەدا چی بارودۆخێکی نالەبار بە سەر بوونی مرۆڤدا دەچەسپێت؟ لە بەر ئەوەی دۆگماکە نەگۆڕ و خۆبەحەقزانە و نەریتێکی زاڵبووە بارودۆخێکی خنکێنەرانەی لە نێو ئەشکەوتەکەدا سازاندووە و ڕاستی لە نێو کالای ناڕاستی و زیادە ڕۆییدا پێچاوەتەوە. وەکو نەریتێکی زاڵبوو، دۆگماکە لەگەڵ

خۆ چەسپانی بە سەر بووندا دەبێت بە ڕێگر لە ئاستی دامەزراندنی پرۆژەکانی بووندا و دەستەڵاتی هەڵبژاردن و بڕیاردان داگیر دەکات. لە ژێر ئەم بارودۆخە خنکێنەرانەدا دەستەڵاتی تاکەکان دەخنکێنرێت و ئازادییەکەیان لێزەوت دەکرێت و لە ئاکامدا بە نامرۆڤ دەکرێن. ئەوان دەبن بەوەی سترەکچەری دۆگما خنکێنەرەکە دایدەنێ و ناتوانن بە بێ دەرچوون لە نێو ئەشکەوتەکەدا ببن بەوەی خۆیان دەیانەوێت. بوونی نێو ئەشکەوت، بەم شێوەیە، نامۆیی و ناڕەسەنی بوونە. ئەو حاڵەتە نالەبارەیە، کە جیاوازی نێوان بوونێکی ئاگامەند و نائاگامەند، مرۆڤ و نامرۆڤ نابینێ و هاوتەرازیان دەکات. ئەمەش بە مرۆڤکردنی شتە نامرۆڤەکان نیە، بەڵکو نا مرۆڤکردنی مرۆڤە.

ناڕەسەنی بوون ئاکامی دۆڕاندنی ئازادییە و چەقینە لە نێو (ئێستا) ی ئێستادا و ژیانەوەی ڕابردووە لە نێو ئێستاکە دا. ڕابردوو، بۆ بوونێکی ناڕەسەن، لە ئێستادا دەژی و ئێستاش لە نێو ئێستای ئێستاکاندایە و داهاتوو خۆی دەرناخات. (داهاتوو) لە مێژووی بوونی ڕەسەندا سەرهەڵدەدات، کە بە ڕێگەی داهێنانی پرۆژەکانەوە ئازادانە ئەو داهاتووە دەکات بە مزڵگەی کاروانی پەرەسەندنی بوونی و لەوێوە (لەو داهاتووەوە) ئەو بوونە ڕەسەنە خۆی بە داهاتوویەکی دیکە دەگەیەنێت و (کات) بە بەردەوامی و بە بێ لێکپچڕان دەبێت بە تەوژمێکی ژوورکێشی بەرە و داهاتوو، بە بێ ئەوەی ئێستا و ڕابردووی خۆی فەرامۆش بکات و لە هەمانکاتیشدا نایانکات بە ئەفسانە و خولەیەکی چەقیو.

لە نێو ئەشکەوتەکەدا دەستەڵاتی زاڵبوی دۆگماکە لەگەڵ بە ناڕەسەنکردنی تاکەکاندا و دابڕانی ڕەوتی (کات) لە داهاتوو واتای

مێژووش دەکات بە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوو لە ئێستادا و زیادە گوتەیی لەسەر ئەو ڕوداوانە. داهاتوو دەبێت بە سەرهەڵدانی گۆڕانکارییەک، کە هەڕەشە لە مانەوەی (پیرۆزی) و(مەزن)ی دۆگماکە دەکات و بناخەی دەستەڵاتە ڕەهاکەش دەشێوێنێ. لەبەر ئەم هۆکارەشە، لە نەریتی دۆگمای ئەشکەوتەکەدا بە (حەزەر)و ترسەوە دەڕوانرێتە بیرکردنەوەی جیاواز و نوێ و بە توندوتیژی مامەڵە لەگەڵ ئەو تاکانەدا دەکرێت، کە نیازی دەرچوونیان هەیە یان لە نێو ئەشکەوتەکە دەرچوون و گەڕاونەتەوە. ئایا بیرکردنەوەی فەلسەفییانە، وەک هێزێکی ڕووخێنەر، جێگەی دۆگماکە ناگرێتەوە؟ نابێت بە دۆگمایەکی دیکە؟ بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لە بانگەشە کردنیدا بۆ ڕوخاندنی دۆگماکە هەوڵی جێگە گرتنی دۆگماکە دەدات، بەڵام نابێ ببێت بە دۆگمایەکی دیکە. نیتشە لەم مەترسیە ئاگادارمان دەکاتەوە و دەڵێت: "هیچ فەیلەسوفێک ناتوانێت بە تەواوی خۆی بە حەقزان دابنێت.[9]" مەبەستی نیتشە پاراستنی ڕێژەگەرایەتی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەیە، تاکو ئەو بیرکردنەوەیە نەبێت بە دۆگمایەکی دیکە بۆ چەوساندنەوەی کەسانی نێو ئەشکەوتەکە. هیچ فەیلەسوفێک یان هەڵگری بیروباوەڕە ڕوخێنەرەکە ناتوانێت بیروباوەڕەکەی بە ڕاستییەکی تەواو و نەگۆڕ دابنێت و دەستەڵاتێکی ڕەها بە خۆی بدات. بڕواکردن بە ڕێژەگەرایەتی بیرکردنەوە فەلسەفیەکەی ئەوە دەگەیەنێت، کە لایەنە جیاوازەکان و(جیاوازی) لە نێو بیرکردنەوە نوێکەدا لانەبراون و جێگای تایبەتی خۆیان هەیە. ئەگەر بیروباوەڕی فەلسەفییانە خۆی بە دوا بیروباوەڕ دابنێت و داهاتووەکەشی بە

9- هەمان سەرچاوەی پێشو .لاپەڕە. ١٥

دوا یۆتۆپیا ئەوا لە ئێستاوە بانگەشەی ڕووخاندنی دۆگماکە بە دۆگمایەکی دیکە دەکات یان نیتشە گوتەنی ”خۆی لە نێو درۆ و ناڕاستییدا دەگرێتەوە و دەبێتەوە بە دۆگمایەکی دیکە، کە پێویستە بڕوخێنرێت“.[10]

لەم گۆشەنیگایەوە، مێژووی بیرکردنەوە، بە تایبەتی بیرکردنەوەی فەلسەفییانە زنجیرەیەکی درێژەپێدراوی ڕەتدانەوە و ڕەتکردنە و بە دوو خەسڵەتە گرنگەکەوە (داهێنان و ڕەخنەگرتن) گرێدراوە. مانەوەی بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی دوێنێ لە ئەمڕۆدا لەوێدایە، کە ئەو بیرکردنەوەیە لە (دوێنێ) دا گیری نەخواردووە، (دوێنێ) ی ڕەتکردووە و هەوڵی گەیشتن بە داهاتووی داوە. بۆ ئەوەی بزانین ئەو بیرکردنەوەیە نەچۆتە ناو قاڵبی دۆگماوە و فۆرمەلیستانە (بەو شێوەیەی لە پێشتر پێناسەمان کرد) هەڵوێستی بەرانبەر ژیان نیە، دەبێت ناوەڕۆکەکەی بخەینە سەر زەمینێکی پراکتیکی و هەڵیسەنگێنین. پێویستە بزانین چۆن ئازادی تاکەکان مسۆگەر دەکات و بارودۆخێکی خنکێنەرانە ناهێنێتە کایەوە.

10- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 461.

# تێگەیشتنی نیتشە لە واتای تراجیدیا

بڕانەوەی بوونی مرۆڤ و تراجیدیای ئەم بوونە لەگەڵ کۆتایی هێنانیدا دێتەکایەوە. مرۆڤ بیەوێ و نەیەوێ بوونێکی تراجیدی هەیە. ئەمەش لە ناوەڕۆکی بوونیدایە و ناتوانێ بیگۆڕێت. مادامەکی ئەو هەیە دەبێ بمرێت و(کۆتایی هێنان) ی نەک تەنیا ڕوودانێکە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیشە بۆ بوونی.

من، ئەم کێشەیەم لە نووسراوەکانی پێشودا (ئۆنتۆلۆجی بنەڕەتی و بوونی مرۆڤ) و(بوون و داهێنان) زیاتر ڕوونکردۆتەوە و بە درێژی لەواتای (کات) بۆ ئەم بوونە دواوم. ئەوەی لێرەدا گرنگە، ئاماژە کردنە بۆ پەیوەندی نێوان کات بۆ ئەم بوونە لەگەڵ تراجیدیا و سەرهەڵدانی تێڕوانینێکی فەلسەفییانە و هونەریانەی ئەو(کۆتایی) هێنانە بە بوون لەلای نیتشە. توێژینەوە لە سەر(کۆتایی) حەتمی بوون ڕەشبینی و چەقینی بیرکردنەوە لە ئاستی کارەساتەکەدا نیە. ئێمە نامانەوێ بیرکردنەوە لە مردن بمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی، کە پێویست ناکات مرۆڤ خۆی بە داهاتوو بگەیەنێت و سەردەمەکەی ڕەتبکات، چونکە مردن پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجییە. مرۆڤ دەبێت لە دایک بێت یان بوونی سەرەتایەکی هەبێت، تاکو بوونی خۆی (لێرە) بسەلمێنی. سەرەتاش ڕوودانی سەرهەڵدانی ئەو بوونە لە نێو (کات) دا، وەک بوونەوەرێکی (کات)ی دیاری دەکات. ئەو ڕاستیەشمان دەخاتە بەرچاو، کە لەنێو کاتییەتی ئەم بوونەدا (سەرەتا) دەبێت بە بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی بۆ (کۆتایی). لەناو سەرەتای ئەم بوونەدا

کۆتایی دەژی و لە بوونیدا نەبوون بەرجەستە دەبێت. ئەو سەرەتا و کۆتایی و بوون و نەبوونە لەگەڵ بوونی ئەم بوونەدا پەیدا دەبێت، بنەڕەتی تراجیدیایە و لەبەر ئەوەی بوون و نەبوونی ئەم بوونەش یەکن، ئەوا بوون دەبێت بەو بنەڕەتەی تراجیدیا دەهێنێتە پێش. بە بێ بوونی ئەم بوونە تراجیدیا نیە و نابێت. ئەم بوونە لەبەر ئەوەی نەبوونە بوونێکی تراجیدییە و تراجیدیا لەگەڵ ئەودا سەرهەڵدەدات.

ئەو بوونی لە نەبوونیدایە و لەو نەبوونییەوە سەریهەڵداوە و بەرەو نەبوونی دەڕوات. بوونێکی تراجیدییە، کە لە نێو حەتمەیەتی تراجیدییەکەوە، تراجیدیانە مامەڵە لەگەڵ بووندا دەکات و بێهودە هەوڵی گۆڕانی ئەو تراجیدیایە دەدات. دەیەوێت نەبوونیەکانی خۆی لە نێو داهاتوودا پڕ بکاتەوە و بوونێکی تەواوی هەبێت. ئەو دەزانێت لە نێو دەلاقەی (کاتیەتی) بووندا، خۆگەیاندن بە تەواوکۆیی و پڕ بوون ئاکامێکی نەرێی لە دوایە و هەرگیز ناگاتە ترۆپکی ئەو قۆناغە پڕە، بەڵام ڕەشبینانە ناڕوانێتە بێهودەیی ڕەوتەکە و بەو بیرکردنەوەیەوە لە داهاتوویدا دەیەوێت (واتا) بە بێهودەییەکە و تراجیدیاکە بدات.

کاتێک نیتشە بیر لە تراجیدیا دەکاتەوە، لەم تێگەیشتنە بۆ واتای بوونی مرۆڤ دەڕوانێتە کێشەکە و دەیەوێت مامەڵەی لەگەڵدا بکات. بەڵام ئەو بوونی خۆی نەکردووە بە سەرچاوەی تێڕوانینە فەلسەفییەکە و دەگەڕێتەوە بۆ نەریتی بیرکردنەوەی ڕۆژئاوا لە سەر واتای تراجیدیا و لە یۆنانییەکانەوە دەسپێدەکات و بۆچوونەکانیان لە سەردەمدا زیندو دەکاتەوە و کاڵایەکی نوێیان بە بەردا دەکات.[11]

11 - لە دایکبوونی تراجیدیا یەکەم بەرهەمی نیتشە بوو لەساڵی ١٨٧٢ دا بڵاوکرایەوە. نیتشە بە خۆشیەوە ئەم پەرتووکەی بڵاوکردەوە، بەڵام زۆر کەم سەرنجی خوێندەوارانی ڕاکێشا. یەکێک لەو هونەرمەندانەی پێشوازی پەرتووکەکەی کرد (واگنەر)ی مۆسیقار

لای یۆنانییەکان، کە پەلیان بۆ ئەم لایەنەی شارستانیەت هاویشتوە و بیریان لە چییەتی ژیان کردۆتەوە، تراجیدیای بوون داستانی ئەو بوونە تراجیدیەیە، کە بونیادێکی کاتیی هەیە و کۆتاییەکی حەتمی لە دوایە. وەڵامدانەوەکەی سیلنۆس بۆ پرسیارەکەی میدیاس دەربڕینی تێگەیشتنی ئەو بیرکردنەوە فەلسەفییەی بوونە. بە بۆچوونی سیلنۆس، کە نوێنەرایەتی بیرکردنەوەی یۆنانی لە فۆرمی ئەفسانەدا دەکات، چییەتی بوون دەخاتەڕوو. چییەتیەک، کە بڕاوەیی و ناتەواوی لە نێو خۆیدا حەشارداوە. لەبەر ئەم هۆکارەشە یۆنانیەکان لە سەرەتای بیرکردنەوە و دامەزراندنی شارستانیەکەیانەوە بوونی مرۆڤیان بە پێچەوانەی خواکانی چیای ئۆڵەمپیاوە، بە تراجیدیا ناوزەد کردووە و نیتشە گوتەنی "ئەو بوونەیان بە ناڕەوشتانە لە قەڵەم داوە".[12]

تراجیدیا، لە بوونی خواکاندا، لە واتا بەدەرە. بە گوێرەی ئەفسانەی یۆنانی و هەموو دۆگما ئاینییەکان چییەتی بوونی (خوا/خواکان) لە چییەتی بوونە تراجیدییەکەوە جیاوازە و لە نێو دەلاقەی (کات) دا گیری نەخواردووە. چییەتیەکە، وەک چییەتی تەختە و بەرد، پڕ و نەگۆڕە. لێرەدا، جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان چییەتی خواکان و مرۆڤدا دەردەکەوێت، کە وابەستە بە بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونە

---

بوو، کە لەگەڵ نیتشەدا لەوێوە هاوڕێیەتی بۆ ماوەیەک بەست. نیتشە بیریارێکی بلیمەت بوو لە تەمەنی ٢٤ساڵیدا بە بێ ئەوەی داوای نووسینی نامیلکەی دکتۆرای لێبکرێت لە ساڵی ١٨٦٨ دا بڕوانامەی دکتۆرای پێدرا و لە سویسرا لە زانکۆی باسیل کرا بە مامۆستا.

12 - Friedrich Nietzsche. *The Birth of Tragedy,* translated by Walter Kaufmann, in *Basic Writings of Nietzsche*, New York: The Modern Library, 2000. P. 50.

تراجیدییەکەوە و ئێمەش لە ئاستی دوو جۆر بووندا ڕادەگرێت. لە لایەکەوە بوونێکی پڕ و نەگۆڕ و هەمیشەیی و لە لاکەی دیکەوە بوونێکی ناتەواو و هەناسە کورت و بڕاوەمان بۆ دیاری دەکات. تێگەیشتن لەم جیاوازییە بنەڕەتییەی نێوانیان بووە بە سەرچاوەی ناکۆکیەکان لە نێوان دوو جۆر بوون و دوو جۆر چییەتی ئەو بوونانە و بیرکردنەوە لە تراجیدیای بوون. ئەگەر چییەتی بوونە تراجیدییەکە، وەک چییەتی بوونی خواکان پڕ و نەگۆڕ بوایە و بە نەبوونەوە گرێنەدرایە، ڕەوتی بیرکردنەوەش بەرانبەر ئەو بوونە ڕێگایەکی جیاوازتری دەگرتەبەر. هەڵبەتە ئەو بوونەش ئەو کاتە واتایەکی دیکەی بە بوونی خۆی دەبەخشی. لەگەڵ چییەتیە پڕ و تەواوەکەیدا هەوڵی خۆ تەواوکردنی بە ڕێگای (داهێنان) نە ئەدا و خۆی بە شۆڕەسواری مێژوو نەدەکرد. بیرکردنەوەی فەلسەفییانە، کە لە پێشتر بە داهێنەرانەمان دانا، هۆ کردی چییەتیە ناتەواوەکە و تراجیدیای بوونە.

بوونی مرۆڤ ناتەواوە و تراجیدییە بۆیە مرۆڤ داهێنەرە و داهێنەرانە لە بووندا مامەڵە لەگەڵ تراجیدیاکەی دەکات. لەم ڕوانگەیەوە، دەبینین بنەڕەتی سەرهەڵدانی تراجیدیا بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونە گیرخواردووەکەی نێو دەلاقەی کاتە. بوونی بڕاوەی ئەو بوونە یە (وەک ئێمە)، کە ناتوانێت ساتی لە دایکبوون و مردنی بگۆڕێت. تراجیدیا لەگەڵ بوونی ئەو بوونەدا سەرهەڵدەدات، کە ناتەواوە و لە پێناوی گەیشتن بە تەواوکۆیی بێهودە وەک سیزیف هەموو ئێوارەیەک خۆی دەگەیەنێتە لوتکەی چیاکە و دەزانێت سبەینێ سەفەرێکی دیکەی لە بەردەمدایە.
ئەگەر خواکان ژیانێکی پڕ ئەشکەنجە و نەبڕاوەیان بە سیزیف دابێت،

ئەوا بوونی ئەم بوونەی، کە باسیدەکەین و بووە بە تراجیدی، وەک سیزیف دڵنیا نیە لەوەی (سبەینێ)یەکی دیکە دێت و خۆی بە لوتکەی چیایەکی بەرزتر دەگەیەنێت. تراجیدیای ئەم بوونە لە بوونی سیزیف زیاتر بێهودەییە. هەوڵدانەکانی بەرەو لوتکەی چیا بەرزەکان کورت نەفەسن و هەرگیز ناتوانێت خۆی بە دوا لوتکە بگەیەنێت. ئەو هێزە پاڵنەرەی هەنگاوەکانی دەخاتەڕێ و توانا بە بەردەوامییە کورتەکەی دەدات هێزێکی ناوەکی ژیانە، خواستی مانەوەیە، حەز و ئارەزووە، کە بە چەند کەناڵێکدا لە پێناوی مانەوەدا، وەک کەناڵەکانی حەز و وەرگرتنی چێژ سەرهەڵدەدات.

یۆنانیەکان، لەو سەرەتایەوە، ئەم کەنالآنەیان ناسیوە و بە بنەڕەتی بوونیان داناوە و لە دەربڕینێکی ئەفسانەییدا ناویانناوە کەناڵەکانی کەلتووری دایۆنێسیس Dionysis . دایۆنێسیس، یەکێکە لە خواکانی یۆنان و نوێنەری ئەو هێزە پاڵنەرەیە، کە بۆ مانەوە و بەردەوامی بوون، بووە بە سەرچاوەی حەز و ئارەزوو. هێزێکی لە لۆجیک بەدەرە دژی بیرکردنەوەی هۆشەکی و سنوربەستن ڕادەوەستێت و بێ وچان و ئۆقرە گرتن هەوڵی تێرکردنی خۆی دەدات. بە گوێرەی نەریتی یۆنانیەکان، بۆ ڕێزلێنان لە دایۆنێسیس، حەز و ئارەزووە کانیان بە ئاشکرا لە ئاهەنگی مۆسیقا و سەما و خواردنەوە دا بەرجەستە کردووە. ئەم بەرجەستە بوونە هەڵقوڵانێکی ئاسایی و سروشتی بوونە تراجیدییەکە و دەربڕینی ڕاستەقینەی ئەو بوونەیە. ڕاوەستانێکە لە سەر زەمینێکی نەکێڵراو بە گاسنی ژەهراوی بیرکردنەوەی هۆشەکی. سنووردانان و بەستنەوەی ڕووداوەکانە بە تەفسیرێکی زانستانەی بیرتەسکانە و دۆگماوە. لەم بەرجەستەکردنەدا واتای بوون بە ویستی ژیان پێناسە کراوە. ویستێک، کە هیچ هۆیەکی

هۆشەکی لە پێشتر، بۆ خۆی دانامەزرێنێت و خۆی بە مەبەستە دوورەکانەوە نابەستێتەوە. لەبەر ئەمە، نیتشە ئەم بۆچوونە لە ئەفسانەی یۆنانییەوە بە فەلسەفەی شۆپنهاوەرەوە گرێدەدات و لێکچونیان ئاماژە دەکات[13].

شۆپنهاوەر ڕاستەقینەی بوون بۆ (ویست) دەگەڕێنێتەوە. ئەم ویستەش بە هێز و وزەیەکی ناوەکی کوێر و لە هۆشبەدەر دادەنێت و بۆچوونەکانیشی بۆ هونەر لە سەر ئەم زەمینە ئۆنتۆلۆجییە ڕاگرتوە و لەو باوەڕەدایە دوو جۆر هونەر هەیە. جۆری یەکەمیان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە ڕاستەقینەی بوونەوە (ویست)ەوە هەیە و لەوێوە بە بێ تێکەڵبوون لەگەڵ هۆش و بیرکردنەوەی هۆشەکیدا هەڵدەقوڵێت. باشترین نموونەی ئەم جۆرە هونەرە مۆسیقایە. جۆرەکانی دیکەی هونەر، وەک، شێوەکاری و هۆنراوە خۆیان لەگەڵ بیرکردنەوەی هۆشەکیدا تێکەڵ کردووە و بەڕەوانی نەماونەتەوە.

بیروباوەڕی شۆپنهاوەر، کە لێرەدا بووە بە بناخەی بۆچوونەکەی نیتشە لەسەر تراجیدیا، ڕەتدانەوەی مێتافیزیکە دووالیستەکەی (کانت) و سەر بە بزاڤی فەلسەفی پاش (کانت) ە. شۆپنهاوەر ڕاستەقینەی بوون بە (ویست) دادەنێ و (بیر)یش دەکات بە دیاردە و ڕواڵەتی دەرەکی ویست. لایەنەکانی ناوەوە و دەرەوەی بوون بەم شێوەیە سەر بە دوو ڕاستەقینەی جیاواز و دوور نین،

---

13- نیتشە لە پەرتووکەکەیدا «لە دایکبوونی تراجیدیا» لە چوار شوێندا ئاماژەی بۆ بۆچوونە فەلسەفییەکەی شۆپنهاوەر کردووە.

بەڵکو ویست و ڕواڵەتی ویستن[14]. ویست، کە ڕاستەقینەی بوونە، هێزێکی بەرەڵا و بێ سنوورە و بیرکردنەوە هەوڵی لغاوکردن و بەستنەوەی دەدات. بیرکردنەوەش بێهودە بە شوێن هۆکاندا وێڵە و بە هۆکردەکانەوە دەیانبەستێتەوە و دەیەوێت پێشبینی سیستەم و ڕژێمێکی ئۆنتۆلۆجی ئاگامەندانە بۆ بوون بکات. ئەگینا بوون لە بنەڕەتدا لە بەر ئەوەی ویستێکی بەرەڵا و بێ سنوورە خاوەنی سیستەمێکی ئاگامەندانە و غایەدەر نیە و لە گەشەکردن و جوڵانێکی کوێرانەدایە. ڕاستەقینەی بوون هێزی ناوەکی حەز و ئارەزووی دایۆنیسیسییە. یۆنانییەکان و شۆپنهاوەر، لەم خاڵەدا یەکدەگرنەوە و بە دوو شێوازی جیاواز، یەکەمیان (ئەفسانەیی) و دووەمیان (فەلسەفییانە) لە یەک ڕاستەقینە دەدوێن. بەڵام تێگەیشتنی بوون لەسەر بناخەی ئەم ئەفسانە و کەلتوورە دایۆنیسیسە و بۆ چوونە فەلسەفییەی شۆپنهاوەر لە ئاستی تراجیدیایەکی لە چارەبەدەر و خەم و ژانێکی نەبڕاوەدا ڕامان دەگرێت. تاکەکان ناتوانن دەستەڵاتی بە سەردا بگرن یان ڕێگە چارەیەک بۆ ڕەتکردنی بدۆزنەوە. ئایا نیتشە توانیویەتی ڕێگە چارەیەک پەیدابکات؟ هەوڵیداوە لە تەفسیرکردنی تراجیدیادا لەو بێهودەییە ڕزگارمان بکات و ڕۆشناییەک لە کۆتایی تونێلەکەوە بە ئێمە نیشان بدات؟ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا لەو قۆناغەی بیرکردنەوەی نیتشەدا تاکە ڕێگە چارەیەک بۆ کێشەی تراجیدیای بوون گەڕانەوەیە بۆ کەلتووری یۆنانی. بەڵام لە قۆناغەکانی دواییدا و لەگەڵ پێشەوە چوونی بیرکردنەوە فەلسەفییەکەیدا ڕێگە چارەی دیکەی بە سەرهەڵدانی مرۆڤی بەرز(سوپەرمان) و بیرۆکەی گەڕانەوەی هەمیشەییدا بۆ ئاماژە کردووین. لەم بەشەی

14 - Arthur, Schopenhaur. *The World as Will and ldea*, translated by E.F.J. Payne, vol.1, New York: Dover Publications, 1969. Pp.103-109.

لێکۆلینەوەکەمدا مامەڵە لەگەڵ ڕێگە چارەی قۆناغی سەرەتایی نیتشە دەکەم و لە ڕوانگەی بۆچوونەکانیەوە لە پەرتووکی (لە دایکبوونی تراجیدیا) دا کێشەکە شیدەکەمەوە. تاکو ئێرە، لەم شیکردنەوەیە و لە ڕوونکردنەوەی واتای تراجیدیادا لە دوو خاڵی گرنگ دواوین:

یەکەم کاتیەتی بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوون. دووەم کەلتووری دایۆنێسیس، کە سەرچاوەیەکی نا-ئاگامەندانە و لەغایەبەدەر بۆ بوون دیاری دەکات.

لەگەڵ کەلتووری دایۆنێسیسدا کەلتورێکی دیکە بە ناوی یەکێک لە خواکانی دیکەی یۆنانەوە (ئەپۆلۆ) سەریهەڵداوە. ئەم کەلتوورە بە پێچەوانەی کەلتووری پێشوترەوە نوێنەری هۆش و پەیکەرسازییە لە هونەردا. کەلتوورێکە بانگەشەی دامەزراندنی سیستەمێکی پڕ واتا و غایەدار و هۆشەکی لە بووندا دەکات و بەرانبەر هەڵچونی ویست و حەز و ئارەزووە سنووربەدەرەکان ڕادەوەستێت و دەستەڵاتی خۆی بە سەریاندا دەسەپێنێت. سەرهەڵدانی کەلتووری ئەپۆلۆ بۆ دژایەتی کردن و ناکۆک وەستانە لەگەڵ کەلتووری دایۆنێسیسدا. زۆرانبازی نێوان هۆش و ویستە لە فەلسەفەدا و پەیکەرسازی و مۆسیقایە لە هونەردا. ئەم دژوەستانە (پێویستی)یەکی مێژووییە لە گەشەکردنی تراجیدیادا و دەبێت هەردوو کەلتوورە ناکۆکەکان لە زۆرانبازییەکەیاندا بگەنە پلەی هاوتەرازبوون لەگەڵ یەکدا و لایەنێکیان بە قوربانی لایەنەکەی دیکە نەکرێت. ئەم دوو کەلتوورە بەرهەمی دوو جۆر وزە و هێزن؛ یەکەمیان وزەی ویستە و دووەمیان وزەی هۆش. پەیوەندی نێوانیان، بەو جۆرەی نیتشە بۆی چووە، لە سێ قۆناغدا دەبینرێت و دەگۆڕێت. لە قۆناخی یەکەمدا وزەی ویست خاوەنی دەستەڵاتی

باڵایە و وزەی هۆشی خەفەکردووە و خۆی بۆ تێرکردنی حەزەکانی بەرەڵا کردووە . لێرەدایە، کە کەلتووری دایۆنێسیس گشت لایەنەکانی ژیانی یۆنان داگیر دەکات و خەڵکی بە بێ بەرنامە و بێ پەیڕەوی کردنی یاساکانی هۆش و بیرکردنەوە شوێن حەز و ئارەزووەکانی خۆیان دەکەون و وەکو ئاژەڵ دەژین[15] .

لە قۆناغی دووەمدا بە هاوتەرازکردنی وزەی ویست و هۆش لە مێژووی شارستانیەتی یۆناندا، بە تایبەتی لە گەشەکردنی هونەر و ئەدەبی ئەو وڵاتەدا، سەردەمێکی نوێ هاتەکایەوە، کە بە سەردەمی کلاسیک ناودەبرێت. ئەدەب و هونەری یۆنانی گەیاندە ترۆپکی جوانی. وزەی ویست داهێنەرانە بە هاوکاری وزەی هۆش بەکارهێنرا. هەوڵدرا واتای تراجیدیا ڕوون بکرێتەوە و مەبەستێکی هۆشەکیشی بە گوێرەی بۆچوونی ئەو سەردەمە بۆ دابنرێت. ئەم هەوڵدانە لە ئەدەبی (سۆفۆکلیس) دا گەیشتە ئەو پلەیەی کاریگەرێتی خۆی بە سەر بیرکردنەوەی هونەری و ئەدەبی دوای خۆشی تۆمار بکات. لەگەڵ تێکچوونی هاوتەرازبوونەکەدا و لادان بەرەو لای وزەی هۆشدا سەردەمی کلاسیک کۆتایی پێهات و هۆش دەستەڵاتی خۆی بە سەر وزەی ویست دا سەپاند و کەلتووری دایۆنیسیسی-ئەپۆلۆ بوو بە کەلتوورێکی ئەپۆلۆیی ڕووت. نوێنەرانی ئەم کەلتوورە ئەپۆلۆییە ئەو بیریارانە بوون (وەک، سوکرات و ئەفلاتون) بانگەشەی هۆشگەرایەتییان دەکرد و بوونیان لەسەر سیستەمێکی هۆشەکی و غایەدار دامەزراند و لەو دیو کاتیەتی ئەو بوونەشەوە ئاماژەیان بۆ بوونێکی پڕ و تەواوکۆ و سەرمەد کرد[16] .

---

15- Friedrich Nietzsche. Op. cit., p.48.

16- Ibid, p 73.

سۆفۆکلیس لە شانۆگەری (ئۆدیبی پاشا) دا ئەو خاڵە ڕوون دەکاتەوە، کە مرۆڤ ناتوانێت ڕوودانی تراجیدیا بگۆڕێت. تراجیدیا بووە بە (قەدەری) ئەو بوونە. مرۆڤ لە ئاستی گۆڕینی ئەو قەدەرەدا زەبوونە. بەڵام دەتوانێت لەواتای تراجیدیاکە تێبگات و هەڵوێستی بەرانبەر هەبێت. ئۆدیب لە بەردەم قەدەرەکەیدا زەبوون و بێ دەستەلات بوو، هاوکات ڕووبەڕووی قەدەرەکەی بووەوە و دەیویست لەو نهێنیە تێبگات و هەڵوێستی خۆی لە ئاستیدا دیاری بکات. دیاریکردنی هەڵوێست و تێگەیشتن لەو واتایە لەگەڵ سەرهەڵدانی وزەی هۆشدا پەیدا دەبێت و هۆکردی هاوتەراز بوونی ویست و هۆشە و وەستانێکی ئاگامەندانەیە لە ئاستی تراجیدیاکەدا.

جۆکاستا: لە پێناوی خوادا بوەستە،
ئەگەر ژیانت دەوێ واز لەم لێکۆڵینەوەیە بهێنە!
خەم و ژانی من بەسە.
ئۆدیب: ئازایەتی !
ئەگەر من و دایکم و سێ پشتم کۆیلە بن،
هێشتا تۆ کۆیلە دەرناچیت.
جۆکاستا: گوێ بگرە. لێت دەپاڕێمەوە، وازبهێنە.
ئۆدیب: گوێ لە تۆ بگرم ؟ نا
دەبێ هەموو شتێک بزانم . دەبێ ڕاستی بدۆزمەوە[17].

ئۆدیب بێهودە هەوڵ دەدات خۆی لەو قەدەرە دەرباز بکات. بەڵام

---

17- Sophocles, “King Oedipus”, in *The Three Theban plays,* translated by Robert Fagles , New York: Penguin Books, 1984. P. 222.

بێئاگایە لەوەی دوورکەوتنەوە و ڕاکردن لەو قەدەرە خۆ فڕێدانە نێو قەدەرەکەیە و هەرگیز ناتوانێت بیگۆڕێت. بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە و سۆفۆکلیس ئاماژەی بۆ دەکات گۆڕانی تراجیدیاکە نیە، بەڵکو تێگەیشتنە لە ناوەڕۆکی تراجیدیاکە و هەڵوێست وەرگرتنێکی ئاگامەندانەیە بەرانبەری. گرنگ نیە تێگەیشتنەکە (لە ناوەڕۆکی تراجیدیاکە) چ ئاکامێکی تاڵ و نالەباری لە دوا بێت.

کەلتووری دایۆنێسیس داوای لێکۆڵینەوەی هۆشەکیانەی ڕووداوەکانمان لێ ناکات. کوێرانە وەدووی تێرکردنی حەز و ئارەزووە هەڵقولاوەکانی ناخی بوون دەکەوێت. بەڵام کەلتووری ئەپۆلۆ دەستەڵات بە سەر حەز و ئارەزووەکان و شێوازی تێربوونەکەیاندا دەگرێت و خەفەیان دەکات و داوای تێگەیشتن دەکات.

پاش هاوتەرازکردنی وزە جیاوازەکانی (ویست) و (هۆش) و ڕێکەوتن لە نێوان کەلتووری دایۆنێسیس و ئەپۆلۆدا، کە بووە هۆی سەرهەڵدانی ئەدەب و هونەری کلاسیکی یۆنان قۆناغی سێیەم بە تێکچوونی ئەم ڕێکەوتنە دێتەکایەوە و نیتشە بە قۆناخی (ڕووخان) ناوزەدی دەکات.

لەم قۆناغەدا (هۆش) دەستەڵاتێکی باڵاتری هەیە و کەلتووری ئەپۆلۆ بە سەر کەلتووری دایۆنێسیس دا سەردەکەوێت و دەبێت بە نەریتێکی زاڵبوو. ویستیش دەخرێتە پەراوێزەوە و بە سەرچاوەی ئاژاوە و بەرەڵایی و خراپە لە قەڵەم دەدرێت. تێکچوونی ڕێکەوتنەکە و پێکەوە ژیانەکە لەگەڵ دەستەڵات باڵایی کەلتووری ئەپۆڵۆ لەگەڵ سەرهەڵدانی فەلسەفەی هۆشەکایەتی سوکرات و ئەفلاتوندا

سەقامگیربوو. فەلسەفەی هۆشەکایەتی بنەڕەتی بوون بۆ سەدەمێکی هۆشەکی و ئاگامەند دەگێڕێتەوە. ئاماژەی جیهانێکی نەبڕاوە و پڕ ئاسودە و تەواوکۆ لە ژوور ئەم جیهانە بڕاوە پڕ ئاشوب و ناتەواوە دەکات. بۆ چارەسەر کردنی کێشەی تراجیدیای بوون، وەکو بۆچوونەکانی نێو ئایینەکان، پەنا دەباتە بەر(هیوا)یەکی بێبناخە و ڕووناکبینینێکی بێ بەڵگە. باشترین نموونە بۆ تێگەیشتن لەم چارەسەر کردنە هەڵوێستی سوکراتە لە ئاست مردنەکەیدا. سوکرات ڕوودانی تراجیدیای بوونی بە گۆڕانکارییەک یان گواستنەوەی گیانی لەم جیهانەوە بۆ جیهانێکی بەرز و چاکتر و نەبڕاوە تەفسیر دەکات. ئەو مردن بە تراجیدیا دانانێت، بەڵکو ژیان لە ناو ئەم جیهانەدا تراجیدیایە و مرۆڤ بە مردن (گیان گواستنەوە) لەو تراجیدیایە ڕزگاری دەبێت و دەگاتە ئەو پلەی بوونە، کە کەموکورتی و ئازار و بڕانەوەی تێدا ڕوونادەن. ئەو پرسیارەی پێویستە بکرێت ئەوە یە بۆچی نیتشە ئەم قۆناغە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی یۆناندا بە ڕووخان دادەنێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێت پەیوەندی نێوان فەلسەفەی هۆشەکایەتی و ڕووخان ڕوون بکەینەوە و لە ناوەڕۆک و واتای ڕووخان بدوێین و ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەین، کە چۆن فەلسەفەی هۆشەکایەتی دەبێتە هۆ بۆ سەرهەڵدانی ڕووخان.

لە پێشتر باسم کرد، کە ڕاستی بوون بۆ نیتشە (ویست)ە و (هۆش) یش، کە سەرچاوەی بیرەکانە ڕواڵەت و دیاردەی ئەو ڕاستییەی بوونە. ئەمەش بۆچوونێکی مێتافیزیکییە لە نێوان بوون و دیاردەی بووندا و لە شۆپنهاوەرەوە وەرگیراوە. لەم بۆچوونەوە

فەلسەفەی هۆشەکایەتی بە ڕابەری سوکرات و ئەفلاتون ناوەڕۆکی بوونی بە کاڵای دیاردە دەرەکی و ڕواڵەتەکانەوە پێچاوەتەوە. لەگەڵ شاردنەوەی ڕاستیدا ئەوەی بە ڕاستی دانراوە و جێگەی ڕاستی گرتۆتەوە لە بنەڕەتدا ڕاستی نیە و کراوە بە ڕاستی و بایەخی پێدراوە. شاردنەوە و داپۆشینی ڕاستی بوون لە هەرچ قۆناغێکی گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەدا ڕوویدات، دەبێتە زاگەی قۆناغێک، کە ڕاستی تێدا نا ناسرێت و ساختە و ناڕەسەنیەت جێگەی ڕاستی داگیر دەکات. لە فەلسەفەی هۆشەکایەتیدا بە دیدی نیتشە ئەوەی بە ڕاستی دادەنرێت ساختەیە و ڕاستی بە نامۆیی و شاراوەیی دەمێنێتەوە. بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لە بارودۆخی شاردنەوەی ڕاستیدا مامەڵە لەگەڵ ڕوخساری دەرەکی ڕاستی دەکات و دەم و چاوەکانی ژێر دەمامەکان نابینێت. لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕوونکردنەوەیەدا دەتوانین بڵێین، کە ناوەڕۆکی ڕووخان شاردنەوەی ڕاستی بوونە و بێئاگایی و نەناسینی ئەو ڕاستییەیە. پەیوەندی فەلسەفەی هۆشەکایەتیش، کە سەر بە کەلتووری ئەپۆلۆیە، مامەڵە لەگەڵ ئەو شاردنەوەیەدا دەکات و پەیوەندییەکی هۆیەکی بە ڕووخانەوە هەیە.

لەگەڵ پێناسەکردنی ناوەڕۆکی ڕووخان و شاردنەوەی ڕاستی بوون و مامەڵە کردنی بیرکردنەوەی فەلسەفییانە لەگەڵ ئەو دیاردە و داکەوتانەدا، کە لەو ڕاستییەوە دوورن دەگەینە ئەو باوەڕەی هایدیگەر گوتەنی (فەلسەفەی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەفلاتوندا گیرۆدەی نامۆیی بووە.) یان نیتشە دەڵێت: (توشی ڕووخان هاتووە[18].)

18- Martin Heidegger. *Being and Time*, translated by John Macquarrie and Edward Robinson, London: Blackwell, 1997. P. 2.

لەو کاتەوە، لە سەردەمی ئەفلاتونەوە، لەگەڵ زاڵبوونی نەریتی ئەپۆلۆ بەسەر نەریتی دایۆنێسیسدا بیرکردنەوەی فەلسەفییانە مامەڵە لەگەڵ ڕاستی بووندا ناکات و خۆی بە داکەوتێکەوە ماندوو کردووە، کە دیاردەی ڕاستییەکەیە نەک ڕاستییەکە خۆی. دیاردەیەک، کە ناتوانێت تەنیا و سەربەخۆ بە بێ پشت بەستن بە ڕاستییەکەوە بوونی خۆی بسەلمێنێت. بۆ نموونە، بەرز بوونەوەی پلەی گەرما لە لەشی نەخۆشێکدا دیاردەیەکە بۆ نەخۆشییەکە، بەڵام خۆی لە خۆیدا نەخۆشییەکە نیە. هەروەها بەرز بوونەوەی پلەی گەرماش بە بێ نەخۆشی (وەکو گرانەتا) ڕوو نادات. ئێمە ئەگەر بیر لە بەرز بوونەوەی پلەی گەرما بکەینەوە و بە ڕاستی دابنێین و نەخۆشییەکە (گرانەتاکە) لە بیر بکەین و نەیدۆزینەوە ئەوا ڕاستی نەخۆشییەکەمان نەناسیوە. ئەم نموونەیە بە ئاشکرا بۆچوون و لێکدانەوەی نیتشە لە سەر فەلسەفەی هۆشەکایەتی و پەیوەندی ئەم فەلسەفەیە بە (ڕووخان) ـەوە ڕوون دەکاتەوە. لە هەموو سەردەمێکی مێژووی بیرکردنەوەدا، ئەگەر ئاگامەندی ڕاستی ناس نەبێت و خۆی بە داکەوتی ساختە و ڕواڵەتەوە خەریک بکات تووشی ڕووخان دەبێت .

دەربڕینی تراجیدیا لە شێوازەکانی هونەر و ئەدەبدا وێنەیەکی ڕاستەقینەی ژیانی بوونە کاتییەکەیە. فەلسەفەی هۆشەکایەتی و کەلتووری ئەپۆلۆی ڕووت شاردنەوەی ئەو ڕاستەقینەیە یە. ئەگەر کەلتووری ئەپۆلۆ لەگەڵ کەلتووری دایۆنێسیسدا هاوتەراز وزەکانی نەخاتە گەڕ، (ویست) و (بیرەکان) پێکەوە لە سەر بەستێنێک ڕانەگرێت دیاردە ساختەکان خۆیان بە سەر ڕاستی و ناوەڕۆکی ڕاستییەکەدا دەسەپێنن. ئەدەبی تراجیدی یۆنان لە قۆناغی کلاسیکدا هەوڵی لە

ناوبردنی ئەم دیاردە (نەرێ)یەی دا، لە بەستێنە فەلسەفییەکەیەوە ویست و هۆشی بە هاودەستەڵات دانا. ئەم کارەش هەوڵدانە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی تراجیدیای بوون و جڵەو گرتنی وزەکانی ویست و بەکارهێنانیان لە ژێر چاودێری هۆشدا. لەم ڕووەوە، ئەدەب و هونەری تراجیدی ئاگاییە لە ڕاستی بوون و دڵدانەوە و ئارام بەخشە[19].
بە پێچەوانەشەوە، کەلتووری ئەپۆلۆ و فەلسەفەی هۆشەکایەتی بۆ چارەسەرکردنی تراجیدیا ئاوەڕ لە تراجیدیا ناداتەوە و باوەڕ بە بوونی ناهێنێت. حاشا لە ڕاستی و ڕاستەقینەی کاتیەتی بوون دەکات و ژیان بە نەبڕاوە و هەمیشەیی دەبینێت. بە بیروڕای من هێشتا کێشەی چارەسەرکردنی تراجیدیا لە ئەدەب و هونەری کلاسیکدا ڕوون نیە. ئێمە نازانین چۆن ئەو شێوە ئەدەب و هونەرە چارەسەری تراجیدیا دەکات و لەو نائومێدی و بێهودەییەی ژیان ڕزگارمان دەکات؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بۆ سەرزەمینەی مێتافیزیکی نیتشە دەگەڕێینەوە و سود لە بۆچوونە فەلسەفییەکەی وەردەگرین. لە بەر ڕۆشنایی جیاوازییە مێتافیزیکییەکانی نێوان (تاک) و (کۆمەڵ) یان (هەندەکی و هەمەکی) دا مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا دەکەین. نیتشەش لە چارەسەرکردنی کێشەکەدا بۆ بۆچوونە مێتافیزیکییەکانی شۆپنهاوەر چووە و لە ڕوانگەی جیاوازییەکانی نێوان ویستی تاکە کەس و ویستی هەمەکییە وە تەماشای کێشەکەی کردووە. بێهودەیی بوون و کاتیەتی ئەو بوونە، کە ناوەڕۆکی تراجیدیا ڕەنگڕێژ دەکەن، لە نهۆمی ئاگایی تاکە کەسیدا بە زەقی خۆی دەردەخات. تاکە کەسەکان بوونێکی بڕاوەیان هەیە و خاوەنی سەرەتا و کۆتایین.

19 - ئەریستۆ لە پێش نیتشەدا لەپەرتووکەکەی Poetics ئاماژەی بۆ ئەم خە سڵەتەی ئەدەب و هونەری تراجیدی کردووە و تراجیدیا بە خەم ڕەوێن Catharsis دادەنێت.

کۆتایی ڕوودانێکی حەتمی و نەگۆڕی تاکە کەسەکانە. تێگەیشتن لە واتای بوون بەم جۆرە تراجیدیانەیە. ئەدەب و هونەری کلاسیکی یۆنان، لە لایەکەوە ئەم ڕاستیەمان بۆ دەخەنە ڕوو. لە لایەکی دیکەوە، لەگەڵ دەربڕینی ئەم ڕاستیەدا ئاماژەی نەبڕانەوە و مانەوەی (هەموو) دەکەن و لایەنێکی ڕووناکتری بوون دەردەخەن. بوونی هەندەکی و تاک بڕاوە و کورت نەفەسە و بوونێکە بە نەبوونییەوە بەرەو نەبوون دەڕوات. بوونی هەمەکی و هەموویی نەبڕاوە و لە کۆتایی بەدەرە و ڕوو لە نەبوون ناکات. تاک یەکەیەکی سەربەخۆ و بڕاوەیە و بوونێکی تراجیدی هەیە، بەڵام، وەکو ئەندامێک یان بەشێکی (هەموو)ەکە، بڕانەوەی نیە و نامرێت[20].

ڕەتکردنی زەمینەیەکی هەندەکی و خۆ گەیاندن بە ڕەهەندەکانی ژور ساتەکان چارەسەر کردنێکی میتافیزیکیانەیە و لەم ڕێگەیەوە تاک و هەموو تێکەڵ بە یەکدی دەبن. ئەم کێشەیەش تەنیا لە نێو ئەدەب و هونەری کلاسیکی یۆناندا باس نەکراوە. ئەگەر ئاوڕێک لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بدەینەوە، بیریارانی، وەک (برۆنۆ. سپینۆزا، دێکارت و هیگڵ) و لە ڕۆژهەڵاتدا (سوهرەوەردی و ئیبن عەرەبی و زۆر لە سۆفیەکانیش وەک ئەبو بەکر شبلی، جونەید میسری، بیستامی و حەلاج) ئاماژەیان بۆ کردووە و بە دوا وێستگەی گەشتە ڕۆحانیەکەیان داناوە، کە بوونی تاک تیایدا لە نێو بوونی هەمەکی خوادا دەتوێتەوە و ژیانێکی هەمیشەیی پێدەبەخشرێت. لای نیتشە، لە سەردەمی سوکراتەوە تاکو ئەو قۆناغەی نیتشە تێیدا ژیاوە فەلسەفەی هۆشەکایەتی و کەلتووری ئەپۆلۆ بوون بە نەریتی

20- Friedrich Nietzsche. ”The Birth of Tragedy", in *Basic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, p. 74.

زاڵبووی بیرکردنەوەی فەلسەفییانە. ناوەڕۆکی بوون و ڕاستی ئەو ناوەڕۆکە لە ژێر دەستەڵاتی ئەم نەریتەدا شاراوەتەوە.

بۆ پەلکێش کردنی ڕاستی بوون بەرە و ڕۆشنایی و هەڵوەشانەوەی نەریتی زاڵبوو پێویستیمان بە شێوازێکی جیاوازی بیرکردنەوەی فەلسەفییانە و هونەرانەی نایار و دژوەستاو هەیە. ئەو بیرکردنەوە نایار و چاوەڕوانکراوە لە زەمینەی فەلسەفی شۆپنهاوەر و هونەری مۆسیقای ڕیچارد واگنەرەوە دەکەوێتە گەڕ و دەبێت بە جێگری کەلتوورە زاڵبووەکە. ئاماژەکردن بۆ شۆپنهاوەر و واگنەر لە هۆ بەدەر نیە و نیتشە بۆچوون و لێکدانەوەی خۆی لەسەر ئەم دوو بیریارە هەیە. بەڵام لە دواییدا هەڵوێستی نیتشە لە ئاستی واگنەردا گۆڕا و ئومێدی بە هونەرەکەی نەما. بۆ نموونە، لە پەرتووکەکەیدا لەسەر واگنەر دەڵێت: "ئایا واگنەر نەخۆش نیە؟ ئەو هەموو شتێک توشی نەخۆشی دەکات، تەنانەت مۆسیقاشی نەخۆش کردووە."[21]

21- Friedrich Nietzsche. “The Case of Wagner”, in *Basic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, p. 602.

هەروەها هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە١٠٠. ئەمە بۆچوونی نیتشەیە لە سەر ڕیچارد واگنەر (١٨١٣- ١٨٨٣) ، کە زۆر هاوڕێ بوون. پاش ئەوەی واگنەر ئۆپێرای (پارسیڤاڵ)ی پێشکەش کرد، نیتشە کۆتایی بە هاوڕێیە تیەکەی لەگەڵ ئەودا هێنا و واگنەری بە منداڵی سەردەمەکە و هونەرەکەشی بە بازاڕیی و سەر بە کەلتووری نزم و ڕوخاو ناوزەد کرد. لەو باوەڕەدا بوو، کە واگنەر لە ئایین نزیکبۆتەوە و سازش بۆ مەسیحایەتی دەکات. هەروەها، وا باس دەکرێت، نیتشە بە شاراوەیی (کۆسیما) ی هاوسەری واگنەری خۆشویستوە و خۆشەویستیەکەی لە کاتی نەخۆشی و تێکچوونی باری مێشکیدا دەربڕیوە. واڵتەر کۆفمان دەڵێت،“ لەبەر ئەوەی واگنەر بە تەمەن لە نیتشە گەورەتر بووە، نیتشە، واگنەری، وەکو باوکی خۆی بینیوە. خۆشەویستییەکەشی بۆ (کۆسیما) بە نهێنی و شاراوەیی، پەیوەندی بە گرێی ئۆدیبەوە لای نیتشە هەیە. بۆ ئەم کێشەیەش بڕوانە:

بەڵام نیتشە هەمیشە شۆپنهاوەری بە مامۆستا و فەیلەسوفێکی ڕەسەن و پێشەوای کاروانی بیرکردنەوە نایار و دژوەستاوەکە داناوە. پاش شۆپنهاوەریش نیتشە خۆی بەو بیریارە ناوزەد دەکات، کە بە بێ ترس و بوێرانە جەنگی دژی کەلتووری زاڵبوو بەرپا کردووە و دەیەوێت گۆڕانکارییەکان لە سەردەمەکەیدا سەقامگیر بکات.

---

Walter Kaufman. Nietzsche, New Jersy: Princeton University Press, 1974. PP. 32 – 35.

# بەشی سێیەم
# لە تراجیدیاوە بۆ مێتافیزیکی هیچگەرایەتی

هەرچەندە مێتافیزیک بناخەی هەموو بیردۆزێکی هونەری و ئەدەبییە، پێویستە لە پێشتر دابنرێ و باس بکرێت ئێمە کێشەی ناوەڕۆکی تراجیدیامان لە پێش ئەم بەشەدا داناوە. مەبەست لە پێش خستنی کێشەی تراجیدیا لە دوو خاڵدا کۆ دەبێتە وە؛ یەکەم، وابەستە بە گەشە کردنی بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشەوە و دووەم، تراجیدیا ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکی بوونی مرۆڤە و پەیوەندی ڕاستەوخۆ و کاریگەرانەی بە سەر ئەو بوونەوە هەیە.

لە سەرەتادا نیتشە، وەک زماننناس و ئەدەب دۆستێک پەلاماری کێشەی تراجیدیای داوە. پاش ئەو قۆناغە سەرەتاییە بۆچوونە فەلسەفییەکەی گەشەی کردووە. هاوکات ناگونجێت بڵێین مامەڵە کردنی ئەم فەیلەسوفە لەگەڵ تراجیدیادا لە مێتافیزیک ڕووت کراوەتەوە و پەیوەندی لەگەڵدا نیە. بێگومان لە کاتی نووسینی پەڕتووکەکەی لە سەر تراجیدیا، نیتشە، وەک فەیلەسوف نەدەناسرا. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە شێوەی بۆچوون و ڕاڤەکردنی بۆ تراجیدیا لە بەستێنی مێتافیزیکییەوە دوورە. لێرەدا جەخت لە سەر ئەو خاڵە دەکەم، کە هەر چەندە فەلسەفەی ناسراوی نیتشە زادەی قۆناغی پاش نووسراوەکەیەتی لە سەر تراجیدیا و بیروباوەڕی فەلسەفییانەی ئەو لەم قۆناغە سەرەتاییەدا نەخەملیوە و سەریهەڵنەداوە، بەڵام

دەتوانرێت ڕوانینە مێتافیزیکیەکەی لەو بەرگە شاراوەیەیدا بەرەو ڕووناکی پەلکێش بکرێت.

تراجیدیا بارودۆخی بوونی مرۆڤە و لە کاتیەتی ئەو بوونەوە پەیدابووە. ئەمەش نکۆڵی کردن لە کاتیەت و بڕانەوەی بوونەوەرەکانی دیکە نییە چونکە هەموو بوونەوەرێکی زیندوو بڕاوەیە و کۆتایی پێدێت. بەڵام لەناویاندا مرۆڤ بە ئاگاوە ڕوو لە کۆتایی خۆی دەکات و هەست بە بڕاوەیی و لەناوچوونی خۆی دەکات. ئاگایی ئەم بوونەیە واتا بە بوون و بڕانەوەکەشی دەدات و بەرگێکی تراجیدی بە بەردا دەکات. ئەگەر بوونی مرۆڤ لە ئاگایی بەدەر بوایە، ئەوا بڕانەوەی بوونیشی نەدەبوو بە (کۆتایی)یەکی تراجیدی. پێناسەکەمان بۆ تراجیدیا، وەکو (ڕەوتێکی ئاگامەندانەی بوونێکی ئاگامەند بەرەو کۆتایی) لێرەدا خۆی تەواو دەکات. ئەم پێناسەیە ئاماژەکردنە بۆ دوو لایەنی بنەڕەتیی بوونە ئاگامەندەکە، کە بە (ئاگامەند) و (بڕاوە) ناوەزەدمان کرد. ئەم دوو لایەنە بۆ پێناسەکەمان و دەرخستنی ناوەڕۆکی تراجیدیا تەواوکەری یەکدین. بوونی مرۆڤ بڕاوە و کاتییە، بەڵام بڕاوەیی و کاتیەتی ئەم بوونە ڕەوتێکی بە تەنیا و ئاگامەندانەیە بەرەو کۆتایی. مرۆڤ ئاگامەندانە ڕووی لە مردنە و هەست دەکات لە هەموو شتێک زیاتر لێوەی نزیکە و بە بەردەوامی لە مردن بە ئاگایە. مردن یان کۆتایی، لەوێدا تراجیدیایە، کە ئەم بوونە لەو کۆتاییە بە ئاگابێت و بە ئاگاییەوە بیکات بەدوا ئەزمون و دوا پرۆژەی خۆی.

ئەم کێشەیە چ پەیوەندییەکی بە مێتافیزیکی هیچگەرایەتییەوە هەیە؟ ئایا دەتوانین پەیوەندی تراجیدیا لەگەڵ سیستەمێکی

دیکەی مێتافیزیکدا ببەستین؟ ئایا مردنەکەی سوکرات لە بۆچوونی مێتافیزیکی ئەو فەیلەسوفەدا تراجیدیا بوو، لە کاتێکدا سوکرات باوەڕی بە کاتیەت و بڕانەوەی بوونی خۆی نەبوو؟ بۆچوونی ئێمە پەیوەندییەکی پێویست لە نێوان تراجیدیا و مێتافیزیکی هیچگەرایەتیدا دروست دەکات؟ ئەو سیستەمە مێتافیزیکییەی سوکرات پەیڕەوی دەکات باوەڕ بە کاتیەت و بڕانەوەی بوونی مرۆڤ ناکات و مردنیش بە قۆناغ بڕینێک لێرەوە بۆ جیهانێکی بەرزتر تەفسیر دەکات. بڕانەوەی بوون، لەبەر ڕۆشنایی مێتافیزیکی سوکراتدا، واتایەکی ڕەها نابەخشێت، بەڵکو گۆڕانکارییەکە بەرەو نەبڕانەوە و بەردەوامبوونی ئەو بوونە لە شێوازێکی دیکەدا. لەبەر ئەم هۆکارەیە سوکرات و هەموو ئەوانەی پەیڕەوی ئەم مێتافیزیکە دەکەن ڕووناکبینانە دەڕواننە مردن و باوەڕیان بە بەردەوامی (بوون)ە پاش مردن. بۆ نموونە، سوکرات لە دایەلۆگی (فیدۆن) ی ئەفلاتوندا بەم جۆرە لە کێشەی بڕانەوەی بوون دەدوێت، سوکرات گوتی؛ با بۆ چوونەکەی خۆمتان باشتر بۆ ڕوون بکەمەوە. بۆ سیماس و سێلیس لە کاتێکدا باوەڕم بەوە نەبێت، کە پاش مردن بۆ لای خواکان دەڕۆم و ئەو کەسە چاکانە دەبینم، کە لە پێش مندا مردوون ئەوا هەڵە دەبم ئەگەر مردن ناڕەوا دانەنێم. بەڵام من دڵنیام بەو کەسە چاکانە دەگەم و جەخت لە سەر ئەو خاڵەش دەکەم، کە خواکان دەبینم. لەبەر ئەمە، مردن بە دیدی من، ڕووداوێکی ناڕەوا نیە و دوای مردنیش هیوام بە ژیانێکی باشترە.[22]

---

22- بڕوانە:

Plato. ”Phaedo“, in *Plato’s Complete Works*, edited with introdu - tion and Notes by John M. Cooper Indianapolis: Hackett Publishing Company, 1997. P55 ..

نیتشه لەگەڵ ئەم مێتافیزیکە ڕووناکبینەدا ناکۆکە و کاتیەت و براوەیی بوون بە ڕاستەقینەیەکی بنەڕەتی دادەنێت.[23] لە بۆچوونی ئەودا، ڕووناکبینی سوکرات، لەسەر هیوایەکی لە بناخە بەدەر ڕاوەستاوە. سەر بە سیستەمێکی هۆشەکی سەردەمی ڕووخاوە. لە لایەکی دیکەشەوە دەستەڵاتی ڕەها و لەبن نەهاتووی بوونێکی دیکە لە ئاستی دەستەڵاتی بوونی مرۆڤدا زەق دەکاتەوە و زەبوونی دەکات. هیوا بە بەردەوامی (بوون) پاش مردن لە دەلاقەی مێتافیزیکە ڕووناکبینەکەوە دۆڕاندنی دەستەڵات و سەربەستی مرۆڤە. لەبەر ئەمەشە، لە بۆچوونەکانی نیتشەدا، باوەڕکردن بە سەربەستی مرۆڤ و هەبوونی دەستەڵاتێکی مێتافیزیکی ڕەها لە ژوور دەستەڵاتی مرۆڤەوە کێشەیەکی (پارادۆکس) دژوازە. دەستەڵاتی ژوورتر ڕێگری پەرەسەندن و ئازادی دەستەڵاتی مرۆڤە. لەم بۆچوونەوە، دەبینین بانگەشەی مێتافیزیکی هیچگەرایەتی ئاکامێکی حەتمییە و ڕووخاندنی بناخەی مێتافیزیکە ڕووناکبینەکە، وەک پێویستیەکی دامەزراو یەخەمان دەگرێت.

گیبانی ڤایتمۆ ئەم پێویستییە دامەزراوە و گۆڕانکارییە حەتمییەی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی نیتشە بە ڕووداو دادەنێت. ئەم بیریارە لەو باوەڕەدایە، کە بانگەشە کردنی لەناو بردنی دەستەڵاتە بەڕەزەکە یان مردنی خوا، لای نیتشە، ڕووداوێکە و لە قۆناغی دووەمی گەشەکردنی بیروباوەڕی نیتشەدا سەرهەڵ دەدات.[24] بە بیروڕای

23- بڕوانە:
Friedrich Nietzsche. “The Antichrist“, in *The Portable Nietzsche*, translated and edited by Walter Kaufmann, New York: The Viking Press, 1972. P. 572.

24- Gianni Vattimo. *Nietzsche: An Introduction*, translated by Nicholas Martin, California Stanfort, University Press 2001. P.85 .

من، ئەم گۆڕانکارییە بنەڕەتییە و شۆڕشکردنە بەسەر مێتافیزیکی ڕووناکبیندا لەبیری نیتشەدا بە تەنیا ڕووداو نیە و پێویستیەک و ئاکامێکی ئۆنتۆلۆجیانەیە لە شێوازی مێتافیزیکەکەیدا، کە لە سەرەتاوە پەیڕەوی کردووە. بێگومان، ئەگەر ئێمە لە ڕوانگەیەکی مێژووەوە بڕوانینە بوونی خوا و بە بوونێکی هەمیشەیی و سەرمەدی ناوزەد نەکەین، ئەوا مردنی ئەم بوونە ڕووداوە، بەڵام خوا بوونەوەرێکی مێژوویی نیە و لە نێو مێتافیزیکی ڕووناکبیندا بووە بە ڕاستییەکی نەگۆڕ و لە پێشتری ئۆنتۆلۆجی. لەبەر ئەمە، نیتشە، باسی ڕووخانی ئەو ڕاستییە، وەک ڕووداو ناکات، کە لە نێو کاتێکی مێژووییدا ڕووی دابێت. هەرچەندە نیتشە زمانێکی شاعیرانە لە دەربڕینی کێشەکەدا بەکاردەهێنێت بۆ ئەو ڕاستییە کە بناخەیەکی واقعی نیە و شتێک نیە هەبێت. باوەڕێکی لە بناخە بەدەری فەلسەفە ڕووخاوەکەیە، کە بۆ ماوەیەکی زۆرە بیرکردنەوەی شارستانیەتی پێوە ئالۆزاوە. خوا، وەک دژخواز بەرانبەر ژیان و سروشت و ویستی ژیان. خوا، وەک پێکهاتەیەک بۆ تاوانەکان بەرانبەر ژیان، بۆ درۆکان سەبارەت ژیانی پاش مردن، خوایەک، کە نیە و بووە بە بوونەوەرێکی پیرۆز.[25] نیتشە، نەبوونی بوونێکمان بۆ باس دەکات، کە بناخەیەکی ئۆنتۆلۆجی نیە. بەڵام لە لۆجیکی مێتافیزیکی ڕووناکبینی هۆشەکایەتیدا بووە بە ڕاستیەکی ڕەها و لە بنەڕەت بەدەر. بانگەشەی ڕووخاندنی ئەم ڕاستیە نا-ڕاستە مێتافیزیکییە لەناو بردنی شتێکی هەبوو نیە. پووچ کردنەوەی نەبوویەکە، کە لە مێتافیزیکی ڕووناکبیندا بووە بە بناخە بۆ بوون و زانین و بەهاکان. نیتشە لەگەڵ مردنی خوادا ئاماژە بۆ نەبوونی ئەو نەبووە دەکات. لە ڕەتدانەوەی ئەو(هیچ)ە وە ڕوو لە (هیچ) ێکی دیکە دەکات. من لەم ڕووەوە، بە پێچەوانەی ڤاتیمۆوە،

25 - هەمان سەرچاوەی پێشوو ، لاپەڕە ٥٨

مردنی خوا بە ڕووداو دانانێم چونکە خوا نیە، تاکو بمرێت. نیتشە لە دەربڕینی ئەم کێشەیەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە ڕاستیی مێتافیزیکی ڕووناکبینی هۆشەکایەتی (هیچ)ە.

لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە باوەڕ کردن بەو ڕاستییە لەناو بەرگێکی نادروست و لە لۆجیک بەدەردا بە دێژایی مێژوو ماوەتەوە و مێشکێکی نەخۆش و دیوارێکی ئەستور و بەرزی لە بەردەم پێشکەوتنی ئەو مێشکە نەخۆشەدا هەڵبەستوە. نەزۆکی مێتافیزیکی ڕووناکبین لەوێدا دەردەکەوێت، کە ئەو نەبووە ڕەهایە دەکات بە سەرچاوەی زانینی هەمەکی ڕاست و بەهاکان. دەستەڵاتی دامەزراندن و داهێنانی ئەو زانین و بەهایانە لە مرۆڤ زەوت دەکات. لە سەرو ئەم ڕێگرتن و زەوت کردنەشەوە باوەڕ بەو خوایە، بە تایبەتی لە نێو بۆچوونەکانی شوێنکەوتوانی (مەسیح) دا، مرۆڤی مل کەچ کردووە بە ئازاری ویژدانی و خۆ بەتاوانبار لە ئاستی خودا دابنێت و بۆ هەمیشە بەو مل کەچی و ئازارەوە بە زەبوونی بژی و چاوەڕوانی بەزەیی و لێبوردن لە خوا بکات. ئەم بارو دۆخە بە سەردا سەپێنراوە عەقلیەتێکی نەخۆشی لە ناو کۆمەڵدا پێکهێناوە و مرۆڤی کردووە بە کۆیلەی دەستەڵاتێکی زلهێزی نەبوو [26]. لێرەدا، جارێکی دیکە، ڕۆڵی مرۆڤە ڕزگاربووەکەمان لە ئەشکەوتەکە بۆ دەردەکەوێت. مرۆڤی ڕزگاربوو یان فەیلەسوف هەوڵی دۆزینەوەی نەخۆشیەکانی نێو بیرکردنەوەی مرۆڤ دەدات و چارەسەریان دەکات. گەورەترین نەخۆشی کوشندەی ئەو بیرکردنەوەیە، کە لەگەڵ ڕارەوی هۆشەکایەتیدا پەیدا بووە و مێتافیزیکی ڕووناکبین هێنابێتە کایەوە سەپاندنی ڕاستیە نا-

26 - Friedrich Nietzsche. ”Genealogy of Morals“, in *Basic Wri - ings of Nietzsche*, translated by Walker Kaufmann, p. 528.

ڕاستە مێتافیزیکییەکەی بوونی خوا و مل کەچکردنی مرۆڤە لە ئاستیدا. سیستەمی مێتافیزیکی نوێ، کە خۆی بە ناکۆک و دژوەستاو بەرانبەر مێتافیزیکی ڕووناکبین دادەنێت، لەو هەڵوێستە ڕادیکاڵە و یاخیبووەوە دەستپێدەکات و دەبێت بە دەستەڵاتێکی ڕەتدانەوە و شۆڕشگێر بۆ لە ناوبردنی نەخۆشیەکانی بیرکردنەوە.[27] نیتشە، لەم قۆناغی گەشەکردنی بیرکردنەوەیەیدا گەڕاوەتەوە بۆ ئەشکەوتەکە و ڕاستیەکانی دەرەوەی ئەشکەوت بە کەسانی نێو ئەشکەوت دەگەیەنێت. ئێمە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەم ڕۆڵە گرنگەی بیرکردنەوەی فەلسەفی کردووە و لەو خاڵەش دواین، کە بۆ نیتشە، گەڕانەوەی مرۆڤە ڕزگاربووەکە بۆ نێو ئەشکەوتەکە بە بێ ئەم ڕۆڵە مێژووییە بێهودەیە و گۆڕانکارییەکان ناخاتە گەڕ. هاوکات باسکردنی ڕاستیەکانی دەرەوەی ئەشکەوت و گەیاندنی هەواڵی مردنی خوا بە مێشکە نووستوەکانی کەسانی نێو ئەشکەوت کارێکی ئاسان و بێ گرفت نیە و ئاکامی نەرێ و بەرهەڵستی و توندوتیژی لە دواییە، کە هەندێک جار تراجیدیا سوکراتیەکە دەژیەنێتەوە. بەڵام نیتشە بەبێ ترس و بە زمانێکی ڕەوانی فەلسەفییەوە هەواڵەکە دەگەیەنێت. هەوڵی ڕوخاندنی کەلتووری نێو ئەشکەوت و شکاندنی تەلیسمەکانی دەدات. مرۆڤی نەخۆش و مێشکی سڕ بوو بەو کەلتوورە و مێتافیزیکە ڕووناکبینە بێبناخەیە بەرە و چاکبوونەوە دەبات و ڕاستیەکی دیکەی پێدەناسێت. تەلیسمەکانی ترس و ئازاری ویژدانی و خۆ بە تاوانبارزان و زەبوونی لەناو دەبات. دەستەڵات و ئازادیی زەوتکراوی مرۆڤ بۆ مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە. مردنی خوا، هەڵوێستی

---

٢٧ - بڕوانە: محەمەد کەمال، نیهێلزم و ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە، گۆڤاری ئایندە، ژمارە (٣٦) ساڵی ٢٠٠٢ ،دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی. لاپەڕە ٦٤.

هیچگەرایەتی لە بیرکردنەوەی فەلسەفیدا، گەڕانەوەی دەستەڵاتی مرۆڤ و لەناوبردنی نەخۆشییەکان پێویست و شۆڕشگێڕانەیە. بەبێ وەرگرتنی ئەو هەڵوێستە گۆڕانکارییەکان ناکەونە گەڕ و لە هەمانکاتیشدا بە شۆڕشگێڕانە دادەنرێت. گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی و ڕادیکاڵ لە بیرکردنەوەی فەلسەفیماندا پێکدەهێنێت.

ئەوەی سەرنجڕاکێشە و پێویستە باس بکرێت چۆنیەتی مردنی خوایە. ئایا چۆن خوا دەمرێت؟ لە پێشتر لەو خاڵە دواین، کە خوا نیە تاکو بمرێت. بەڵام نیتشە هەواڵی مردنی دەگەیەنێت و بەو هەواڵەش سیستەمێکی مێتافیزیکی نوێ دادەمەزرێنێت. لەگەڵ ئەمەشدا، مردنی خوا ڕووداوێکی سروشتی نیە. مرۆڤێکی ئازاو نە ترس بەو کارە هەڵدەستێ و خوا دەکوژێت. ئەو مرۆڤەش، نیتشەیە و ئەنجامدانی کارەکەش لە پێناو مرۆڤایەتیدایە و دەیەوێت مرۆڤ ڕزگار بکات. بوونی خوا و باوەڕهێنان بەو بوونە سەپاندنی دەستەڵاتێکی هەڕەشەکەر و داگیرکەرە. مرۆڤ بە زەبوونی و ملکەچی دەهێڵێتەوە. هەروەها، دەبێت بە گەواهێکی هەمیشەیی بۆ زەبوونی و مل کەچ کردنی مرۆڤ. وەستانی مل کەچانە و زەبوون شێوازێکی نزم و ناشرینی بوونی مرۆڤە و پێویستە مرۆڤ لەو شێوازە ناشرینە دا نەمێنێتەوە، "دەمەوێت تۆڵە لەو گەواهە بسەنم. ئەو خوایەی هەموو شتێک دەبینێت و هەموو کەسێکی لێوە دیارە، دەبێ بمرێت! کەس نایەوێ ئەو گەواهە بژی[28]." ناشرینی و نزمی بوونی مرۆڤ لە ئاست بوونی خوادا لە سەر شۆڕ کردنیدایە (بۆ خوا). بوونێک

28 - بڕوانە

Friedrich Nietzsche. Thus Spake Zarathustra, translated by Thomas Common, introduced by Nicholas Davey, London: Wordsworth Classics of World Literature 1997. P. 258

خاوەنی خۆی نەبێت و زانین و بەهاکانی لە دەرەوەیدا بۆ دانرابێت و سەپێنرابن بە سەریدا بوونێکی ناشرین و نزمی هەیە و بە بۆچوونی نیتشە، مرۆڤی سەردەم نیازی بەردەوامبوونی لەو شێوازەدا نابێ هەبێت و بە کۆیلەیی نابێ بژی. لەبەر ئەمەشە، پێویستە مرۆڤە ئازا و نەترسەکە خوا بکوژێ و مرۆڤایەتیش لە هەستکردنی خۆ بەکەم زانین و خۆ بە تاوانبارزان لە ئاست ئەو دەستەڵات و گەواهە ڕەهایەدا ڕزگار بکات، "باشتروایە خوا نەبێت، باشتروایە خۆت بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆت بدەیت و خۆت ببیت بە خوای خۆت."[29]

ڕۆژی مردنی خوا، ڕۆژی لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز و سەربەستە. گەڕانەوەی دەستەڵاتە بۆ مرۆڤ، "ئێستا خوا مردووە، خوا بۆ تۆ، ئەی مرۆڤی بەرز، گەورەترین مەترسی بوو. تاکو ئەومان نەناشتایە تۆ پەیدا نەدەبوویت. وا نیوەڕۆیەکی ڕووناک دەستپێدەکات و مرۆڤی بەرزیش دەبێت بە خاوەنی خۆی ... ئەی مرۆڤی بەرز! بەسەر چیای داهاتووی مرۆڤایەتییدا هەڵگەڕێ. خوا مرد بەڵام مرۆڤی بەرز (سوپەرمان) دەبێ بژی."[30]

ئێمە مردنی خوامان بە میتافۆر بۆ ڕوخاندنی سیستەمی مێتافیزیکی ڕووناکبین دانا نەک ڕووداوێکی ناو مێژوو، هاوکات ڕوخاندن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو سیستەمە بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی هیچگەرایەتی هەوڵدانێکی پێویستە و ناتوانین دەستبەرداریبین. لەبەر ئەمەشە بانگەشەکەی نیتشە تەفسیری جۆراوجۆری بۆ

---

29 - هەمان سەرچاوە. لاپەڕە٢٥٣. هەروەها بڕوانە ئەم پەڕتووکەی نیتشە.
Friedrich Nietzsche. The Twilight of the Idoles, translated by Thomas Common, New York: Dover Publications, 2004. P. 2 .

30 - هەمان سەرچاوە. لاپەڕە٢٧٦ .

دەکرێت. بێجگە لە بۆچوونەکەی ڤاتیمۆ و لێکدانەوەکەی خۆمان، کە لەگەڵ بۆچوونەکەی ڤاتیمۆدا نەیارە دەتوانرێت لە ڕوانگەی بیردۆزی دەروونشیکاری فرۆیدەوە مامەڵە لەگەڵ کێشەی مردنی خوا بکرێت. خوا بە گوێرەی بۆچوونێکی بڕواگەری ئاماژەکردنە بۆ بوونی باوکێکی خاوەن دەستەڵاتی ڕەها. ئەم باوکە لە باوکی بایەلۆجی مرۆڤ بە تەواناتر و بە هێزترە. هەروەها بە بۆچوونی فرۆید، منداڵی نێرینە لە تەمەنێکی دیاریکراوی منداڵییدا بە شاراوەیی حەز لە دایکی دەکات و بەرانبەر باوکی و نزیکبوونەوەی باوکی لە دایکییەوە هەست بە (غیرە) دەکات و خواستی کوشتنی باوکی دەکات. فرۆید کێشەی کوشتنی باوکی لە ئەدەبی کلاسیکی یۆنانەوە لە چیرۆکی (ئۆدیبی پاشا)وە وەرگرتووە و ئەم هەستکردنەی بە گرێی ئۆدیب ناوزەد کردووە.[31] لە بۆ چوونەکەی فرۆیدەوە کوشتنی خوا لە لایەن نیتشەوە کوشتنی باوکە بە دەستی ئۆدیب. نیتشەی خاوەن گرێی ئۆدیب دەیەوێت خۆی لە ژێر دەستەڵاتی داگیرکەری باوکی ڕزگار بکات و بۆ ئەم مەبەستەش کوشتنی ئەو باوکە بە کارێکی پێویست دادەنێت. بەڵام کوشتنی ئەو باوکە لە پێناوی حەز و ئارەزووەکانی تاکە کەسێکدا نیە. ئەرکێکی مرۆڤانەیە و بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتییە. سەربەستی و بەرزی مرۆڤ لە ئاکامی ئەو تاوانەدایە. لەم ڕووەوە کارڵ یاسپەرزیش لەو باوەڕەدایە و لەگەڵ ئێمەدا هاوڕایە، کە کوشتنی خوا بە تەنیا بۆ بەرژەوەندی ئۆدیب نیە، بەڵکو گەڕانە بە شوێن مرۆڤی بەرز و خاوەن دەستەڵاتدا.[32]

---

31 - Sigmund Freud. *Introductory Lectures on Psychoanalysis,* translated by James Strachey, New York: Penguin Books, 1991. P. 379.

32 - Karl Jaspers. *Nietzsche: An Introduction to the Understan – ing of His Philosophical Activitis*, translated by C. F. Wallraff and F.J. Schmitz, Baltimore: John Hopkins . University Press, 1997. P. 126 .

لەگەڵ مەرگی خوادا، مرۆڤی بەرز لە دایک دەبێت و مرۆڤێک، کە خۆی بە گوناهبار و ناشرین و زەبوون دانانێت و خاوەنی پرۆژەکانی بوونی خۆیەتی و خۆی بڕیاریان لەسەر دەدات. مرۆڤێک، کە پەنا بۆ هیچ دەستەڵاتێکی دەرەکی نابات و چۆکی بۆ دانادات و لە ئاستیدا مل کەچ نابێت.

مرۆڤی بێبڕوا دزێو و ناشرین نیە، چونکە سەربەستە و هیچ دەستەڵاتێکی دەرەکی بوونی داگیر ناکات. ناشرینی و دزێوی لە ژیانی کۆیلایەتی و بڕواگەریدایە. بڕواکەر کەسێکی زەبوون و ترسنۆکە و بوونێکی نامۆی هەیە. خۆی لە لێپرسینەوەی مێژوویی بێبەری دەکات. دەستەڵات و تەوانایی و هەڵسوڕانی ڕووداوەکان بە خوا دەسپێرێت و خۆی لێ نامۆ دەکات. چاوەڕوانکەری بەزەییە لەو دەستەڵاتە دەرەکییە. ئەم هەڵوێستە وەستانێکی خۆ نەویستانە و خۆ بەکەم زانە، کە نیتشە بە نەخۆشیەکی بکوژی دادەنێت و بانگەشەی ڕەتکردنی دەکات. بەو شێوەیەی ڕوونمان کردەوە، هیچگەرایەتی لەگەڵ دامەزراندنی سیستەمە مێتافیزیکییەکەیدا لە مەبەست بەدەر نیە. لە لایەکەوە بووە بە پێگەیەکی زەروری بۆ لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز و گەڕانەوەی دەستەڵات و سەربەستی بۆ مرۆڤ. لە لایەکی دیکەوە، بەرنامەی کارکردنە، کە کوشتنی خوا لە پێناوی ڕزگاری کردنی مرۆڤایەتیدا دەکات بە سەرەتای دەستپێکردنی پرۆژە فەلسەفییەکەی. بەرنامەی کارکردنی هیچگەرایەتی بۆ ڕەتکردنی مرۆڤایەتی نیە، بەڵکو سەقامگیر کردنی ڕەسەنیەتی مرۆڤایەتییە. دروستە نیتشە لە هەندێک شوێن لە نووسراوە کانیدا داوای ڕەتکردنی مرۆڤ دەکات، بەڵام بە بیروڕای من داواکەی نیتشە باشتر لە بەر

ڕۆشنایی مردنی خوادا ڕوون دەبێتەوە[33]. دەبێت بزانین نیتشە لە چی ڕوانگەیەکەوە مامەڵە لەگەڵ کێشەی ڕەتکردن دەکات و لە بەستێنی پڕۆژە هیچگەرایەتییەکەوە ڕووت نەکرێتەوە و بە تەنیا تەماشای نەکرێت. پێویستە بزانرێت ئەو مرۆڤە چییە و چۆنە، کە نیتشە دەیەوێت لەگەڵیدا هاوشان نەوەستێت. ئەگەر مرۆڤ و مرۆڤایەتی ڕەت بکرێت، ئێمە بە کوێ دەگەین؟ بەچی دەبین؟ ئایا پاش مردنی خوا بوونێکی بەرزتر لە بوونی مرۆڤ هەیە؟

مەبەست لە ڕەتکردنی مرۆڤ ڕەتدانەوەی ناشرینی و زەبوونی مرۆڤی بڕواکەرە. مرۆڤ لە ژێر زەبر و بارودۆخی نەرێی بڕواگەرییدا خۆی بە گوناهبار و زەبوون دادەنێت و بە نامۆیی دەژی. ڕەتکردنی ئەم جۆرە مرۆڤە، ڕەتکردنی مرۆڤایەتی نیە. خۆ گەیاندنە بە شێوازێکی بوون، کە تیایدا مرۆڤ خۆی بە گوناهبار و ناشرین و زەبوون دانانێت. شێوازێک، کە دەستەڵات و سەربەستی بۆ مرۆڤ مسۆگەر دەکات و مرۆڤیش لە ئاوێنەی ئەو شێوازەدا خۆی بە خاوەن دەستەڵات و جوان و سەربەست دادەنێت. بەم جۆرە ڕەتکردنی مرۆڤ بەرە و نامرۆڤی ناڕوات، ڕەوتێکی بەرە و پێشەوە چوونە لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ. هاوکات جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان مرۆڤی لە پێشتر و لە پاشتر دا هەیە. مرۆڤی لە پێشتر، کە ڕەتکراوە نارەسەن و کۆیلەیە. مرۆڤی لە پاشتر و پێی گەیشتراو ڕەسەن و سەربەستە. لەم ئاکامەوە دەتوانین ئاماژە بۆ ئەو خاڵە گرنگە بکەین، کە کوشتنی باوک لە لایەن ئۆدیبەوە ئامانجی بوون بە باوکی نیە، تاکو دەستەڵاتی خۆی بۆ داگیرکردنی کەسێکی دیکە بخاتە گەڕ. دروستە بە کوشتنی خوا مرۆڤی بەرز دەستی بە خوا دەگات، بەڵام بەرزێتی ئەو شەوی تاریک

33 - Friedrich Nietzsche . *Thus Spake Zarathustra*, p . 258.

به سەر ئاسمانی مرۆڤایەتییدا ناهێنێت و سەرکەوتنی ئەو سەرکەوتنی مرۆڤایەتییە. ئەو دەیەوێت لەگەڵ کوشتنی ئەو باوکە مێتافیزیکییەدا ڕایگەیەنێت، کە مرۆڤ خاوەن دەستەڵات و سەربەستە. ناکۆکییەکان لەم قۆناخە مێتافیزیکییەدا لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤێکی دیکەدا نیە، لە نێوان دەستەڵاتی ڕەهای خوایەتی و زەبوونی مرۆڤایەتیدایە. ڕوخاندنی دەستەڵاتە ڕەهاکە و زەبوونی مرۆڤ بووە بە بەرنامەیەکی فەلسەفی. لەم قۆناخەدا مرۆڤایەتی لە سەر دوو ڕیانەیەک ڕاوەستاوە و دەبێت یەکێک لەو ڕێگایانە هەڵبژێرێت. هەڵبژاردنەکەی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە چییەتی بوونیدا دادەهێنێت. لە لایەکەوە ڕێگای بڕواگەری و لە لاکەی دیکەوە بێبڕواگەرییە. بە زمانە فەلسەفییەکەشی دوو ڕیانەی هیچگەرایەتی و سیستەمی مێتافیزیکی ڕووناکبینی هۆشگەرایەتییە. دوو ڕیانەی نێوان خوا و مرۆڤە، کۆیلایەتی و سەربەستی، ناشرینی و جوانییە. مرۆڤی سەردەم دەبێت یەکێک لەم دوو ڕێگایە هەڵبژێرێت. لەگەڵ هەڵبژاردنی ڕێگای یەکەمیاندا گۆڕانکارییە مێژووییەکان پوچ دەبنەوە و مرۆڤ بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە. ڕێگای دووەمیش، لەگەڵ دامەزراندنی هیچگەرایەتی و کوشتنی باوکە مێتافیزیکیەکەدا مرۆڤ دەبێت بە خاوەنی خۆی و گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو. هەستکردن بە گوناهباری دەبێت بە ناڕەوا و نەگونجاو چونکە مرۆڤ خۆی دەگەیەنێتە ژوور ئەو هەستکردنەوە و بەسەرییدا زاڵدەبێت. ئەو، نەک خوا، دەبێت بە سەرچاوەی چاکە و خراپە و بەها ڕەوشتیەکانی و خۆی بڕیار لە سەر چاکە و خراپەکانی کردەوەکانی دەدات و دایاندەهێنێت. لەگەڵ کوشتنی خوادا (سێبەری خوا)ش لە ناودەچێت.[34]

ئایا مەبەستی نیتشە لە سێبەری خوا چییە؟ سێبەری خوا یان پاشکۆ

34 - سێبەری خوا زاراوەیەکە لە نیتشە لە پەڕتووکی The Gay Science دا بە کاری هێنراوە،

و به جێماوی سیستەمە ڕووخاوە کە ئەو بیرۆکانەن مافی حەقزان و هەمەکی و نەبڕاوەیی بە خۆیان دەدەن. ئەگەر جۆرە بەهایەک لە نێو کۆمەڵدا باو بێت و بە بەهایەکی هەمەکی و نەگۆڕ دابنرێت یان بۆ نموونە فۆرمەکانی جیهانی بەرزی ئەفلاتون بە سێبەری خوا دەخوێنرێنەوە ، کە لە ئەنجامی باوەڕهێنان بە سیستەمی مێتافیزیکی ڕووناکبینەوە سەریان هەڵداوە . لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی ئەو سیستەمە مێتافیزیکییەدا و دامەزراندنی هیچگەرایەتیدا ڕاستی و دروستی بیرۆکە و بەها هەمەکی و نەگۆڕەکانیش لەناو دەچن و هیچ شتێک لە بەردەم تەوژمی گۆڕانکاری و بڕانەوەدا (وەکو خۆی) نامێنێتەوە و دەبێت بە ڕێژەیی. کوشتنی خوا بەم شێوەیە لەناوبردنی هەموو ڕەهایەکە. تێگەیشتنمان سەبارەت بوون و زانین و بەهاکان لە بنەڕەتەوە دەگۆڕێت. تەوژمی گۆڕانکاری هەموو شتێک پەیوەندی بە خوا و بوونی ڕەهای ئەوەوە هەیە و لەگەڵ خۆیدا ڕایدەماڵێ و فڕێی دەداتە نێو ڕۆخانەی ڕابردووەوە.

هیچگەرایەتی، وەکو بەرنامەیەکی کارکردن، لە ئاستی کوشتنی خوادا ناوەستێ و ڕۆڵی مێژوویی بە خۆی دەدات. تەنیا لەم نەوەستانەدا بوون و مێژوو پێکەوە گرێدەدات و پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان مێتافیزیک و فنینۆمینۆلۆجییدا دەبەستێت و خۆی دەگەیەنێتە ژوور هیچایەتی بوون و زانین و بەهاکان و واتایەکی نوێیان پێدەبەخشێت. پرۆژەی کوشتنی خوا، بۆ نیتشە، پرۆژەی سڕینەوەی سێبەری ئەو دەستەڵاتە ڕەهایەیە. بە نا-ڕەها کردنی دەستەڵات و بە خوا نەکردنی مرۆڤە. خۆ ئەگەر ئێمە پاش کوشتنی خوا دەستەڵاتێکی ڕەها و بیرۆکەی نەگۆر لە بەردەم خۆماندا قوتکەینەوە و بە بەردەوامی بمێنینەوە، ئەوا پرۆژە هیچگەرایەتییەکەمان نەک بە ڕۆڵی مێژوویی

خۆی هەڵناسێت بەڵکو بە هیچگەرایەتیش دانانرێت. هیچگەرایەتی تەنیا ڕەتدانەوەی دەستەڵاتێکی ڕەهای ژوور مێژوو نیە. دامەزراندنی مێژوویەکی مرۆڤانەشە، کە مرۆڤ تیایدا خۆی دادەهێنێ و خۆی تەواو دەکات. مێژوویەک دەستەڵات و ویستی ڕەها نایبات بەڕێوە و (ویستی هێز)ی تاکەکان بڕیاری لەسەر دەدات.

شێوازێکی دیکەی تێگەیشتن لە کێشەی (سێبەری خوا) ئەوەیە، بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەوە، کە گوایە خوا لە شێوەی خۆی مرۆڤی ئافەرید کردووە، لای نیتشە مرۆڤ بە ئەندێشەی خۆی بوونی خوای نەخشە کێشاوە. شێوەی خواش لە ئەندێشەی مرۆڤدا بۆ بیرکردنەوەی مرۆڤ لە خوا دەگەڕێتەوە. ئەگەر هونەرمەندێکی پێست ڕەش وێنەی خوا بکێشێ پێستی خوا ڕەش دەکات. فیۆرباخ و هیۆم لە پێشتر لەم کێشەیە دواون. لەو باوەڕەدابوون مرۆڤ ویستی دەستەڵاتی ڕەها و هەموو خەسڵەتێکی ڕەهای هەبووە. بەڵام نەیتوانیوە ویستەکەی بهێنێتەدی و ناچار ئەو خەسڵەتە ڕەهایانەی لە دەرەوەی بوونی خۆیدا بە بوونێکی دیکە بەخشیوە و خۆی لێیان نامۆ کردووە. هەموو ئەم خەسڵەتە ڕەهایانەی بە خوا دراون و نیتشە بە سێبەری ئەویان دادەنێت بوون بە سەرچاوەی بیروباوەڕی ئایین و بڕواگەری و دۆگمای بێ دەستەڵاتی و زەبوونی مرۆڤ و بە کوشتنی خوا پوچەڵ دەبنەوە.[35] دامەزراندنی سیستەمی مێتافیزیکی هیچگەرایەتیـ بەرنامەگەرانە سەرەڕای هەڵوەشاندنەوەی بناخەی ڕەها و هەمەکیەکە بۆ بوون و زانین و بەهاکان، جێگەی مرۆڤیش لە پەراوێزەوە بەرەو

---

35 - بڕوانە پەڕتووکەکەی نیتشە: هیچگەرایەتی لاپەڕە 108.
Friedrich Nietzsche. *The Gay Science*, translated by Walter Kaufmann, New York: Vintage Books, 1974. P. 167.

چەق دەگوێزێتەوە. لەم سیستەمەدا، بە پێچەوانەی مێتافیزیکی ڕووناکبینەوە، کە خوای بە پێوەر دادەنا، مرۆڤ دەبێت بە پێوەر. ئەم پێوەرە جێگرە خاوەنی سەدەمێکی لە پێشتر و هۆشەکی نیە تاکو بوونی داگیر بکات و لە پێشوەختا سوربێت لە سەر ناوەڕۆکی و ڕەوتی ژیانی لە مێژوودا دیاری بکات بەڵکو هۆکردی ڕێکەوتێکی کوێر و لە ئاگا بەدەرە. مرۆڤی بێ ناوەڕۆک فرێداوەتە ئێرە و لە بەردەم بوارە بێ سنورەکاندا ڕایگرتووە. نەک بە تەنیا بوونی مرۆڤ بەڵکو (سروشت)یش لە ژێر حوکمی ئەو ڕێکەوتە کوێرەدا پەیدابووە و بە بەردەوامی گۆڕانکارییەکانی تێدا ڕوودەدات، "سروشت زیادە ڕۆیی دەکات، دەشێوێ و بۆشایی جێدەهێڵێت. سروشت ڕێکەوتە."[36] ئەم کێشەیە ئاکامێکی لۆجیکمەندانەی ڕەتدانی سەدەمی هۆشەکییە بۆ بوون. لە سیستەمێکی مێتافیزیکییدا ناگونجێت بوونی ئەو سەدەمە و ڕێکەوت کۆبکرێنەوە. لە کاتێکدا بانگەشەی مردنی خوا دەکرێت ڕاستەوخۆ دەگەینە ئەو باوەڕەی، کە مادامەکی خوا مردووە، یان خوا نیە بوونیش بێ یاسا و لە ئاگا بەدەر و ڕێکەوتە. کۆکردنەوەی خوا و ڕێکەوت پێکەوە ناکۆک نیە بەڵکو دژوازە (پارادۆکسە)و وەکو کێشەی بازنەیەکی چوارگۆشەییە. لەبەر ئەمەشە نیتشە پاش کوشتنی خوا و ناشتنی تەرمی بڕواگەری باسی ڕێکەوتمان لە سروشتدا بۆ دەکات و مژدەی لە دایکبوونی مرۆڤی بەرزمان پێدەدات. بێبڕواگەرایەتی لەم ڕوانگەیەوە دەبێت بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز و پردی پەڕینەوە لە نێوان بوونی مرۆڤی ناشرین و زەبوون بەرە و مرۆڤی جوان و بەرز. هەڵوێستێکی فەلسەفییانەی شۆڕشگێڕانە، کە مرۆڤی ترسنۆک و زەبوون لە ئاستیدا سڵ دەکەنەوە

36 - Friedrich Nietzsche, *The Twillight of the ldoles*, p. 43.

و شوێنی ناکەون. ترسنۆکی ئەو جۆرە مرۆڤە دەبێت بە هاندەری خۆ دزینەوەی لە لێپرسینەوەی مێژوویی و ڕەتدانەوەی ناوەڕۆکی مرۆڤ و سوربوون لەسەر نامۆیی.

دەربڕینی ڕاستی بێبڕواگەری و هەواڵی کوشتنی خوا لە لایەن مرۆڤە ڕزگاربووەکەی نێو ئەشکەوتەکەوە کەسانی نێو ئەشکەوتەکە بە دوو جۆر دەشێوێنێت. هەندێکیان لەگەڵ بیستنی هەواڵەکە و ناسینی ڕاستیەکەدا بەو هەواڵە مەست دەبن "ئەوەی لە خۆشیدا شێت بوو بازی دایە نێو خەڵکەکەوە و گوتی: خوا لە کوێ یە؟ ئینجا هاواری کرد، من پێتان دەڵێم، ئێمە خوامان کوشت. من و تۆ هەمووومان بکوژی ئەوین."[37] مەست بوون لە بیستنی ئەو هەواڵە بۆ وەدەستهێنانی ئازادییە کۆیلە بە درێژایی تەمەنی خەونی پێوە دەبینێت. کەسانی دیکەی نێو ئەشکەوتەکە، ئەوانەی لەو ئازادییە دەترسن بە بیستنی هەواڵەکە دەشێوێن و بۆ سەقامگیرکردنی دۆگمای نێو ئەشکەوتەکە و بەردەوام بوون بە سێبەرەکانی خوا دژی مرۆڤە ڕزگاربووەکە یان هەواڵ هێنەرەکە دەوەستن و بە توند و تیژییەوە بەرەنگاری دەکەن.

لێرەدا بەکارهێنانی توندوتیژی مرۆڤی ناشرین لە ئازایەتی ئەو مرۆڤە و تێکۆشان لە پێناوی ئازادیدا نیە، بەڵکو لە ترسنۆکیدایە بەرانبەر ئازادی و وەرگرتنی ڕۆڵێکی سەربەخۆ و خاوەن خۆیی لە مێژوودا. مرۆڤی ناشرین ویستی خۆی لە ئاستی ویستی خوادا وونکردووە و خوا بە هەموو شتێک دادەنێت، بۆیە نایەوێت خوا بدۆڕێنێت و پەنا بۆ سێبەرەکەی دەبات. ئایا چی ڕاستیەک لە نێو مێتافیزیکی هیچگەرایەتیدا بە تایبەتی پاش مردنی خوا خۆی دەردەخات و

37- Friedrich Nietzsche. *The Gay Science*, p. 128.

دەبێت بە هەوێنی بیری فەلسەفییانەی نیتشە؟ ئەگەر بوون (هیچ) بێت و لە سەدەم بەدەر بێت، چی پرنسیپاڵێکی دیکە بەردەوامی بە بوونی مرۆڤ دەدات و بەرەو داهاتووی دەبات؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا (ویستی هێز) بۆ نیتشە دەبێت بەو پرنسیپاڵە لە مێژوودا گۆڕانکارییەکان دەخاتە گەڕ و مرۆڤی بەرز بەرەو داهاتوویەکی ڕووناکتر دەبات.

پێش لێکۆڵینەوە لە واتای (ویستی هێز) حەز دەکەم جارێکی دیکە بگەڕێمەوە بۆ بۆچوونەکانی شۆپنهاوەری مامۆستای نیتشە و کاریگەرێتی شۆپنهاوەر بە سەر نیتشەوە زیاتر ڕوون بکەمەوە تاکو لەوێوە لە واتای ویستی هێز بگەین. شۆپنهاوەر یەکێکە لە بیریارانی سەر بە بزوتنەوەی ڕۆمانتیسیزم لە فەلسەفەدا. هەوڵیداوە کێشە بە جێماوەکانی نێو فەلسەفەی کانت چارەسەر بکات و گونجاندنی ناسین و پەیداکردنی زانین سەبارەت بەو ڕاستەقینە نەناسراوەوە بسەلمێنێت، کە کانت لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا لە پەرتووکی یەکەمیدا قوتی کردۆتەوە. کانت، لەو لێکۆڵینەوەیەدا و لەگەڵ پەیڕەویکردنی بیردۆزە ئەپستمۆلۆجییەکەی، گەیشتە ئەو ئاکامە نەرێیەی، کە ڕاستەقینەی بوون هەمیشە نەناسراوە و بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. ئەگەر ئەو ڕاستییە هەبێت، کە بە بوون لە ناو خۆیدا ناوی دەبات، هەرگیز ناکەوێتە بەر ڕۆشنایی زانینی مرۆڤەوە. گەیشتن بەم ئاکامە نەرێیەش لەو پێگە ئەپستمۆلۆجییەوە دەکەوێتە ڕێ، کە تەوانایی زانین بە ئەزموونی هەستەکی و کاتیگۆریەکانی نێو (تێگەیشتن)وە سنووSداS دەکات. زانینی مرۆڤ لە نێو بازنەی ئەزموونە هەستییەکان و خوێندنەوەی کاتیگۆرییەکانەوە دەرناچێت و خۆی ناگەیەنێتە قۆناغ و بابەتێکی ژوورتر لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا. ئەوەی بیرکردنەوە دەیناسێ و

زانینی لەبارەوە پەیدادەکات دیاردەکانن، کە ئەزموونی هەستەکی ڕۆشناییان دەخاتە سەر و کاتیگۆرییەکانیش دەیانخوێننەوە. مرۆڤ ناتوانێت زانینی لە بارەی بوونێکەوە لە ژوور دیاردەکانەوە هەبێت. گریمان ئەو بوونە بەرزە هەیە، بەڵام زانینی مرۆڤ لەو بوونە بێ بەشە و هیچی لە بارەوە نازانێت، چونکە ناکەوێتە بەر ڕۆشنایی ئەزموونەکەی و ئەو بوونەش دیاردە نیە، بەڵکو ڕاستەقینەی ناوەکی دیاردەکانە و لەودیو دیاردەکانەوەیە. کانت، بە بێ سەلماندنی ئەو بوونە و بەڵگە دانان بۆی باوەڕی بە ڕاستەقینەیەکی بەرز لەودیو یان لە ژوور دیاردەکانەوە کردوە. بێگومان ئەو ڕاستەقینە بەرزە نەبووە بە بابەتی ئەزموونی هەستەکی بۆ کانت. ئەم فەیلەسوفە نەیتوانیوە ئەو ڕاستەقینەیە بناسێت، بەڵام لۆجیکمەندانە خۆی گەیاندۆتە ئەو بڕوایە و بگرە، وەکو ئەفلاتون یان زۆر لە فەیلەسوفەکانی پاش ئەفلاتون بە ڕێگەی چەسپاندنی یاسای هۆ و هۆکرد بەم باوەڕە گەیشتوە. کانت لەو باوەڕەدایە ڕاستەقینەیەک لەودیو دیاردەکانەوە هەیە. هاوکات ناتوانێت ڕایگەیەنێت ئەو ڕاستەقینەیە چییە و چۆنە. بە شاراوەیی و نەناسراوی لە سیستەمە فەلسەفییەکەیدا دایمەزراندوە. گەلێک لە بیریارانی پاش کانت مامەڵەیان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا کردووە و هەر یەکێک لەوان بە گوێرەی بۆچوونی خۆی چارەسەری گرفتەکەی کردووە و ڕاستەقینە شاراوە و نەناسراوەکەی بەرەو ڕۆشنایی زانینی مرۆڤ پەلکێشیکردووە.[38] یەکێک لەو بیریارانە شۆپنهاوەرە. شۆپنهاوەر، بە پێچەوانەی کانتەوە، لەو باوەڕەدایە ڕاستەقینەی بوون هەر چییەک بێت مادامەکی سەرچاوەی دیاردەکانە و بوونی دیاردە فرە جۆرەکان لە سەر ئەو ڕادەوەستن و دێنەکایەوە

38 - بڕوانە: محەمەد کەمال، فەلسەفەی هیگڵ، دەستگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، لاپەڕە ١٥

ئەوا ناسینی ئەو سەرچاوەیە کارێکی مەحاڵ و دژوار نیە. ئێمە زۆر جار لە ڕێگەی ناسینی هۆکردەوە هۆکەش دەناسین. ئەگەر بزانین برینێک لە ئاکامی سوتاندنەوە بە ئاگر پەیدابووە ڕاستەوخۆ دەگەین بەو باوەڕەی، کە ئاگر گەرمە و هۆیە بۆ سوتاندن. بە هەمان شێوە، لە بوونی خۆمان و دیاردەکانەوە بڕوانینە ئەو ڕاستەقینەیە، کە سەرچاوەی بوونمانە، دەبینین ئەوەی لە نێو هەموویاندا و لەژێر بناخەی دیاردە فرە جۆرەکانەوە خۆی دەنوێنێ و دیاردەکان دەهێنێتە داکەوتەوە (هۆشێکی ڕەها)ی نێو فەلسەفەی هیگڵ و(خۆی ڕەها)ی فیختە نیە. چونکە ئەو ڕاستەقینە یەکانەگیەی ژێر دیاردە فرە جۆرەکان، وەکو ئاگامەندی نابینرێت، زیاتر هێزێکی ژێر سروشتە، کە لەو دیو دیاردەکانەوە دەستەڵاتی خۆی لە نێو هەموو شتێکدا سەقامگیر دەکات و خۆی دەردەخات. ئەو هێزەش (ویستی ژیان)ە. [39] ئەم ڕاستەقینەیە لەبەر ئەوەی خۆی دەردەخات و خۆ دەرخستنەکەی دەبێت بە هەبووە فرە جۆرەکان و بیرۆکەکان، ئەوا تاکو ڕادەیەک، بە گوێرەی تێگەیشتنی مرۆڤ دەناسرێت و زانیاری لە بارەوە پەیدا دەکرێت. لەبەر ئەوە ئاکامە نەرێکەی کانت پێویستە ڕەتبدرێتەوە و لەم ڕێگە چارەیەوە بڕوانرێتە سەرکێشەکە. ویستی ژیان، هاوکات، دەستەڵاتێکی هەمەکی و ئۆنتۆلۆجیە. سەرچاوەی هەبووە فرەجۆرەکانە. دیاردە و نادیاردە، دیار و نادیار، زانراو و نەزانراویشە. هەموو هەبووەکان دیاردە و ڕواڵەتی ئەون و بە بێ ئەو نابن. بەڵام ویستی ژیان دەستەڵاتێکی ئاگامەندانە (وەکو هۆشی ڕەهای هیگڵ) نیە تاکو نەخشە بۆ بوون بکێشێ و لە پێشوەختدا مەبەستی لە پێشتری بۆ دانێت. دەستەڵاتێکی کوێر و بێ ئاگایە و بە بێ مەبەست خۆی دەردەخات و بە بێ ئاگا هەبووە فرە جۆرەکان

39- Arthur Schopenhauer. *The World as Will and Idea, vol.*1, p.109.

دەهێنێتە بەر ڕۆشنایی بوون. جیهان، بەم جۆرە، لە سیستەمی مێتافیزیکی شۆپنهاوەردا لە گەشت و سوڕانەوەیەکی کوێرانە و لە غایە بەدەردایە. هاوڕایی نیتشە لەگەڵ شۆپنهاوەردا لە سەر دوو خاڵ ڕادەوەستێت: یەکەم ڕەتدانەوەی پلان و نەخشەیەکی لە پێشتری ئاگامەندانە بۆ بوون، دووەم گەڕانەوەی بنەڕەتی بوون بۆ (ویست). لەگەڵ دامەزراندنی مێتافیزیکی هیچگەرایەتیدا بناخەی ڕاستەقینە هەمەکییەکان هەڵدەوەشێنەوە. هیچ ڕاستیەک و بەهایەک لەم شێوە مێتافیزیکەدا لافی هەمەکی و ڕەهایی لێ نادات. ناگونجێت ڕاستەقینەیەکی هەمەکی لە هەرچ شێوازێکدا بێت لە ئاستی خۆماندا دامەزرێنین و دەستەڵاتی مرۆڤ داگیرکات یان کەمیبکاتەوە. (ویست) نابێت هەمەکی بێت، بەڵکو هەندەکی و ویستی تاکەکانە نەک بۆ مانەوە و بەردەوامی بەڵکو لە پێناوی دامەزراندنی دەستەڵات و هێزدا دەکەوێتە گەڕ. نابێ تاکەکان لە ئاستێکی نزمی ژیاندا هەوڵی مانەوە و بەردەوامی بدەن. نزمی شێوازێکە مرۆڤ تیایدا بە زەبوونی و کۆیلایەتی ژیان دەباتە سەر.

بوونی مرۆڤ ژیان بەسەر بردن نیە. چۆنیەتی و چییەتی ئەو ژیانەیە تێدا دەژی. پێویستە بیر لە چۆنیەتی ژیان نەک درێژەپێدان بە ژیان بکرێتەوە. ئەمەش بە ڕێگەی هێزەوە یان دەستەڵاتی مرۆڤەوە بە ئەنجام دەدرێت. ویستی مرۆڤ بە پێچەوانەی تێگەیشتنەکەی شۆپنهاوەرەوە، ویستی هێزە. "لە هەر شوێنێک ژیان هەبێت ویستی هێزیش دەدۆزرێتەوە، تەنانەت ئەوانەی داگیریش کراون و چەوساوەن دەیانەوێ ببن بە فەرمانبەر."[40] ئەم ویستە بنەڕەتێکی

---

40- Friedrich Nietzsche. “Beyond Good and Evil”, in *Basic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, p. 211.

میتافیزیکی بوونی مرۆڤە و لە نێو ئەو بوونەدا بووە بە هێزی جوڵان و ڕەخسانی گۆڕانکارییەکان و داهاتووی مرۆڤ دیاری دەکات. لە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، کە مەبەستی ژیان بەردەوامی نیە، بەڵکو بەرزێتییە و چۆنیەتی نەک چەندەکی ژیان گرنگە. ویستی هێز ئەو چۆنیەتییە بەسەر بووندا فەرز دەکات و مرۆڤ بە بەردەوامی لە ڕێگەی هێزەوە هەوڵی ژیانێکی باشتر و بەرزتر دەدات و خۆی بە پرۆژەکانی داهاتووی دەگەیەنێت. ئەم هەوڵدانەش تێکۆشانێکی نەبڕاوە و ئۆقرە نەگرە و دەستەڵاتێکی دەرەکی مەحکومی ناکات و بەهای بە سەردا ناسەپێنێ. مرۆڤ لەم ڕەوتە ئۆقرە نەگرەیدا بەرەو بەرزێتی ئازادانە هەڵسوکەوت دەکات و بڕیار لە سەر ڕەوتەکەی دەدات. بێگومان ئەمەش جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان میتافیزیکی نیتشە و شوپنهاوەری مامۆستایدا دەردەخات. بۆ نیتشە مرۆڤ ئازادە و (ویستی هێز)ی بە دەستەڵاتێکی لە خۆی بەرزترەوە گرێنەدراوە. ئەوەی مرۆڤ مەحکوم دەکات ویستی هێزی خۆیەتی، کە هەندێک جار لە ئاستی ویستەکانی دیکەدا بە زەبوونی ڕادەوەستێت و بوونی داگیردەکرێت. ئازادی و دۆڕاندنی ئازادی لە هەڵبژاردنی مرۆڤدایە. مرۆڤ خۆی بڕیار لە سەر بوون بە کۆیلە یان ئازادییەکەی خۆی دەدات. شۆپنهاوەر لە بەشی دووەمی شاکارە فەلسەفییەکەیدا (جیهان وەکو ویست و بیر)، کە لە ساڵی ١٨١٨ لە چاپدراوە ڕاڕەوێکی ناچارەکی لە ئاستی مرۆڤدا دامەزراندووە، کە بە دیدی من لەگەڵ شێوازی بیرکردنەوەی میتافیزیکی خۆیدا ناکۆکە. بۆ شۆپنهاوەر ویستی تاک هەمیشە ویستە بۆ شتێک یان بابەتێکی دەرەکی. ئەو بابەتەش ویست ناچار دەکات. ئەگەر تاک بیەوێت ویستی داگیر نەکرێت و بابەتی ویستی ناچاری نەکات ئەوا دەبێت ویستی (هیچ) ی نەبێت و ویستی خۆی لەناو ویستی هەمەکی و

گشتگردا ون بکات. بەم جۆرە تاکو مرۆڤ واز لە حەز و ویستی بۆ ئەم شتە و ئەو شتە نەهێنێت ناتوانێت سەربەست بێت.[41]
سەربەستی ویستی تاکە کەس لەوێدا مسۆگەر دەکرێت، کە ئەو ویستە هەندەکییە لەگەڵ ویستی هەمەکی یان سەرچاوەی بوونیدا یەک بگرن و ببن بە یەک بوون. حەزدەکەم لێرەدا بگەڕێمەوە بۆ چارەسەرکردنی تراجیدیا لە لای نیتشە کە لە پێشتر باسمان کرد. ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، کە بە بۆچوونی نیتشە تاک بوونێکی بڕاوە و کاتی هەیە یان بوونی تراجیدییە چونکە دەمرێت. بەڵام، وەکو بەشێک لە مرۆڤایەتی هەموو تاکێک نەمرە، چونکە مرۆڤایەتی نەمرە. بڕانەوەی بوونی هەندەکی نەبڕاوەیی بوونە هەمەکیەکە دیاری دەکات و لەم بۆچوونە ئۆنتۆلۆجییەوە دەتوانین بگەینە ئەو باوەڕەی، کە بوونی تاکیش نەبڕاوەیە. ئەم بۆچوونەی نیتشە لە پەڕتووکی (لە دایکبوونی تراجیدیا) پەیوەندییەکی بنەڕەتی بەم بۆچوونەی شۆپنهاوەرەوە هەیە.[42] بە بیروڕای من کێشەی سەربەستی تاک لە فەلسەفەی شۆپنهاوەردا دوو جۆر ڕاڤەی بۆ دەکرێت. لە لایەکەوە ڕاڤەیەکی ناچارەکی و لە لاکەی دیکەوە دەتوانرێت سەربەستی تاک مسۆگەر بکرێت. ئەمەش خەسڵەتێکە لە نێو هەموو شێوەکانی ئۆنتۆلۆجی یەکانەگی (مۆنیزم)دا، وەکو ئۆنتۆلۆجی هیگڵ و فیختەشدا دەبینیرێت.[43] دروستە ویست وابەستە بە بابەتی ویستراوەوە و ئەو

41- Arthur Schopenhauer. *The World as Will and Idea*, vol. 1, p. 106.

42 بڕوانە: Friedrich Nietzsche. The Birth of Tragedy,

43 سپینۆزا لە پێش هیگڵ و فیختەدا لە سەر کێشەی ئۆنتۆلۆجیی یەکانەگی بە ناوی یەکانەگی بوون (پانتیزم)وە دواوە.

بڕوانە: Bnedict Spinoza. *Ethics*, translated by Andrew Royle, London: Everymans Library, 1970. Pp. 2-4.

بابەتە ویست ناچار دەکات. ئەم ڕاڤە کردنەش یان لێکدانەوەی پەیوەندی نێوان ویست ویستراو دەمانگەیەنێتە ئەو ئاکامەی، کە بۆ مسۆگەرکردنی سەربەستی، ویست بابەتە ویستراوەکەی ڕەتبدەینەوە و باشتر وایە ویست حەز لە هیچ بابەتێکی دەرەکی نەکات و حەز و ئارەزووی نەبێت. لە لاکەی دیکەوە، لە سیستەمی ئۆنتۆلۆجیی شۆپنهاوەردا بابەتی دەرەکی بوونێکی سەربەخۆی نیە و بێگانە نیە و دیاردەی ویستە. ئەوەی هەیە ویست و دیاردەی ویستە. هیچ ڕاستەقینەیەکی دوور لە ویست و دیاردەی ویستەوە نیە تاکو، وەکو دەستەڵاتێکی دەرەکی و نەناسراو بەسەر ویستدا زاڵ بێت و داگیری بکات. لەبەر ئەمە پەیوەندی نێوان ویست و بابەتی ویستراو پەیوەندی ویستە لەگەڵ خۆیدا، چونکە بابەتەکە دیاردەی ویستە. داگیرکردنی ویستیش لە لایەن بابەتە ویستراوەکەوە خۆ- داگیرکردنە. بەم جۆرە، لەم ڕوانگەیەوە دەبینین ویست خۆی داگیرکردووە و لەبەر ئەمە سەربەخۆ و سەربەستە.

نیتشە نایەوێت، وەکو شۆپنهاوەر بنەڕەتێکی مێتافیزیکی لە پێشتر دامەزرێنێت. هاوکات، لە هەندێ شوێندا لە نووسراوەکانیدا بەو شێوەیەی لەمەڕ ویستی هێزەوە دەنووسێت وا هەست دەکرێت، کە ویستی هێز بووە بەو بنەڕەتە یان ناوەڕۆکە مێتافیزیکییەی بوون. بۆ نموونە دەڵێت، "ویستی هێز لە نێو هەموو گۆڕانەکاندایە"،[44] یان "بناخە و خەسڵەتی هەموو گۆڕانێکە." [45] جیهان ویستی هێزە و چی دیکە نیە.[46] کەوابوو، ویستی هێز بە تەنیا خەسڵەتی بوونێکی ئاگامەند نیە و لە نێو هەبووەکانیشدا هەیە. ئەو هێزەیە لە نێو

44- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 155

45- هەمان سەرچاوە لاپەڕە٣٦٥.

46- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٥٥٥.

سروشتیشداو لە خۆ دەرخستنیدا دەبێت بە (زەبر).[47] دەشێ مانەوەی من لە ژوورەوە دوو هۆی هەبێت. لە لایەکەوە، بابڵێین کەسێک لە من بە هێزتر بووە بە ڕێگر و (هێز)ی خۆی بۆ مانەوەی من و نەچوونە دەرەوەم لە ژوورەکەدا خستۆتە گەڕ. من و ئەو کەسە، لێرەدا لە نێو کایەی هێزداین، کە هەر یەکێک لە ئێمە بۆ سەپاندنی هێزەکەی و داگیرکردنی ئەویدی بە کاری دەهێنێت. ویستی ئەو کەسە بەرانبەر من ویستی سەقامگیرکردنی هێزێتی بە سەر مندا یان من بەسەر ئەودا. تاکە بە ئاگاکان بەردەوام ماندووی ئەم کایەیەن؛ کایەی هێز یان کایەی داگیرکردنی یەکدی لە شێوازی جەستەیی و ئایدیۆلۆجی و سایکۆلۆجی و سێکسی و ئابوورییدا. پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان وابەستن بە شێوازی کایەی هێزەوە و حوکمیان بە سەردا دەدات. تاکەکان ناتوانن واز لە کایەکە بهێنن. ژیان لە بنەڕەتەوە ئەو ویستە و ئەو کایەیە. هۆی دووەمی مانەوەی من لە ژوورە کەمدا دەگونجێ سروشتی بێت. لەوانەیە لەبەر ئەوەی باران دەبارێت نەتوانم بچمە دەرەوە. ئەم ڕێگرتنە لەوەی پێشو جیاوازە. من بەرانبەر کەسێکی دیکە لە نێو کایەی هێزدا ڕانەوەستاوم. کەسێکی دیکەی ئاگامەند ڕێگەی نەگرتووم. سروشت دژی چوونە دەرەوەی من هێزی خۆی بەکار هێناوە و ئەو هێزە بە (زەبر) ناوزەد دەکەین، تاکو لە هێزی بوونە ئاگامەندەکەی جیابکەینەوە. زەبر هێزێکی شاراوەی سروشتە. کاتێک خۆی دەردەخات و لە نێو ئەزموونی بوونە ئاگامەندەکە دەبێت بە دیاردەیەکی ناسراو. هێزە شاراوەکە لە خۆ فەرز کردنەکەیدا

---

47- زاراوەی (هێز)م بۆ power و (زەبر) بۆ force داناوە. بێگومان لێکچوون و جیاوازی فرە لە نێوان واتا و شێوەی بەکارهێنانی ئەم دوو زاراوەیەدا هەیە. بەڵام بۆ ئەوەی ویستی بوونێکی ئاگامەند و هەبوویەکی لە ئاگابەدەر لە یەکدی جیابکەینەوە، بە باشتری دەزانم (هێز) بۆ بوونە ئاگامەندەکە بەکاربهێنم.

دەبێت بە ڕێگر. ئەگەر من پرۆژەی چوونە دەرەوەم نەبێت، باران بارین لە ئاستی مندا نابێت بە ڕێگر. درێژی و کورتی سەفەر لە کاتی گەڕانەوەدا خۆی دەکات بە دیاردەیەکی زەق و زەبراوی. تاکو بە سەر چیایەکی بەرزدا هەڵنەگەڕێین هەست بە سەختی هەڵگەڕان ناکەین و نازانین تاکو چی ڕادەیەک چیاکە زەبری خۆی بە سەرماندا دەسەپێنێ. پەیوەندی نێوان تاکەکان بە پێچەوانەی خۆ دەرخستنی زەبری سروشت لە ئەزموونێکدا، بە بەردەوامی لە نێو کایەکانی هێزدا لە زۆرانبازییدایە. با بزانین جیاوازی لە نێوان بۆچوونە مێتافیزییەکانی شۆپنهاوەر و نیتشەدا چییە ئەگەر نیتشەش ویستی هێز بە ناوەڕۆکی هەموو شتێک دابنێت؟ ئێمە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ جیاوازی نێوان بۆچوونی مێتافیزیکی شۆپنهاوەر و نیتشە لەو خاڵەدا کرد، کە ویست بۆ شۆپنهاوەر ویستی ژیان و بۆ نیتشە ویستی هێزە و یەکەمیان هەمەکی و دووەمیان هەندەکییە. بەڵام نیتشە چەند جارێک لە نووسراوەکانیدا هەوڵیداوە ویستی هێز لە نێو هەموو شتێکدا (وەکو بوونی ئاگامەند و سروشت) ببینێ و ئەو ویستە بە بنەڕەتێکی مێتافیزیکی دابنێ. بێگومان ئەمەش کێشەیەکی ناکۆکە و نیتشە نەیتوانیوە خۆی لێ دەرباز بکات. بە بیروڕای من، شۆپنهاوەر و نیتشە لە سەر کێشەی هەمەکی ویست هاوڕان، بەڵام میتۆدی گەیشتنیان بەو ئاکامە جیاوازە. لە سەرەتاوە شۆپنهاوەر هەوڵیداوە لە واتای بنەڕەتی بوون بکۆڵێتەوە و بنەڕەتێک، کە بوونی هەموو شتێکی لە سەر ڕادەوەستێت بدۆزێتەوە. لە بەر ڕۆشنایی ئەو بنەڕەتە یان پرنسیپاڵە هەمەکییەدا چییەتی هەبووە هەندەکییەکانیش ڕووندەکاتەوە و بوونیان بە دیاردەی ویستە هەمەکییەکە دادەنێت. لای نیتشە گەیشتن بەو پرنسیپاڵە لە ڕێگەیەکی دیکەوە دەست پێدەکات و لە بەر ڕۆشنایی

ئەزموونەکانی ڕۆژانەیدا و زانینەکانی بە ڕێگەی ئەزموونەوە دەگاتە ئەو باوەڕەی بوون و هەبووە هەندەکیەکان ویستی سەقامگیرکردنی هێز و زەبری خۆیان هەبێت. لەم زانینە ئەزمونگەرییەوە ئەو خاڵە دەسەلمێنرێت، کە هیچ شتێک بە بێ ئەم ویستە نیە و ویستی هێز حوکم بە سەر هەموو شتێکدا دەکات، "پرۆسەی ئۆرگانی و ژیانی ئاژەڵەکان و ئێمە و چالاکییەکانی بیرکردنەوەمان لە بەر ڕۆشنایی ئەم پرنسیپاڵەدا دەناسرێن."[48] لەم بۆچوونەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە ویستی هێز یەکانەیەکی هەمەکییە، چونکە دەستەڵاتێکی لە بن نەهاتووی هەموو شتێکە و لە نێویاندا حوکم بە سەر بوونیاندا دەکات. بەڵام ئایا ئەزموونەکانی مرۆڤ ویستی هەمەکی دەناسن؟ ئایا ئەو ویستە دەکەوێتە بەر ڕۆشنایی زانینی ئەزموونەکان یان ئاکامێکی لۆجیکمەندانەیە؟ بێگومان، ویستی هەمەکی ئەگەر بنەڕەتی هەبووەکانی نێو داکەوتی دەرەوەی بیرکردنەوە و جیهانی ناوەوەی بیرکردنەوەش بێت بە ڕێگەی خۆ دەرخستنی بۆ ئەزموونەکانی مرۆڤ دەناسرێت.

باران بارین لە ئەزموونی مندا و بۆ من (وەکو دیاردەیەک) بوو بە ڕێگر لە ئاستی پرۆژەی چوونە دەرەوەمدا. بە گوێرەی بۆچوونەکەی نیتشە، ئەو ڕێگرە دیاردەی ویستی هەمەکییە لە ڕووداوێکی هەندەکییدا خۆی دەردەخات و زەبری خۆی بە سەر مندا دەسەپێنێت. ئەزموونەکان لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەیان لە ویستی هێز، ویستە هەمەکییە (گشتگر)ە کە ناناسن. ئەوەی دەناسرێت و زانینی لە بارەوە پەیدادەکرێت ئەم ویستە یان ئەو ویستە هەندەکییە یە لە

48 - Friedrich Nietzsche. “Beyond Good and Evil”, in *Basic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, p. 238.

جیهاندا. بەڵام نیتشە لەو باوەڕەدایە، کە مادامەکی ویستیهێز لە نێو هەموو شتێکدا هەیە و ڕاستەقینەی هەموو شتێکی هەبووە، ئەوا پێویستە بە ویستێکی هەمەکی دابنرێت. هاوکات ویستی هەمەکی لە ڕێگەی خۆ دەرخستنی ویستێکی هەندەکییەوە دەناسرێت. ئەوەی دەناسرێت و ئەزموونەکان پێیدەگەن ویستی هەندەکییە، کە لە سەرچاوەیەکی هەمەکییەوە هەڵقوڵاوە. ئەم خاڵەش بە دوو جۆر لێکدەدرێتەوە: لە لایەکەوە گەڕانەوەی نیتشە بەرەو سیستەمێکی مێتافیزیکی، کە لە پێشتر دژاوی بەرانبەری دەوەستا دەردەخات و لە لایەکی دیکەشەوە ڕەتکردنی سیستەمە هیچگەرایەتیەکەیە و گەیشتنە بە قۆناخێکی نوێی بیرکردنەوە، کە لە بەرهەمێکی پێشوتردابە (پاش هیچگەرایەتی) ناوزەدمان کردووە.[49]

ویستی هێز لە بوونێکی ئاگامەندا بەستراوە بە (تێگەیشتن)ەوە. هەرچەندە نیتشە ئاماژەی بۆ ئەم پەیوەندییەی نێوان ئاگامەندی و ویستی هێز نەکردووە. بەڵام بە بیروڕای من پەیوەندییەکی گرنگ و بنەڕەتییە. بوونی ئاگامەندانە بە ئاگاوە ویستی هێزی خۆی دەخاتە گەر و هەوڵی دامەزراندنی دەدات. هەروەها لە پێشتر لە زەبری دیاردەکان، وەکو ڕێگرتن دواین. ئەو زەبرەش لە کاتێکدا یەخەمان دەگرێت و سەربەستییەکەمان تەلبەند دەکات، کە ئێمە لە چییەتی و چونیەتی دیاردەیە کە تێبگەین و وەکو ڕێگر بیناسین. ئەگەر من ئاگامەند نەبم و زەبری باران بارین نەناسمەوە ڕێگرانە لە ئەزموونی مندا خۆی دەرناخات. با باران بە بەردەوامی ڕێژنە بکات و قوڕ و لیتەی چیاکانیش بەرەو دۆڵەکان ڕامالێت، بۆ هەبووە لە ئاگا

49 - بڕوانە: محەمەد کەمال. بوون و داهێنان، دەستگای سەردەم. ٢٠٠٤ لاپەڕە ١٧١.

بەدەرەکان نابێت بە ڕێگر. لێرەدا من نامەوێ ڕاڤەیەکی خۆگەرانە بە دیاردە دەرکییەکان بدەم. من هەبم یان نەبم باران دەبارێت، بەڵام باران بارین لە ئەزموونی ئاگامەندانەی مندا واتایەکی جیاوازی هەیە.

ویستی هێز پێویستی بە ناسینەوە هەیە بۆیە خۆی دەردەخات. ناسینەوەش جۆرێکە لە پێدانی بڕوانامە بەو هێزە. کەسێکی خاوەن دەستەڵات داوای بڕوانامە لە کە کەسێکی دیکە دەکات، کە هێزی خۆی بە سەریدا دەسەپێنێت و خۆی لە گەڵیدا دەخاتە نێو کایەکانی هێزەوە. ویستی هێز لە بوونێکی ئاگامەندا بۆ سەقامگیر کردنی هێزەکە ڕەوتێکی ئاگامەندانەیە. بوونی ئاگامەند هەمیشە ئاگایە لەوەی هەڵی دەبژێرێت و لە ویستی هێزی خۆی و دەرخستنی ئەو هێزەش بۆ مەبەستێکی دیاریکراو و زانراو تێدەگات. ناگونجێت بوونی ئاگامەند بە بێ تێگەیشتن لە ویستی هێز و مەبەست لە دەرخستنی ئەو هێزە لە نێو کایەکاندا ببێت بە کایەزان. ئەو بە ئاگاوە کایە دەکات و ناتوانێت ئاکامی کایەکانی بۆ سەرچاوەیەکی دیکەی بێجگە لە ویست و هەڵبژاردنی ئاگامەندانەی خۆی بگەڕێنیتەوە. سترەکچەرێکی ناچارانە و ژوور لە ویستی خۆی بکات بە بەرپرسی ئاکامەکان. واتای بوون، بەم شێوەیە، بۆ بوونی ئاگامەند زۆرانبازی نێوان ویستەکانی هێزە لە نێو کایەکانی هێزدا بە بەردەوامی دوو لایەنی نایەکسان و بێ هاوتەراز دەهێنێتە کایەوە. لایەنێک لە لایەنەکەی دیکە بە هێزتر خۆی دەردەخات و هێزی خۆی بە سەر ئەوی دیدا دەسەپێنێت و ناچاری دەکات. لە ئاکامی ئەم کایەیەدا، لە مێژوودا دوو لایەنە نایەکسانەکانی، وەکو کۆیلە و خاوەن کۆیلە، چینی چەوساوە و چەوسێنەر، ژن و پیاو...هتد بوون بە بنەمای ناکۆکیەکان و زۆرانباری نێوانیان بە

بەردەوامی گۆرانکارییە کۆمەڵایەتییەکانی خستۆتە گەڕ. نیتشە ئەم زۆرانبازییە بە بزاڤێکی مێژوویی گرنگ دادەنێت و لەو باوەڕەشدایە، کە بزاڤێکی گرنگە، نەک لە پێناوی مانەوە و پاراستنی بەهاو پەیوەندییە کۆن و ناپێویستەکاندا بەڵکو بۆ ڕەتکردنی قۆناخە مێژووییەکە و گەیشتن بە قۆناخێکی پێشکەوتووترە.[50] هەروەها گۆڕانکارییەکان (نەبوونی) و(کەمی) بابەتەکانی ویست پەیدایان ناکات. خۆ گەیاندن بە شێوازێکی باشتر و گونجاوتر بۆ ویستی هێز حوکم بە سەر گۆڕانەکەدا دەدات. بۆ نموونە سەردەمی بەردینە لە بەر ئەوە کۆتایی پێنەهات، کە بەرد نەما مرۆڤ بەکاریبهێنێت. ویستی هێز ئاگامەندانە هەوڵیدا ئەو سەردەمە ڕەت بکات و خۆی بە قۆناخێکی باشتر بگەیەنێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە هێز داردەست و(وەسیلە) یە بۆ گەیشتن بەو قۆناخە. نیتشە بە بێ گۆڕانکاری لەم بۆچوونەیدا هێز بە کۆتایی نەک داردەست، بە مەبەست نەک ڕێگە دادەنێت. هەموو گۆڕانکارییەکان، کە ویستی هێز پەیدایان دەکات لە پێناوی سەقامگیر کردنی هێزدایە.[51]

بزاڤی ویستی هێز دوو خەسڵەتی هەیە: یەکەم بزاڤ و جوڵانێکی بەردەوام. دووەم بەردەوامییەکەی بۆ پاراستن و پارێزگاری مانەوەی ژیان نیە. چۆنیەتی نەک چەندەکی لەم بزاڤەدا گرنگە. گۆڕانکارییەکانی ژیان دەبێت بەرەو پێشەوە چوونێکی بەردەوام و پەرەسەندنی ویستی هێزبێت. هەوڵدانی ویستی هێز بۆ مانەوە نیە، بەڵکو بۆ پەرەسەندن و گۆڕانکاری چۆنیەتی ژیانە. گۆڕانکارییەک، کە تێیدا قۆناخێکی نوێ لە قۆناخێکی پێشتری باشتر و پەرەسەندووترە.

50 - Friedrich Nietzsche. *The Gay Science*, p. 292.
51 - Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 338.

ئەمڕۆ لە دوێنێ و سبەینێ لە ئەمڕۆ گەشاوەترە. ئەم جۆرە گۆڕانکارییە هەمیشەییەش لە پێشتر لە لایەن هیراکلیدس و هیگڵ و مارکسەوە باسکراوە. تەنانەت سەدرەدینی شیرازی (مەلاسەدرا) لە ئۆنتۆلۆجیە بوونخوازییەکەیدا لەمەڕ ئەم جۆرە گۆڕانکارییە دواوە و بە پێچەوانەی ئەریستۆوە، کە گۆڕانی لە نێو چوار کاتیگۆریدا دەبینی و ناوەڕۆکی بە نەگۆڕ دادەنا، مەلاسەدرا لەو باوەڕەدایە ناوەڕۆکیش لە گۆڕانێکی بەردەوامدایە و هیچ هەبوویەک چی لە ناوەڕۆک و چی لە فۆڕمدا وەکو خۆی نامێنێتەوە.[52] بە بۆچوونی من، گۆڕانکاری لە ئۆنتۆلۆجی نیتشەدا هەمان شێواز و ڕەوتی هەیە چونکە نیتشە باوەڕی بە ناوەڕۆکێکی نەگۆڕی مێتافیزیکی لە بووندا نیە و ویستی هێزیش، کە بووە بە بنەما و یەکانەیەکی ئۆنتۆلۆجی بەردەوام لە پەرەسەندن و گۆڕاندایە. شتێک نیە وەکو خۆی بمێنێتەوە و ناسنامەیەکی نەگۆر و چەسپاوی هەبێت یان نەکەوێتە بەر کاریگەرێتی گۆڕانکارییەوە. هەروەها گۆڕانکارییەکان هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرنەوە. هەبووەکان، ئەوانەی ئاگامەندیش نین لە گەشەکردن و پەرەسەندان. بەم جۆرە بوون بە هەر دوو شێوەکەی (سروشت و مێژوو) لە گۆڕانکارییەکی ژوورکێشیدا خۆی دەردەخات. لە نێو ئەم گۆڕانکارییەدا لە هەموویان زیاتر بە پەرۆشەوە و ئۆقرە نەگرانە خولیای پەرەسەندنی هەبێت و هەوڵبدات ویستی هێزی خۆی بە قۆناخێک بگەیەنێت، کە تێدا باڵا دەست و بەرز و خۆبژێو بێت بوونە ئاگامەندەکەیە.

---

52 - بڕوانە: صدرالدین الشیرازی، الحکمة المتعالیة فی الاسفار العقلیة الاربعة، دار احیاء التراث العربی، بیروت، ١٩٧٣. الجزء الثالث، ص ١٠١- ١٠٥. مەلا سەدرا ئەم گۆڕانکارییە بە (الحرکة الجوهریة) ناوزەد دەکات و منیش لە پەرتووکەکەمدا *Mulla Sadra's Transcendent Philosophy* ، کە لە لەندن لە لایەن دەزگای Ashgate لە چاپ دراوە باسم کردووە.

# گەڕانەوەی هەمیشەیی

کێشەی گۆڕانکاری و پەرەسەندنی بەردەوام بەرەو ئەو پرسیارانە پەلمان ڕادەکێشێت، ئایا پەرەسەندن کۆتایی دێت؟ چی ڕەوتێکی هەیە، بازنەیی یان لە سەر هێڵێکی ژوورکێش دەڕوات؟ بڕاوەیە یان نەبڕاوە؟ ئایا ئەم پەرەسەندنە سەدەمێکی هۆشەکی پاڵپشتێتی یان ڕووداوێکی ڕسکاوە؟ من نامەوێ جارێکی دیکە لەمەڕ کێشەی سەدەمی هۆشەکی بدوێم چونکە لە پێشتر باسمان لێکردووە و هەڵوێستی نیتشەمان ڕوونکردۆتەوە. ئەوەی لێرەدا گرنگە بزانرێت بۆ چوونی نیتشەیە لە ئاستی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان سەبارەت بە چۆنیەتی پەرەسەندن لە بووندا.

نیتشە لەو باوەڕەدایە پەرەسەندنی بوون لە نێو خولی بازنەییدا دەسوڕێتەوە و گەڕانەوەی هەمیشەیی حوکمی بە سەردا دەکات. مەبەست لە گەرانەوەی هەمیشەیی ئەوەیە، کە بوونێک جارێکی دیکە، وەکو خۆی پاش لە ناوچوونی دەگەڕێتەوە بۆ ژیان و نێو ڕووداوەکان. گەڕانەوەکەشی هەمیشەییە. بە بەردەوامی ئەو بوونە پەیدادەبێت و لە ناو دەچێت و جارێکی دیکە بۆ ژیان دەگەڕێتەوە. ئەوەی ڕاستی بێت، لە سەرەتای خوێندنەوەم و هەوڵدانم نەمتوانی لەم کێشەیە تێبگەم، ئێستاش بەڵگەکانی نیتشە نەیانگەیاندوومەتە کەناری باوەڕهێنان بەم کێشەیە. ناکۆکیم لەگەڵ ئەم کێشەیەدا لەوێدا سەر هەڵنادات، کە نەزانم گەڕانەوەی بوونێک پاش لە ناوچوونی چۆن ڕوودەدات. بۆ نموونە تەماشای دەوروبەرم دەکەم دەبینم درەختە ڕووت و ڕەنگ زەردەکانی زستان هەموو بەهارێک سەوز دەبنەوە.

چەند خانەیەکی مردووی پێست جارێکی دیکە دروست دەبنەوە. بەڵام نەمدەزانی چۆن ئەم نموونە و ڕووداوە هەندەکییانە بکەم بەڕوانینێکی فەلسەفی و بوونی هەمەکی و گشتگری تێدا ببینم. دامەزراندنی ڕوانینێکی فەلسەفی لە ڕوانگەی ڕووداوە هەندەکییەکانەوە گونجاوە، بەڵام بەستنەوەی ڕووداوەکان بە بوونەوە و خوێندنەوەی گۆڕانکاری بوون لە بەر ڕۆشنایی ئەم ڕووداوانەدا بۆ من دژوارە. ئەم دژوارییەش بۆ چەند لایەنێک، کە پەیوەندیان بە بۆچوونی فەلسەفیمەوە هەیە دەگەڕێنەوە: منیش، وەکو نیتشە سیستەمی مێتافیزیکی ڕووناکبیر ڕەتدەکەمەوە و بوون و گۆڕانکارییەکانی بە پلان و مەبەستێکی لە پێشتر دانراو یان بڕیار دراوەوە گرێ نادەم. هەروەها بیرۆکەی گەڕانەوەی هەمیشەیی، بە پێچەوانەی گەڕانەوەی هەبووە هەندەکییەکانەوە (بۆ نموونە سەوزبوونەوەی درەخت لە بەهارێکدا) بیرۆکەیەکی ئەفسانەوی و میتۆلۆجیە. لەو ساتەوە بوون پەیدابووە گەڕانەوەی سەردەمەکانمان نەبینیوە. بە بیروڕای من، لەگەڵ دامەزراندنی مێتافیزیکی هیچگەرایەتیدا، کە هەموو مەبەست و پلانێکی لە پێشتر دانراو بۆ بوون هەڵدەوەشێنێتەوە نەدەبوو نیتشە ئەم کێشەیەی زیندوو بکردایەوە. بێجگە لەمەش گەڕانەوەی هەمیشەیی لەگەڵ بەردەوامی پەرەسەندندا لە نێو بووندا ناکۆکە. پەرەسەندنی بەردەوام ڕێگری سەرهەڵدانەوەی هەمان بوون و ڕووداوە بە بێ جیاوازی. ناسنامەی نەگۆڕ خەسڵەتی هیچ بوونێک لە نێو مێتافیزیکی هیچگەرایەتی و پەرەسەندنێکی بەردەوامیدا نیە. ناسنامەی نەگۆڕ یان (وەکو خۆیی) لە نێو سیستەمی مێتافیزیکی ڕووناکبیردا جێگەی دەبێتەوە و ئەو بیرۆکەیە لە بۆچوونەکانی ئەفلاتونەوە سەریهەڵداوە و سەقامگیربووە. لە جیهانی بەرزی مێتافیزیکی ئەفلاتوندا فۆرمە هەمەکییەکان خاوەنی ناسنامەی نەگۆڕن

و لە کاریگەریّتی گۆڕانکارییەکانەوە دوورن. ئێمە تەنیا لە پەیڕەوی کردنی ئەم شێوە مێتافیزیکییەدا دەتوانین کێشەی سەرهەڵدانەوەی هەمان شت و هەمان ڕووداو بە بێ جیاوازی باس بکەین.

لە سەردەمی یۆنانییەکانەوە بیریارانی، وەکو ئەنەکسامەندەر و ئیمپادۆکلیس و هیراکلیدس و شاگردەکانی پیتاگۆراس لەمەڕ کێشەی گەڕانەوەی هەمیشەیی دواون و لەسیستەمی فەلسەفەکەیاندا دایانناوە. سوکراتیش لەو باوەڕەدابووە پاش مردنی جارێکی دیکە بۆ ناو هاوڕێکانی و بۆ هەمان شوێن لە سەردەمێکی جیاوازتردا دەگەڕێتەوە. حەز دەکەم ئەو خاڵەش ڕوونبکەمەوە، کە گەڕانەوەی هەمیشەیی لە ڕاڕەوی لاشە گۆڕکێ جیادەکاتەوە. لاشە گۆڕکێ سەرهەڵدان و گەڕانەوەی هەمان بوون لە هەمان شێوە و ناوەڕۆکدا نیە. گەڕانەوەی گیانە لە لاشەیەکی جیاوازدا. گوایە لە کاتی مەرگدا گیان لە لاشەکەی دەردەچێت و دەخزێتە نێو لاشەیەکی دیکەوە. تاکو گیان خۆی لە گوناهەکان پاکنەکاتەوە لە نێو خولی لاشە گۆڕکێدا دەمێنێتەوە. گەڕانەوەی هەمیشەیی بە ڕەوتێکی گشتگری بوون دادەنرێت و بە تەنیا (گیان) لە نێویدا ناسوڕێتەوە. بوون بە گشتی و بە هەمان شێوە و ناوەڕۆکەوە بە بەردەوامی دەڕوخێت و دروست دەبێتەوە یان سەرهەڵدەداتەوە. بۆ نموونە، من و هەموو کەسان و کەلوپەلەکانی دەوروبەرم لەم قاوەخانەیەدا پاش لەناوچوونمان لە سەردەمێکی دیکەدا بۆ قاوەخانەکە دەگەڕێینەوە، منیش وەکو ئێستا بە هەمان شێوە لە سەر کێشەی گەڕانەوەی هەمیشەیی دەنووسم.
نیتشە لە دوا بەرهەمیدا گەڕانەوەی هەمیشەیی بە کێشەیەکی هەرە گرنگی بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی داناوە و خۆشی بە یەکێک لەو بیریارانە دادەنێت، کە بوە بە پێشەنگی کاروانی ئەوانەی باوەڕیان

بەم گەڕانەوەیە هەیە.[53] پێش ئەوەی باس لەوە بکرێت بۆچی نیتشە گەڕانەوەی هەمیشەیی بە کێشەیەکی هەرە گرنگی فەلسەفەکەی دادەنێت، پێویستە بزانین لە کوێوە نیتشە ئەم بیرۆکەیەی وەرگرتوە و بەڵگەکانیشی بۆ دامەزراندنی ئەم بیرۆکەیە بتوێژینەوە. لە یەکێک لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی نیتشە لەمەڕ فەلسەفە بە ناوی (فەلسەفە لە سەردەمی تراجیدی یۆناندا) ئاماژەی بۆ گەڕانەوەی هەمیشەیی کردووە و بە شابیرێکی فەلسەفەی هیراکلیدسی دادەنێت. لە دوو بەرهەمی دیکەشدا (زانستی شادیهێن)[54] و (زەردەشت وای گوت) زیاتر جەختی لە سەر کردووە و خۆی بە یەکێک لە شوێنکەوتووانی گەڕانەوەی هەمیشەیی داناوە. کارڵ یاسپەرزیش گەڕانەوەی هەمیشەیی بە یەکێک لە کۆڵەکەکانی بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشە دەژمێرێت. لەو باوەڕەدایە نیتشە لە بەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانی سەبارەت گۆڕانکاریی بەردەوام و نەبڕانەوەی کات بەم باوەڕە گەیشتوە.[55] هەر چەندە گەڕانەوەی هەمیشەیی لەگەڵ گۆڕانکاری و پەرەسەندنی بەردەوامدا ناکۆکە، بە بیروڕای من دوو هۆکاری هاندەر هەن نیتشەیان بەم باوەڕە گەیاندبێت. لە پێشتر لەوە دواین، کە مردنی خوا هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی مێتافیزیکی ڕووناکبین و سێبەرەکانی خوایە. بە گوێرەی مێتافیزیکی ڕووناکبین گۆڕانکاریی لە بووندا لە سەر هێڵێکی ڕاست

---

53 - Friedrich Nietzsche. "Ecce Homo", in *Basic Writings of Niet - sche*, translated by Walter Kaufmann, p. 751.

54 - ناوی ئەم بەرهەمە بە زمانی ئەڵمانی Die Frohliche Wissenschaft بە ئینگلیزی کراوە بە The Gay Science وشەی Frohliche واتە شادیهێن، دڵخۆشکەر بە ئینگلیزیش Joyful یان cheerful یان Gay واتای Gay. هاوجنسخواز یان نێربازیش دەبەخشێت. بەڵام حەزدەکەم خوێنەر بزانێت، کە ئەم بەرهەمەی نیتشە پەیوەندی بە هاوجنسخوازییەوە نیە.

55 - Karl Jaspers. Nietzsche: *An Introduction to Understanding of His Philosophical Activity*, p. 354

و بڕاوەدا دەگوزەرێ و لە کاتێکی دیاریکراودا لە سەر نەخشە و پلانە لە پێشترەکانی سەدەمی هۆشەکییدا بۆ مەبەستێکی لە پێشتر پێدراو سەرهەڵدەدات و کۆتایی پێدێت. شوێنکەوتوانی ئەم شێوە مێتافیزیکە و سێبەری خواش لەبەرئەوەی واتای بوون لە کۆتایی بووندا دەبینن، کە مەبەستێکی لە پێشتری بۆ دانراوە، ئەوەندەی بایەخ بەو کۆتایی و بڕانەوەی ژیانە دەدەن ئاوەڕ لە نرخ و چییەتی ژیان نادەنەوە. ئەوان مردنخواز و ژیان نەویستن. بۆ ئەوان کەسێکی مردوو لە زیندوویەک باشترە. بە پێچەوانەی هەڵوێستی مردنخوازییەوە نیتشە ژیان بە نرختر و بەرزتر دادەنێت و بانگەشەی مانەوە و بەردەوامێتی بۆ دەکات و ژیانی خۆشدەوێت. ئەو دەیەوێ بۆ مردن نەژی بەڵکو بۆ ژیان بمرێت. نایەوێت لەگەڵ ڕەتدانەوەی مێتافیزیکی ڕووناکبیندا باوەڕ بە بڕانەوەی ژیان بکات و مردن بە کۆتاییەکی ڕەهای ژیان دابنێت و توێژینەوەیەکی ڕەشبینانەی بۆ بکات. مادامەکی ژیانخوازین ئەوا دەبێت باوەڕمان بە بەردەوامی ژیان هەبێت. هاوکات، دەزانین دەبێت بمرین و ئەم ژیانەی هەمانە کۆتایی دێت. ڕێگە چارەیەک بۆ دوورکەوتنەوە لە نائومێد بوون و زویری و ڕەشبینی پەنا بردنە بەر بیرۆکەی گەڕانەوەی هەمیشەییە. لێرەوە دەگەینە ئەو باوەڕەی، کە ژیان و بوونیش بە گشتی لە کاتێکی گەردوونییدا، وەکو سەوزبوونەوەی درەخت هەموو ساڵێک لە بەهاردا بە بەردەوامی وەکو خۆی لە هەمان شێوە و ناوەڕۆکدا دەگەڕێتەوە. لە بەر ئەمە، مردن کۆتایی ژیان نیە، بەڵکو کۆتایی قۆناخێکی بوون و وەرزێکی تەمەنە. ئێمەس جارێکی دیکە بە هەمان شێوە بۆ ژیان دەگەڕێینەوە. هۆکاری دووەم وابەستە بەو شێوەی گۆڕانکارییەی نیتشە لە فەلسەفەکەیدا ئاماژەی بۆ دەکات. گۆڕانکاری بوون پەرەسەندنێکی بەردەوامە و ڕەوتێکە بەرەو داهاتوویەکی باشتر

و ڕووناکتر. بەردەوامی لەم پەرەسەندنەدا لە کۆتایی بەدەرە و بێ وەستانە. دوا قۆناخێکی دیاریکراو بۆ ئەم پەرەسەندنە دانەنراوە. لەم پێگەیەوە ناتوانرێت بگەینە ئەو ئاکامەی ژیان بڕاوەیە و کۆتایی پێدێت، بەڵکو هەمیشە بەردەوامە و لە پەرەسەندنایە. ئەگەر ژیان تەواویش بێت، ئەو کۆتایی هاتنەی سەرەتای سەرهەڵدانەوەیەکی دیکەیە و لە نێو کاتی گەردوونیدا خۆی چەند بارە دەکاتەوە.

ئایا لە چی ڕوویەکەوە گەڕانەوەی هەمیشەیی لەگەڵ پەرەسەندنی بەردەوامدا ناکۆکە؟ دەشێ گەیشتن بەو ئاکامە ژیان تەواو نەبێت، لە بەر ڕۆشنایی هۆکاری دووەمدا دروست و لۆجیکمەندانە سەرهەڵداتەوە. بەڵام کەموکورتی لە بۆچوونەکەی نیتشەدا لەوێدا دەردەکەوێت، کە دوو بیرۆکەی جیاواز و دژوەستاوی هاوتەراز داناوە و پێکەوە گرێیداون. لە لایەکەوە باوەڕی بە پەرەسەندنێکی بەردەوام هەیە، کە بوون لە نێو گۆڕانکارییەکی پێشکەوتوونخوازیدا دەبینێت و لە لاکەی دیکەوە باوەڕ بە گەڕانەوەی بوون لە هەمان شێوە و ناوەڕۆکدا دەهێنێت. گەڕانەوەی بوونێک لە هەمان شێوە و ناوەڕۆکدا دامەزراندنی ناسنامەیەکی نەگۆڕە بۆ ئەو بوونە. ئەمەش خەسڵەتێک بوو ئەفلاتون لە سیستەمە مێتافیزیکیەکەیدا بە فۆرمە هەمەکییەکانی بەخشیوە و ئەریستۆش لە لۆجیکەکەیدا بە یاسای ناسنامە دایدەنێت. بوونێک، کە لە پەرەسەندنێکی بەردەوامدا بێت و لە هەموو ساتێکدا گۆڕانکاری بە سەردا بێت، وەکو خۆی نامێنێتەوە و هەمان شێوە و ناوەڕۆکی نابێت. پەرەسەندنی بەردەوام ئاسەواری ناسنامە و خەسڵەتی نەگۆڕ دەسڕێتەوە. بۆ نموونە هەموو بەهارێک درەخت سەوز دەبێتەوە، بەڵام ناتوانین بە هەمان درەختی بەهاری ڕابردووی دابنێین. گەڵاکانیشی هەمان گەڵای بەهاری ڕابردوو نین.

ئەگەر باوەڕمان بە پەرەسەندنی بەردەوام هەبێت، ئەوا ئەو درەختە بە درەختەکەی پار یان بەهاری ڕابردوو دانانرێت و گۆڕانکاری بە سەردا دێت و پەرە دەسەندێت. بوونیش لەم پەرەسەندنە بەردەوامییەدا ئەگەر چەند جارێکیش بۆ هەمیشە لە ڕۆیشتن و گەڕانەوە دابێت لە شێوە و ناوەڕۆکی پێشوتردا ناگەڕێتەوە چونکە بە بەردەوامی لە پەرەسەندندایە و پێویستە لە شێوە و ناوەڕۆکێکی باشتردا بگەڕێتەوە. لەو سیستەمە مێتافتزیکییەدا نیتشە پەیڕەوی دەکات، مەحاڵە بوونێک لە سەردەمێکی دیکەدا، تەنانەت لەگەڵ ڕەتببوونی ساتەکان و سەرهەڵدانی گۆڕانکارییەکاندا هەمان بوون بێت و وەکو خۆی بمێنێتەوە. ئەمەش ئاکامێکی لۆجیکمەندانەی باوەڕهێنانە بە پەرەسەندنی بەردەوام. لەبەر ئەمەشە من بیرۆکەی گەڕانەوەی هەمیشەییم بە ناکۆک لەگەڵ گۆڕانکاری و پەرەسەندنی بەردەوام داناوە. ئەم دوو کێشەیە نابێت پێکەوە گرێبدرێن. ئەگەر گەڕانەوەی هەمیشەیی گەڕانەوەی هەمان جۆر بوون، وەکو خۆی بێت بە هەمان شێوە و ناوەڕۆک و چییەتی پێشوترەوە ئەوا ویستی گەڕانەوە لە نێو بوونە ئاگامەندەکاندا، لە لای دوو جۆر کەس سەر هەڵدەدات: لای ئەو کەسانەی ویستی هێزی خۆیان دامەزراندووە و نیتشە گوتەنی (ناشرین)نین و هەروەها لای ئەو کەسە ناشرینانەش، کە دەیانەوێت بوونە ناشرینەکەی خۆیان بگۆڕن و بچنە ڕیزی کەسانی یەکەم یان مرۆڤی بەرزەوە. کەسێک ویستی هێزی خۆی دامەزراندبێت و سەربەستانە و بە بەرزی بژی حەز دەکات لە هەمان شێوەی بووندا بە بەردەوامی بۆ ژیان بگەرێتەوە و نەمرێت. بەڵام کێشەکە لە حاڵەتی کەسی دووەمدا ئاڵۆزە. ئەگەر گەڕانەوەی هەمیشەیی گەڕانەوەی بوون لە هەمان شێوە و ناوەڕۆکدا بێت، گۆڕانکاری لە نێو بوونی کەسە ناشرینەکەدا مسۆگەر نابێت. لەم گۆڕانکارییەدا کەسێک بە

کۆیلەیی بمرێت بە کۆیلەیی جارێکی دیکە لەو خولە گەردوونیەدا بۆ بوون دەگەڕێتەوە. لەم شیکردنەوەیەدا، ویستی گەڕانەوە لەلای کۆیلە و مرۆڤێکی ناشرین پەیدا نابێت و بەڵکو تەنیا مرۆڤی بەرز (سوپەرمان) هەیەتی.[56]

دەبینین گەڕانەوەی هەمیشەیی پەرەسەندنێکی بەردەوامە لە کۆتاییەکەوە بەرەو سەرەتایەکی دیکە و گەڕانەوەی هەمان بوونە. مرۆڤێکی بەرز و مرۆڤێکی کۆیلە لە نێو ئەم خولەیەدا بۆ هەمیشە و بە بەردەوام، وەکو خۆیان بۆ نێو ژیان دەگەڕێنەوە. نە مرۆڤە بەرزەکە لەوە بەرزتر دەبێت و نە بارودۆخی کۆیلایەتیش بۆ کۆیلەکە دەگۆڕێت. چونکە وەکو خۆیان لە سەردەمێکی جیاوازتردا پەیدا دەبنەوە. لە بەر ئەمە، بە بۆچوونی من، بیرۆکەی گەڕانەوەی هەمیشەیی بیرۆکەیەکی ئەفسانەیی (میتۆلۆجیانەیە)و لەگەڵ بیرۆکەی پەرەسەندندا ناکۆکە. لەسەر و ئەم ناکۆکیەشەوە هەر چەندە گەڕانەوەی هەمیشەیی سود بە مرۆڤی بەرز دەگەیەنێت و لە بەرژەوەندی ئەودایە، توشی کێشەی ناچارەکیمان دەکات و بوارەکانی سەربەستی مرۆڤ دەبەستێت.

---

٥٦ - لەم نووسراوەدا زاراوەی (مرۆڤی بەرز)م بۆ (űbermensch) ی ئەڵمانی بەکارهێناوە و بە ئینگلیزیش گۆڕیویانە بۆ (Superman)، (سوپەرمان). من نامەوێ زاراوە ئینگلیزییەکە بەکاربهێنمەوە چون، وەکو وشەیەکی لێکدراو (سوپەر) و (مان) بەشی دووەمی وشەکە (مان- man ) واتای (پیاو) یش دەبەخشێت. مەبەستی نیتشە (سوپەر پیاو) نیە، بەڵکو (سوپەر مرۆڤە)ە. ئەو باسی (پیاو) ناکات، بەڵکو لە سەر (مرۆڤ) دەدوێت.

# مرۆڤی بەرز و ڕەسەنیەتی بوون

لە بیروباوەڕە فەلسەفییەکاندا سنورێکی دیاریکراو لە نێوان دوو جۆر بوونی ئاگامەند کێشراوە و تەفسیری جیاواز بۆ نێوان کۆیلە و خاوەن کۆیلە، چەوسێنەر و چەوساوە، ڕەسەن و ناڕەسەن کراوە. نیتشە یەکێکە لەو بیریارانەی هەوڵیداوە لە بۆچوونی خۆیەوە ئاماژەی دوو جۆر بوونی ئاگامەندمان بۆ بکات و جیاوازییەکانی نێوان مرۆڤی نزم و بەرزی بۆ باسکردوین. ئایا مرۆڤی بەرز کێیە؟ چۆن کەسێک دەتوانێت بڕیار لە سەر بەرزێتی خۆی بدات؟ کێشەی مرۆڤی بەرز لای نیتشە ساڵێک پێش نووسینەوەی (زەردەشت وای گوت) سەریهەڵداوە و سەر هەڵدانەکەشی گۆڕانکارییەکی گرنگی فەلسەفییە لە بیرکردنەوەی ئەم فەیلەسوفەدا. لە ١٤ ی ئابی ساڵی ١٨٨١ نیتشە لە نامەیەکیدا بۆ هێنریش کۆسەلیتس کە بە (پیتەر گەست) ناسراوە لەم گۆڕانکارییە دواوە.[57] پاش ئەم قۆناخە لە بەشی چوارەمی (زەردەشت وای گوت) لە بوونی مرۆڤی بەرز دەکۆڵێتەوە:

لە بەیانیەکی نوێدا ڕاستەقینەی نێو بازاڕ و خەڵک و دەنگی گالیسکەکانم بۆ دەرکەوت.
ئەی مرۆڤی بەرز! فێربە، خەڵکی نێو بازاڕ
باوەڕیان بە مرۆڤی بەرز نیە.
بۆ ئەوان ئێمە، هەموو بەرابەر و یەکسانین.
ئەی مرۆڤی بەرز! بە دیدی ئەوان مرۆڤی بەرز نیە،

57- Vattimo Gianni. *Nietzsche: An Introduction*, p . 89.

لە بەردەم خوادا هەموومان یەکسانین.
بەڵام خوا مردووە،
ئێمە بەرابەر و یەکسان نین.
ئەی مرۆڤی بەرز! لە بازاڕ دوورکەوە.[58]

هەروەها لە هەمان شوێندا لەم نووسراوەیدا دەڵێت،
ئێستا خوا مردووە.
ئەی مرۆڤی بەرز! بوونی خوا مەترسیەکی گەورە
بوو بۆ تۆ.[59]

لێرەدا لە بەر ڕۆشنایی دوو چەمکدا (مردنی خوا) و (لە بازاڕ دوور کەوتنەوە) گەلێک لایەن و خەسڵەتەکانی مرۆڤی بەرزمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. مردنی خوا پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجییە بۆ لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز. ئەم جۆرە بوونە ئاگامەندە ئەو (ئۆدیب)ە یە بە کوشتنی باوکی سەربەستیەکەی خۆی مسۆگەر دەکات. ئەو بۆ سەربەستی و بەرزێتی خۆی دەستەڵاتە باڵاترەکان دەڕوخێنێت و خۆی دەخاتە نێو جەنگی مان و نەمانەوە چونکە بەرزێتی نەک مانەوە بۆ ئەو واتا بە بوونی دەدات. مەبەست لە پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی ئەوەیە، کە بنەڕەتی ئەم بوونە بۆ بکەرێکی لە پێشتری مێتافیزیکی ناگەڕێتەوە و بوونی واتاو مەبەستێکی لە پێشتری پێنەداوە. بوونێکە ڕسکاوە و بە بێ ناوەڕۆک و مەبەست پەیدابووە و خۆی ئەو ناوەڕۆک و مەبەستە بە خۆی دەدات. لەم گۆشە نیگایەوە، ڕوون و ئاشکرایە،

58 - Friedrich Nietzsche. *Thus Spake Zarathustra*, translated by Nicholas Davey, p. 276.

59- هەمان سەرچاوە.

که مرۆڤی بەرز بێبڕوا و خوا نەناسە. خوا، بۆ ئەو، دەستەڵاتێکی دەرەکی داگیرکەرە و تاکو ئەو دەستەڵاتە نەڕوخێت، ناتوانێت لافی سەربەخۆیی و سەءوەءی لێدات و سەربەستانە پڕۆژەکانی بوونی هەڵبژێرێت. بوونی خوا تەنیا دەسەڵاتێکی دەرەکی داگیرکەر نیە. سێبەری خوا و کەلتووری زاڵبوی بازاڕییش جۆرێکە لەو دەستەڵاتەی لە بەردەم ویستی هێزی مرۆڤدا دەبێت بە ڕێگر و بەستەڵێن. پێویستە ڕووخاندنی دەسەڵاتی خوا هاوکات هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەریت و بەها و باوەڕانە بێت، کە پاشماوە و سێبەری ئەو دەستەڵاتەن. مرۆڤی بەرز هەوڵدەدات ڕەگ و ڕیشەی دۆگما و بەها ئاینییەکان بە تەواوی لە نێو زەمینەی بیرکردنەوەیدا هەڵکێشێ و ئاسەواریان بسڕێتەوە. پاش ئەنجامدانی ئەم کارە و هەڵکردنی ئاڵای یاخیبوونێکی ئۆنتۆلۆجیانە دژی ئەو دەستەڵاتە مێتافیزیکییە، مرۆڤی بەرز بۆ دارشتنی بناخەی مێژووی خۆی و داهێنانی ئەو مێژووە دژی نەریت و کەلتووری زاڵبووی بازاڕ ڕادەوەستێت. ئەو کەلتوورەی نیتشە گوتەنی هەموو مرۆڤەکان بە ژمارە دادەنێت و ڕێز لە تایبەتمەندی و جیاوازی تاکە کەسەکان ناگرێت و هەموو وەکو یەک تەماشا دەکرێن. لە کەلتووری بازاڕییدا تاکەکان پڕۆژەکانی بوونیان سەربەستانە هەڵنابژێرن وشوێن نەریت و بەها و زانینە باوەکان دەکەون و هەموویان وەکو یەک بیردەکەنەوە و هەڵسوکەوت دەکەن و خاوەنی بیر و هەڵوێستی خۆیان نین. لە ژێر کاریگەرێتی کەلتووری بازاڕییدا مرۆڤ نامۆ و ناڕەسەن دەبێت. دەبێت بەو کەسەی کەسانی دیکە دەیانەوێت، نەک بەوەی خۆی دەیخوازێت. لەبەر ئەو هۆکارەشە، نیتشە مرۆڤی بەرز ئاگادار دەکاتەوە واز لەو کەلتوورە بهێنێت و شوێن بەها و زانینە باوەکان نەکەوێت و لە بازاڕی نامۆبوون و خۆ وونکردن دووركەوێتەوە.

ئەمڕۆ ئەو پرسیارە دەکرێت، چۆن بوونی مرۆڤ بەردەوام بێت؟
زارادەشت یەکەم کەس و تەنیا کەسە بپرسێت!
چۆن مرۆڤ ڕەتبکەین؟
ئەوەی دەمەوێ مرۆڤی بەرزە.
ئەو یەکەم و تەنیا کەسە من دەمەوێت، نەک مرۆڤ، نەک دراوسێ و هەژارترین و خەمخواردووترین و باشترین.
من سەرکەوتن و ڕوخانی مرۆڤم خۆشدەوێت.
لە تۆدا خۆشەویستی و هیوا دەبینم.
. . .
سەروەرەکانی ئەمڕۆ ڕەتکەن
ئەم مرۆڤە بچوکانە! ئەی براکانم بۆ ژیانی مرۆڤی بەرز پڕ مەترسین.
ئەی مرۆڤی بەرز!
چاکە بچوکەکان، سیاسەتە بچوکەکان، تێڕوانینە بچوکەکان،
شارە مێروولە بێکەڵکەکان، حەسانەوەی بەزەییانە، بەختەوەری
بۆ هەمووان ڕەتکەن.[60]

مرۆڤی بەرز بوونێکی داهاتوویی هەیە. بۆ بەرزێتی خۆی (ئەمڕۆ) و هەموو نەریت و بەهاکانی ئەمڕۆ ڕەتدەکات و خۆی بە ترۆپکێکی بەرزتر دەگەیەنێت. ڕەتکردنەکەشی بەو شێوەیەی نیتشە باسی دەکات "من سەرکەوتن و ڕوخانی مرۆڤم خۆشدەوێت" لە نێو

60 -هەمان سەرچاوە. لاپەڕە ٢٧٧.

زۆرانبازی ناکۆکیەکاندایە و جەنگێکی بەردەوامە، کە تێیدا جارێک مرۆڤ سەردەکەوێت و جارێکی دیکە دەڕوخێ. مرۆڤی بەرز بە بەردەوامی هەوڵی سەرکەوتن دەدات و مرۆڤی ناشرینیش دەڕوخێت. سەرکەوتن و ڕوخاندنەکە وەکو یەکدی جوانن و نیتشە هەر دووکیانی خۆشدەوێت. ئەو دەیەوێت مرۆڤی بەرز لە سەرکەوتندا بێت، بەڵام سەرکەوتنەکەی بە بێ ڕووخانی مرۆڤی نزم ڕوونادات. سەرکەوتنی مرۆڤی بەرز لە ئەنجامی ڕەتکردنی مرۆڤە نزم و ناشرینەکان و کەلتووره بازاڕییەکاندایە. لە ڕووخانی ئەوان و جیهانی بچوک و بیرکردنەوەی بچوکی ئەواندایە. سەرکەوتنی مرۆڤی بەرز پەرەسەندنی ژیان و داهێنانی مرۆڤێکی نوێ و مرۆڤایەتییەکی نوێیە" ئەی مرۆڤی بەرز! ئەی داهێنەر! تۆ هەڵگری منداڵی خۆتی."[61] خاوەنی ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی خۆیەتی و نووسەری داستانی مێژووە. ئەو کات و مێژووە چونکە سەرچاوەی گۆڕانکارییەکانی بوونیەتی و خاوەنی پڕۆژەکانە. دەرچوونی ئەم جۆرە مرۆڤە لە نێو بازاڕ و گەڕانەوەی بەرەو چیا بەرزەکانی داهاتووی و هەڵگەڕانی بە سەر ترۆپکی مێژوودا ئەو هیوایەیە نیتشە چاوەڕوانێتی و لەو باوەڕەشدایە ئەمە تەنیا ڕێگایەکە بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤایەتی و ڕەتکردنی مرۆڤی نزم و ناشرین.

ئەو منداڵەی مرۆڤی بەرز هەڵیگرتووە خۆیەتی لە داهاتوودا. ئەو مرۆڤەیە خۆی دەیەوێت پێی بگات و دایهێنێت. ئەو مرۆڤە بەرزەی خەونی پێوە دەبینێت خۆیەتی لە سەردەمێکی دیکەدا و لە جیهانێکی باشتردا و بە ویستی هێزێکی باڵاترەوە.

---

61- هەمان سەرچاوە. لاپەڕە٢٨٠.

ئەو پرسیارەی لێرەدا یەخەمان دەگرێت ئەوەیە، ئایا لە پێناوی چیدا مرۆڤی بەرز بازاڕ جێدەهێڵێت و بەرەو (داهاتوو) گەشتەکەی دەستپێدەکات؟ پێش وەڵامدانەوەیئەم پ٤سیا٤ە ئەو خاڵە دەخەمە ڕوو کە (بازاڕ) ئاماژەکردن بۆ (شوێن)نیە. بارودۆخێکە بوونی مرۆڤی داگیر کردووە و ڕێگە نادات مرۆڤ سەربەستانە بژی. هەموو ئەو سترەکچەرە ئۆنتۆلۆجی و مێژووییانەی ویستی مرۆڤ بە خۆیانەوە گرێ دەدەن ئەو بازاڕە یان ئەشکەوتەیە نیتشە ئاماژەی بۆ کردووە. مرۆڤ لە نێو کەلتووری بازاڕدا نامۆیە و خۆی وون کردووە. لە دەرەوەی خۆیدا دەژی و بووە بەو کەسانەی دەوروبەری. دەرچوونی مرۆڤ لەو بازاڕە لە پێناوی سەقامگیر کردنی (ویستی هێزە) لە شێوازێکی باشتر و بە هێزتردا. ئەوەی گرنگە بەردەوامییە لەو سەقامگیر کردنە و دامەزراندنەدا چونکە بوون، کە لە بنەڕەت بەدەرە و واتایەکی لە پێشتری پێنەدراوە ویستێکی ڕەوانە و بۆ دامەزراندنی هێزی هەوڵ دەدات.[62] مرۆڤی بەرز دەیەوێت هێز و دەسەڵاتی خۆی بەرە و پەرەسەندن بەرێت و بە ناشرینی نەژی. لەم گەشتە ژوورکێشییەی ویستی هێزدا مرۆڤی بەرز پەنا بۆ کەس نابات و خۆی بە تەنیا دەکەوێتە ڕێ. گەشتێکە خۆی دەتوانێت دەست پێبکات و کۆتایی پێبهێنێت، "ئەگەر بەرەو بەرزایی هەڵگەڕایت، پێکانی خۆت بەکاربهێنە. با خەڵکی هەڵت نەگرن و مەچۆرە سەر شانی کەس."[63] لەم گوتەیەدا لێپرسینەوەی مرۆڤی بەرز بەرانبەر گەشتە ژوورکێشەکەی و لە نێو گەشتەکەیدا دەردەکەوێت. لێپرسینەوەیەک مرۆڤی سەربەست لە ئاکامی هەڵبژاردنی پرۆژەی بوونیدا دەیگرێتە ئەستۆی خۆی. ئەمەش کێشەیەکی فەلسەفی گرنگە، کە نیتشە و

---

62 - هەمان سەرچاوە. لاپەڕە٢٧٩.

63 - هەمان سەرچاوە. لاپەڕە٢٨٠.

بوونخوازەکان (بوونگەرایەتیەکان) لە سەری هاوڕان. لێپرسینەوە ئاکامێکی لۆجیکمەندانەی سەربەستیە و سەربەستیش پێویستییەکی ئۆنتۆلۆجییە، کە پاش ڕەتدانەوەی مێتافیزیکی ڕووناکبین و دامەزراندنی هیچگەرایەتی سەریهەڵداوە. لەگەڵ ڕەتدانەوەی ئەو شێوە مێتافیزیکەدا ئەوەمان ڕوونکردەوە، کە بونیادی ئۆنتۆلۆجی مرۆڤ لە مەبەست و واتا بەدەرە و ڕسکاوە. ئەگەر ئەم بوونە مەبەست و واتایەکی لە پێشتری پێدرابێت و خۆرسکێکی نەگۆڕی هەبێت ئەوا بوونێکی وەستاوی، وەکو هەبووەکان بۆ دادەبرێت و سەربەستیەکەی دەدۆڕێنێت. بوونێکیش لە پێشتر چارەنووسی دیاری کرابێت و ئەو شتە بێت، کە بۆی دانراوە، لە ئاستی هەڵوێست و کردەوەکانیدا لێپرسراو دانانرێت. سەربەستی مرۆڤ، لەم ڕووەوە، بە تەنیا فینۆمینۆلۆجیانە نیە و ئۆنتۆلۆجیانەشە. تێکۆشانی بوونێکی داگیرکراو بۆ سەربەستی بە تەنیا ڕووداوێکی مێژوویی نیە بەڵکو بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجیشی هەیە چونکە بوونی ئاگامەند لە بنەڕەتەوە سەربەستە. بوونێکە لە واتا بەدەر و لە مەبەست بەدەر.هەرچ واتا و مەبەستێکی هەبێت ئەو بوونە خۆی دایهێناوە. ئەو (هیچ)ەو دەبێت بەو بوونەی خۆی دەیەوێت[64]. لێرەدا جیاوازییەکی گرنگ لە نێوان ئۆنتۆلۆجیی بوونی ئاگامەند و ئۆنتۆلۆجیی هەبووەکان دەخرێتە ڕوو. گرنگی ئەم جیاوازییە لە وێدایە، کە ناتوانین یەک جۆر توێژینەوەی ئۆنتۆلۆجییانە بۆ ئەو دوو شێوازە ئۆنتۆلۆجییە بکەین و سروشت و مێژوو بخەینە بەر ڕۆشنایی یەک جۆر لێکۆڵینەوەی زانستانەوە. ئەمەش بە پێچەوانەی بۆچوونی مارکس و (مارکسیە ئۆرزۆدۆکسەکان) و بیریارانی سەر بە بازنەی ڤییەننایە. لەگەڵ

64 - بڕوانە: محەمەد کەمال، بوون و داهێنان، دەستگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤،لاپەڕە٨٣-٨٤ .

ئەو توێژینەوانەدا ناکۆکە، کە بوونی ئاگامەندیش بە هەبوویەکی سروشتی، وەکو درەخت و بەرد دادەنێن و یاساکانی سروشتی بە سەردا دەسەپێنن.

مرۆڤی بەرز شوێنکەوتووی مێتافیزیکی هیچگەرایەتییە و بکوژی باوکە مێتافیزیکییەکەیە. بۆ دابین کردنی سەربەستی دەستی خۆی بە خوێنی ئەو باوکە سورکردووە. لەگەڵ کوشتنی ئەو باوکە بووە بە مرۆڤێکی سەربەست و سەرچاوەی ناوەڕۆکی خۆی و داهێنەری بەهاکانی. لەم سەربەستیەوە خۆی بە لێپرسراو بەرانبەر بوون و ناوەڕۆکی بوونی دادەنێت. بەم شێوەیە هیچگەرایەتی سەربەستی و لێپرسینەوە پێکەوە گرێداوە. کوشتنی خوا بە تەنیا لە پێناوی دابین کردنی سەربەستیدا نیە و بۆ لێپرسینەوەی مێژووییشە. مرۆڤ، بە کوشتنی خوا، دەیەوێت بڵێت، کە لە ئەمڕۆوە من خاوەنی خۆمم و لێپرسراوم لە ئاستی بوونی خۆمدا. من هەرچییەک بم خۆم سەربەستانە دامهێناوە. ئەمەش ڕاستیەکی فەلسەفی هەرە گرنگە نیتشە و بوونخوازەکان بانگەشەی بۆ دەکەن. بۆیە نیتشە لە کۆتایی (زەردەشت وای گوت) دەڵێت، "ئەمە بەرە بەیانی منە، ئەی ڕۆژی ڕووناکم با شەپۆلەکانی نیوەڕۆ بەرز بنەوە. زەردەشت وای گوت و بەدەموچاوێکی گەشاوە و بە هێزەوە، وەکو خۆرەتاوێکی بەیانی لە نێو چیا تاریکە کانەوە دەردە چێت و ئەشکەوتەکەی جێدە هێڵێت."[65] مرۆڤێک ئەم ڕاستییە بدۆزێتەوە و ببێت بە خاوەنی بەرەبەیانێکی نوێ لە بوونیدا دۆگمای ئەشکەوت و بەها چەسپاو و بە سەردا سەپێنراوەکان و جیهانی بچووکی سەروەران و مرۆڤە ناشرینەکان بەجێدەهێڵێت و بەرە و بەرزایی دەڕوات.

65- Friedrich Nietzsche. *Thus Spake Zarathustra*, p. 317

# هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەتی میٚتافیزیکیی (خۆ)ی تازەگەری

لە بیرکردنەوەی فەلسەفیانەی تازەگەرییدا کێشەی (خۆ)یەکی تەوەری و خۆبژێو لە دێکارتەوە بووە بە یەکێک لە باسە فەلسەفیە گرنگەکان. بۆ دێکارت و شوێنکەوتوانی تازەگەری (خۆ)، بەو شێوەیەی لە کۆجیتۆکەی دێکارتدا"من بیردەکەمەوە، کەوابوو من هەم." دەردەکەوێت بوونێکی سەربەخۆ و دوورەپەرێز لە جیهان و بەرزی هەیە. بوونێکە دەتوانێت بە بێ لەش و جیهان و مێژوو هەبێت و بەردەوام بمێنێتەوە. بێجگە لەمە (خۆ) لەم بیرکردنەوە فەلسەفییەدا خاوەنی ناسنامە و خۆرسکێکی چەسپاوە و گۆڕانکاری بەسەردا نایەت. گۆڕانکارییەکانی نێو لەش و نێو جیهان کاریگەرێتی بە سەردا ناسەپێنن. خاوەنی ناسنامەیەکی نەگۆڕە و بە چەک و تفاقی زانینی زکماک و لە پێشتر هاتۆتە جیهانەوە. ئەو پێکهاتەیەکی مێژوویی و دەستکردی ڕووداوەکان نیە. خاوەنی سترەکچەرێکی لە پێشترپێدراو و نەگۆڕە و لە ژوور ڕووداوەکان و گۆڕانکارییەکانی مێژوووە ڕادەوەستێت. ئەم شێوە بیرکردنەوەیە سەبارەت بوونی (خۆ) زەمینەیەکی خۆبژێوی و خۆبەزلزان و حەقزانی بۆ خۆ خۆش کردووە و گەلێک ئاکامی نەرێی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی لە نێو مێژوودا پەیداکردوە. لەم بەستێنە خۆبژێو و حەقزانەوە خۆی تازەگەری (جیاوازی) بە کێشەیەکی ترسناک و هەڕەشەکەر داناوە و هەوڵی لە ناوبردنی دەدات و دەیەوێت جیهانێک دابهێنێت خۆی تێدا سەروەر بێت و لە جیاوازیش بەدەربێت.

بێگومان ئەم توێژینەوەیەی بوونی خۆ وابەستە بە بۆچوونی مێتافیزیکییانەی تازەگەرییەوە. کۆجیتۆکەی دێکارت، کە لەو شێوە مێتافیزیکییەوە سەریهەڵداوە خۆ بە ناوەڕۆکێکی گیانەکی دادەنێت. ناوەڕۆکی گیانەکی بێجگە لەوەی بوونێکی ئەستویی (ماتەری) نیە و کات و شوێن کار ناکەنە سەر بوونی، هاوکات پەیوەندی لەگەڵ لەش و جیهاندا (زەروری) نیە و دەتوانێت بە بێ ئەوان بەردەوام بێت. هەر چەندە خۆ لە ناو جیهاندایە، بەڵام بوونێکی جیهانی نیە. بوون لە ناو جیهاندا نەبووە بە پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ ئەو. ئەمەش بۆ توێژینەوە مێتافیزیکییەکە و بنەڕەتی ئەم بوونە لە فەلسەفەی تازەگەرییدا دەگەڕێتەوە بۆ بونیادی ئۆنتۆلۆجیی خۆ، بەو شێوەیەی دێکارت و شوێنکەوتوانی تازەگەری هۆشەکی، باسی دەکەن سەرچاوەیەکی لە ئەستوو بەدەر و بەرزی هەیە. لەبەر ئەمەشە (خۆ) لە ئەستو بەدەر و بەرزە و ڕووداوەکانی دەوروبەری ناسنامەی ناشێوێنن و وەکو خۆی دەمێنێتەوە. هەروەها خۆرسک و خەسڵەتی نەگۆڕ و ناسنامەی خۆ، بەو شێوەیەی لە کۆجیتۆکەی دێکارتدا دەردەکەوێت، پێکهاتەیەکی لە پێشتر ئامادەکراو و پێدراوە و بەو خۆرسک و خەسڵەتە نەگۆڕە و ناسنامەیەوە پەیدا دەبێت یان دەکەوێتە نێو جیهانەوە. ناوەڕۆکی، وەکو (شتێک)ی مێتافیزیکی یان (هەبوو)یەکی لە ئەستوو بەدەر پێش خزانە نێو لاشەوە و لە دایکبوونی لە نێو جیهاندا هەبووە و بە مردنیش کۆتایی نایەت. لە فۆرمێکی دیکەدا بەردەوام دەژی. بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم توێژینەوەیە بۆ خۆی تازەگەری و دانانی مرۆڤ بە ناوەڕۆکێکی گیانەکی دابڕاو لە لەش دەبێت بنەڕەتە مێتافیزیکییەکەی ڕەتبدەینەوە. بیردۆزی ناوەڕۆکی گیانەکی ئاکامی دامەزراندنی ئەو جۆرە مێتافیزیکەیە دێکارت و شاگردەکانی پەیڕەوییان کردووە. گرنگی هەڵوەشاندنەوە

و دامەزراندنی سیستەمی مێتافیزیک لەم خاڵەوە دەردەکەوێت و لێرەدا دەزانین، کە چی ڕۆڵێکی گرنگ لە توێژینەوەی فەلسەفییدا دەبینێت. چی پەیوەندییەکی بنەڕەتی بە کێشە فەلسەفییەکانەوە هەیە. نیتشە بە کوشتنی خوا و هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەستەڵاتە ڕەهایەی ژوور دەستەڵاتی مرۆڤ و سروشتەوە شێوازێکی مێتافیزیکی نوێی دامەزراندووە، کە لە نێو خۆیدا هەموو کێشە فەلسەفییەکانی، بە تایبەتی کێشەی بوونی مرۆڤی پێچاوەتەوە. ڕەتدانەوەی بنەڕەت و مەبەستی بوون، کە ئێمە بە بیرکردنەوەی هیچگە ری گەیاند ڕێگە نادات بوونی مرۆڤ بۆ ناوەڕۆکێکی گیانەکی نەگۆڕ و خاوەن ناسنامەیەکی چەسپاو بگەڕێنینەوە. داوای توێژینەوەیەکی تازەتر و جیاوازمان لێ دەکات، کە من ئەم توێژینەوە نوێیە لەم چەند خاڵەدا کۆدەکەمەوە:

یەکەم: هەڵوەشاندنەوەی بیردۆزەی ناوەڕۆکی گیانەکی یان خۆیەکی تەوەری و چەقیو لە بوونی مرۆڤدا.
دووەم : دانانی خۆ بەکڵافەیەک ئەزموونی جیاواز.
سێیەم : دانانی خۆیەکی بێ خۆرسک و بێ ناسنامە.
چوارەم : بەستنەوەی خۆ بە مێژووەوە.

هەڵوەشاندنەوەی بیردۆزی دێکارتی و ڕەتدانەوەی تێگەیشتنی تازەگەریانە لە بوونی مرۆڤ سووربوونە لە سەر تەفسیرێکی نوێتر بۆ ئەم بوونە. نیتشە یەکەم بیریارە بیردۆزەکەی دێکارتی ڕەتکردۆتەوە و هەوڵیداوە پاش ئەو ڕەتکردنەوەیە لە ڕوانگەی مێتافیزیکە نوێکەیەوە تەفسیرێکی نوێتر بۆ بوونی مرۆڤ بکات. ئەم تەفسیرە نوێیە پێویستیەکی فەلسەفی سیستەمە مێتافیزیکییە

نوێکەیە. کوشتنی خوا، وەکو پرۆژەیەکی مێتافیزیکی هەرە گرنگ لە بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشەدا شێوە و ناوەڕۆکێکی نوێ و جیاوازتر لە مرۆڤی تازەگەرایەتی بەم بوونە دەدات. مرۆڤ بە دەستەڵاتێکی نەبڕاوەوە دەخاتە سەر شانۆی مێژوو. بەڵام ئەگەر ئەو مرۆڤە ناوەڕۆکێکی گیانەکی نەبێت سەرچاوەیەکی بەرز و لە ئەستوو بەدەری نەبێت و بێ ناسنامە بێت، چییە و چۆنە؟

مرۆڤ ناوەڕۆکێکی گیانەکی نیە، چونکە بۆ نیتشە (گیان) نیە. لەبەر ئەمە بوونی مرۆڤ چی بێت، بەو جۆرە نیە دێکارت باسی کردووە و بە سەرچاوەیەکی بەرزەوەی گرێداوە. نیتشە لەم بارەوە دەڵێت:

> چەندێتی هێز بەرابەر چەندێتی وروژان و ویست و کردەوەکانە.
> تەنیا فێڵ و هەڵەیەکی زمانەوانییە، کە ئەو کردەوانە بۆ نوێنەرێک دەگەڕێنێتەوە و ئێمە چاو بەست دەکات. ئەمەش وەکو ئەو بیرۆکە خورافیەی خەڵکی وایە، کە هەورە بروسکە و بروسکەکەی لە یەکدی جیادەکاتەوە و دووەمیان بۆ سەرچاوەیەکی دیکە دەگەڕێنێتەوە یان ئەو بیرۆکەیەی هێز و خۆ دەرخسینی هێز بە دوو شتی جیاواز دادەنێت و وەکو ئەوەی نوێنەرێکی سەربەخۆی هەبێت. بەڵام ئەو نوێنەرە نیە،.....(خۆ) شتێک نیە هەبێت.هیچ بوونێک لە ژوور کردەوەکانەوە نیە تاکو بەو کردەوانە هەستێت. ئەوەی ئێمە بە (خۆ)ی دادەنێین زادەی ئەندێشەمانە. ئەوەی هەیە کردەوەکانە، نەک (بکەر) کانی.[66]

66- Friedrich Nietzsche. *The Genealogy of Morals*, translated by Francis Gollfing, New York: Anchor Books, 1990. Pp.178-79.

لەگەڵ ڕەتدانەوەی بیردۆزی ناوەڕۆکی گیانەکییدا بوونی مرۆڤ لە نهۆمێکی بەرزی گیانەکییەوە و ژوور ئەزمونی هەستەکییەوە بۆ نێو جیهان دەگوێزیتەوە. بوونی دەبێت بە بوونێکی جیهانی. پەیوەندییەکەی لەگەڵ جیهاندا دەبێت بە زەرورەیەکی ئۆنتۆلۆجی و بە بێ لە نێو جیهاندا نابێت. لە بۆچوونی هەندێکدا ئەم گواستنەوەیە و گۆڕانکارییە لە بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجی ئەم بوونەدا دابەزاندن و نزمکردنەوەی مرۆڤە لە نهۆمێکی بەرزەوە بۆ ئاستی ئاژەڵ و بە ئاژەڵ کردنی مرۆڤ. بێگومان ئاوڕدانەوەیەکی ساکارانە لەم کێشەیە جیاوازییەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ لەم دابەزینەدا نابینێت. نیتشەش لە هەندێ نووسراوییدا ئاماژەی بۆ ئەو خاڵەکردووە، کە مرۆڤ، وەکو ئاژەڵ بوونێکی ئەستوویی هەیە و گیانی نیە. هاوکات ئەو خاڵە گرنگەی لە بیرنەچووە، کە مرۆڤ بە ئاژەڵی نەماوەتەوە و خۆی بە قۆناخێکی بەرزتری پەرەسەندن گەیاندووە.

مرۆڤ بێگیانە و یەکێکە لە ئاژەڵەکان. بەڵام لە نێو ئاژەڵەکاندا لە هەموویان بە هێزتر و ژیرترە. لایەنی گیانەکی ئەو ئاکامی ژیرییەکەیەتی . مرۆڤ تاجی سەری بوون نیە: هەموو زیندەوەرەکان بەرابەری ڕادەوەستن ...مرۆڤ خراپەکەرە و زەبوونترین ئاژەڵە، کە نەیتوانیوە لە (غەریزە) پڕ مەترسییەکانی دوور کەوێتەوە. بەڵام لە سەرو ئەمەشەوە مرۆڤ لە هەموو شتێک زیاتر ئارەزووبزوێنترە.[67]

---

67 - Friedrich Nietzsche. “The Antichrist”, in *The Portable Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, New York: The Viking Press, 1972. P.580.

هەروەها بڕوانە:

Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p.199,
Friedrich Nietzsche. “Notes (1887)”, in *The Portable Nietzsche* p.455.

ڕوانینێکی بایۆلۆجیانە لە بوونی مرۆڤ ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، کە مرۆڤیش جۆرێکە لە ئاژەڵ بەڵام جیاوازیشی لەگەڵ جۆرەکانی ئاژەڵدا هەیە. لێرەدا نیتشە هەوڵیداوە پێمان بڵێت، کە بوونی مرۆڤ پەیوەندی بە سەرچاوەیەکی بەرز و گیانەکی لە ژوور ئەم جیهانەوە نیە. بوونێکی ئاسمانی نیە و لە شوێنێکی دیکەوە بۆ ئێرە نەهاتووە. بوونی ئەو خەسڵەتێکی مێتافیزیکی نیە، کە لە بوونەوەرەکانی دیکەی جیابکاتەوە. بوونی ئەستووییە و بێجگە لە (لەش) چی دیکە نیە و هەموو ئاژەڵێکیش لەشی هەیە. لە نێو ئاژەڵەکانیشدا مرۆڤ لە هەموویان زیاتر وێرانکەرتر و زەبوونە و لە هەموویان زیاتریش سەرنج ڕاکێشەرترە یان هایدیگەر گوتەنی لە واتای بوون دەکۆڵێتەوە. ئەم خەسڵەتەش، کە نیتشە بە وروژاندنی ویستی هێزی دادەنێت بوونی مرۆڤ لە بوونی ئاژەڵی دوور دەخاتەوە و دەیکات بە بوونێکی جیاواز تر و بەرزتر. بە واتایەکی دیکە، لە هەندێک شوێن و لە نێو هەندێک کەلتووردا سەرکەوتنی تاکە کەسەکان دەبینین. لێرەدا، بەرەو ڕووی بوونێکی بەرز یان مرۆڤی بەرز دەبینەوە.[68]

مرۆڤ ئاژەڵە و ئاژەڵیش نیە. لە هەر دوو حاڵەتەکەدا مرۆڤ خۆی دەتوانێت بە ئاژەڵی بمێنێتەوە یان ئاژەڵ ڕەتبکات و ببێت بە مرۆڤێکی بەرز. ئەم گۆڕانکارییەش لەلای تاکەکان بۆ دامەزراندنی ویستی هێزیان جەنگێکی بەردەوامە. لەم جەنگەدا مرۆڤ هەوڵ دەدات بە ئاژەڵی نەمێنێتەوە و خۆی بە قۆناخێکی نوێی پەرەسەندن بگەیەنێت. بوون بە ئاژەڵی دوو واتای هەیە: واتای یەکەمی وابەستە بە بوونی ئەستوویی مرۆڤ و نەبوونی (گیان) لە بونیادی ئۆنتۆلۆجی

68 - هەمان سەرچاوە. لاپەڕە ٥٧١.

ئەم بوونەدا. دوەمیش بارودۆخێکی بوونە. لەم حاڵەتەدا بوونی مرۆڤ لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا لەگەڵ دامەزراندنی ویستی هێزیدا بە بێ هەستکردن بە لێپرسینەوە خۆی دەردەخات و مرۆڤانە خۆی نانوێنێت. پارێزگاری کردن لە مرۆڤایەتی شامەرجێکی ئاکارییە بۆ نیتشە چونکە پاش مردنی خوا ئەوەی دەمێنێتەوە و واتا بە بوون دەدات مرۆڤە. مرۆڤ دەبێت بە خاوەنی خۆی و جیهان و لێپرسینەوەی مێژوویی دەگرێتە ئەستۆی. مرۆڤێک بەم ئاگاییەوە مامەڵە لەگەڵ جیهاندا بکات بە ئاژەڵی نامێنێتەوە و خراپەکەریش نابێت و دەستەڵات و ویستی هێزی دژی مرۆڤایەتی بەکار ناهێنێت. نیتشە گوتەنی، "ئەوانەی دژی دڕندەکان دەچنە جەنگەوە، نابێت لە کۆتایی جەنگەکەدا خۆیان ببن بە دڕندە".[69] لێرەدا حاڵەتی بە ئاژەڵ بوونی مرۆڤ و مانەوەی لەو حاڵەتەدا کێشەیەکی فینۆمینۆلۆجییە نەک ئۆنتۆلۆجی. ویست و هەڵبژاردنی مرۆڤە. چونکە پاش مردنی خوا سەربەستی و دەستەڵاتی گۆڕانکارییەکان بە مرۆڤ دراوە. مادامەکی مرۆڤ سەربەستە و خاوەنی دەستەڵاتە پێویستە قۆناخی ئاژەڵی ڕەت بکات خۆی بەو ئاژەڵە کاوێژکەرە نەبینێت، کە نەتوانێت بەسەر یاساکانی بایەلۆجیدا زاڵ بێت و (مرۆڤی بەرز) نەبێت بە پرۆژەی داهاتووی. ئەو کەسانەی لە نێو تۆڕی بونیادی ئاژەڵیدا دەمێننەوە و ناتوانن ببن بە مرۆڤ کەسانی نامۆ و ناڕەسەن و خۆ دۆڕێنن. ئەوانەن شوێن کەلتووری بازاڕیی دەکەون. کۆسپ و ڕێگریشن لە ئاستی پەرەسەندن و پێشکەوتندا. ئەم مرۆڤە بە ئاژەڵ کراو و ناڕەسەنانە زادەی سەردەمەکەیانن و ژیانیان لە نێو خولەی ڕابردوو و ئێستادا دەسوڕێتەوە و بێ داهاتوون. بۆ ئەوان هەموو

---

69 - Friedrich Nietzsche. "Beyond Good and Evil", in *Basic Wri - ings of Nietzsche*, tranlated by Walter Kaufmann, p. 279.

نەریت و بەها و زانینێکی باو لە بازاڕدا لە سەرچاوەی ڕاستییەوە هەڵقوڵاون و کوێرانە شوێنی دەکەون. بەو ژیانە ڕازین، کە هەیانە و نایانەوێت بەرەو پێشەوە بڕۆن.

پێشکەوتن و پەرەسەندن گۆڕانی کەلوپەلەکانی دەوروبەر و ئامێرە تەکنەلۆجییەکان نیە. ڕەتکردنی حاڵەتی ئاژەڵی و ناڕەسەنی و کەلتووری بازاڕیی و باوەکانی سەردەمە. پێشکەوتن پڕۆژەیەکی ئاگامەندانەی ویستی هێزە بەرەو داهاتوویەک، کە مرۆڤ تیایدا خۆی بە ئاژەڵ نابینێت و دەبێت بەو سوپەرمانەی نیتشە باسی دەکات. مرۆڤە بە ئاژەڵبووەکان مرۆڤایەتییان بە چوار هەڵە و درۆدا بردووە، کە بۆ ئەوان و بۆ ماوەیەکی زۆر لە مێژووی شارستانیەتدا ئەو چوار درۆیە بەرگێکی (ڕاستی)یان بە بەردا کراوە و قەیرانی لە بیرچوونەوەی فەلسەفی و بۆچوونی ئاکارییدا هێناوەتەکایەوە. درۆی یەکەم ئەوەیە، کە مرۆڤ بە کەم دانراوە. دووەم هەندێ خەسڵەتی ساختە و ناڕاستی پێدراوە (وەکو ناوەڕۆکێکی گیانەکی لە پێشتر و کۆک کراو)، سێیەم، مرۆڤ بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە لە نهۆمێکی بەرزی گیانەکییدا دانراوە. چوارەمیش کۆمەڵێک بەهای ڕەوشتی لە بەردەم مرۆڤدا بە هەمەکی و نەگۆڕ داناوە ،کە تاکەکان ناچار دەکات و دەستەڵاتی ڕەتکردنیانی لێ زەوت دەکات.[70] ئەم چوار هەڵەیە، ئەگەر بە وردی تەماشا بکرێن دەگەڕێنەوە بۆ بۆچوونەکانی نێو سیستەمی مێتافیزیکی ڕووناکبین و پەیوەندییان بەو بنەڕەتەوە هەیە. هەڵوەشاندنەوەی ئەم هەڵانە و ڕاچڵەکاندنی مرۆڤ لەو خەوەگرانەی دۆگمای ئەشکەوت و کەلتوورە بازاڕییەکە لە ڕەتدانەوەی بنەڕەتەکەوە دەست پێدەکات. لە بەر ئەم هۆکارەشە

70 - Friedrich Nietzsche. *The Gay Science*, p. 174.

پرۆژەی فەلسەفی نیتشە ڕادیکالانە مامەڵە لەگەڵ بیردا دەکات چونکە توێژینەوە نوێکەی لەمەڕ بوونی مرۆڤ لە پرۆژەی هەڵوەشاندنەوەی مێتافیزیکیی ڕووناکبینەوە سەر هەڵدەدات. پرۆژەیەکی فەلسەفی لەم سەرەتایەوە بە هەڵوەشانەوەی بنەڕەتی سیستەمە پێشوترەکە سەرهەڵنەدات ڕادیکالانە لە کێشەکان ناکۆڵێتەوە و گۆڕانکاری گەورە لە مێژووی بیرکردنەوەدا ناخاتە گەڕ. پاش ڕەتکردنی مێتافیزیکی ڕووناکبین، ڕەتدانەوەی ئەم چوار درۆیە، کە لە سەر بناخەی مێتافیزیکە ڕووناکبینەکە ڕادەوەستن دەبێت بە بەرنامەیەکی شۆڕشگێڕانە و پێویست. مرۆڤ بە ئاگا دەهێنێتەوە، کە نابێت لە نێو ئەو درۆیانەدا بژی. ئەو بێجگە لە ئاژەڵێک چیتر نیە. ئەمەش ڕاستیەکی ناخۆشە و نامانەوێت بیبیستین. ئێمەی پەروەردەکراوی مێتافیزیکی ڕووناکبینانە فێرکراوین، کە منداڵی باوکێکی خاوەن دەسەڵات و بەزەییەکی ڕەهاین. ئەو باوکە ئێمە و جیهانی بە ئامادەکراوی و خۆرسکێکی چەسپاوەوە ئافەرید کردووە. ئەویش بۆ بوون و گۆڕانکارییەکانی بوون هۆ و بەرپرسە. هاوتەرازبوونمان لەگەڵ ئاژەڵدا پاش مردنی ئەو باوکە بە دەسەڵات و بەزەییە ڕەهایە مرۆڤ بە تەنیا و بە بێ ناوەڕۆکێکی لە پێشتر پێدراو و بەزەیی باوکایەتی لە بیابانی بووندا جێ دەهێڵێت. ئەرکی داهێنانی ناوەڕۆکی و گۆڕانی سروشت بۆ جیهانێکی مرۆڤانە و مرۆڤخوازانە دەخاتە ئەستۆی. ئەم گۆڕانکارییە ئۆنتۆلۆجییە لە بوونی مرۆڤدا کەسانی ئازاو نەترسی دەوێت پەیڕەوی بکات. لە بەر ئەمەشە مردنی باوک بۆ منداڵی دەستەمۆکراو و خاوەن ویستێکی کەم هێز ڕووداوێکی ترسناکە. ئەو مرۆڤە ترسنۆکانە نایانەوێت ڕۆڵی مێژوویی ببینن و ببن بە خاوەنی بوونی خۆیان.

پاش ڕەتدانەوەی بیردۆزی ناوەڕۆکی گیانەکی بۆ ناسینی بوونی مرۆڤ

و دابڕانی ئەم بوونە لە سەرچاوەیەکی بەرزی مێتافیزیکییەوە نیتشە بوونی بۆ (ویست) گەڕاندۆتەوە. ئەمەش کاریگەرێتی شۆپنهاوەر بە سەر بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشەوە دەردەخات. بەڵام نیتشە، وەکو شۆپنهاوەر مامەڵەی لەگەڵ کێشەی (ویست)دا نەکردووە و دژی بۆچوونە دێکارتییەکەش سەبارەت بە بوونی (ویست) ڕادەوەستێت. بۆ دێکارت و شوێنکەوتوانی، بیردۆزی ناوەڕۆکی گیانەکی (ویست) بەشێکە لە چالاکیەکانی ناوەڕۆکە گیانەکیەکە. لە کاتێکدا ویستی مرۆڤ ڕوو لە بابەتێکی ویستراو دەکات، ویست لە سەرچاوەیەکی گیانەکییەوە هەڵئەقوڵێ و دەبێت بە ویستی ناوەڕۆکی گیانەکی بۆ شتێکی دەرەکی لە دەرەوەی ئەو ناوەڕۆکەدا. لێرەدا لەگەڵ هەموو ویستێکدا سێ جۆر لایەنی جیاواز بەشداری دەکەن: ناوەڕۆکی گیانەکی یان نوێنەرێکی بەرز، کە ئەو ویستەی تێدایە. ویستەکە، وەکو چالاکی و جوڵەیەک لە ناوەوە بەرەو دەرەوە و هەروەها بابەتە ویستراوەکەی دەرەوەی ویست. دێکارت و شاگردەکانی گرنگی و بایەخ بە سەرچاوەی ویستەکە، کە بە دیدی ئەوان ناوەڕۆکە گیانەکییەکەیە دەدەن و (ویست)، وەکو (بیرکردنەوە) یان (ئاگایی) بۆ ئەو سەرچاوەیە دەگەڕێننەوە. لە ڕوانگەی ڕەتدانەوەی بیردۆزە دێکارتییەکەوە دەگەینە ئەو ئاکامەی، کە (ویست) لە بنەڕەت بە دەرە و نوێنەری نیە. هیچ شتێک لەو دیو ویستەوە نیە تاکو ویست بەرەو بابەتە ویستراوەکە بجوڵێنێت.[71] بێ نوێنەرایەتی ئەم هێزە، ویست دەکات بە ڕەوت و جووڵان بەرەو بابەتە ویستراوەکان. تەنیا مەبەستێکیش لەم ڕەوتەدا هەبێت سەقامگیرکردنی هێزە لە پێناوی هێزدا. دیسانەوە با ئەو خاڵەش ڕەچاو بکەین، کە هێز

71 - Friedrich Nietzsche. “The Antichrist”, in *The Portable Nietsche*, translated by Walter Kaufmann, p. 581.

وەکو ناوەڕۆکی ویست سەرچاوەیەکی بەرزی نیە. ویستی هێز و هێزی ویست دوو داکەوتی جیاواز نین. هەر دووکیان یەکن و بە بێ یەکدی نابن. جیاوازی نێوان تاکەکانیش بۆ دیاردەی هێزی ویست دەگەڕێتەوە. لای تاکێک هێز زۆرتر و لای تاکێکی دیکە کەمتر خۆی دەردەخات. بەڵام لە هەر دوو حاڵەتەکەدا ویست هێزی خۆی دەرخستوە، لە بەر ئەوەی ویست (شت) نیە ئەوا بە هێز و زەبوونیش نابێت. ئەوەی ویست کەم هێز و زەبوون دەکات پێک نەهاتنی جووڵێنەرەکان و ڕێنەکەوتنیانە. ئەوەی ویستیش بە هێز دەکات پێکەوە ژیانی جولێنەرەکانە لە ژێر دەستەڵاتێکی زاڵبوودا: لە حاڵەتی یەکەمدا نە کەمیی ڕاکێشان و هەژاندنە و لە حاڵەتی دووەمدا نە وردکاری و دووربینییە لە ڕەهەندەکەدا.[72]

ئەم جۆرە توێژینەوەیە سەبارەت ناوەڕۆکی ویست ئاکامێکی لۆجیکمەندانەی مێتافیزیکی هیچگەرایەتییە، کە هەموو بنەڕەتەکان هەڵدەوەشێنێتەوە و دژی بنەڕەتخوازی ڕادەوەستێت. ئەگەر ئێمە لەم ڕوانگەیەوە بڕوانینە (ویست) ناتوانین بە بنەڕەتێکی بەرز و نوێنەرێکی ئەو دیو ئەزموونە هەستەکییەکانەوە ببەستینەوە. لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەتدا دەرگایەکی نوێی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەمان بۆ دەکرێتەوە و ئاسمانێکی بەرفراوان دەبینین، کە هەموو شتێک تێیدا بە بێ بناخە و کۆڵەکە هەڵواسراوە. هیچگەرایەتی لە بنەڕەت بەدەریی و گەڕانەوەی بوونە بۆ هیچ یان دانانی بوونە بە هیچ. لێرەشەوە دەگەینە ئەو باوەڕەی، کە ویست (هیچ)ە، چونکە لە بنەڕەت بەدەرەو بێ نوێنەرە. ئەوەی بە (ویست) دادەنرێت ڕەوتێکی مرۆڤانەیە بۆ دامەزراندن و دەرخستنی ناوەڕۆکێک، کە

72 - Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, pp. 28-29

نیتشه به (هێز) ناوزەدی دەکات.

ئەوەی ویست دەیەوێت بابەتە ویستراوەکە نیە، بەڵکو سەقامگیرکردنی هێزەکەیەتی بە سەر ئەو بابەتەدا و داگیرکردنی بابەتەکەیە. بۆ نموونە ویستی پیاو بۆ ژن لە پێناوی ژنەکەدا نیە. پیاو دەیەوێت لە ڕێگەی ویستەکەیەوە ئەو بابەتە ویستراوە داگیرکات. داگیر کردنی ئەو بابەتەش بە هۆی دەرخستنی هێز و سەپاندنی ئەو هێزیە. ئەمە نموونەیەکە بە سەر هەموو شێوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا دەچەسپێت. تاکەکان لە نێو کۆمەڵدا فرێدەداتە نێو تۆڕی کایەکانی هێز. لە ئەنجامدا ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، کە ناوەڕۆکی ویست بابەتە ویستراوەکە نیە. ژن، وەکو بابەتی ویستراوی پیاو نابێت بە ناوەڕۆکی ئەو ویستە. ناوەڕۆکی ویستی پیاو، لەم نموونەیەدا، خۆ دەرخستنی ویستی هێزە بە ڕێگەی داگیرکردنی ئەو بابەتە. ئەوەی بۆ پیاو گرنگە ژن نیە بەڵکو سەپاندنی هێزی خۆیەتی بە سەر ژندا، کە لە ڕێگەی داگیرکردنی لەشیەوە ڕوودەدات.

نیتشە لە ژێر کاریگەرێتی شۆپنهاوەردا دەیەوێت ئەو خاڵەمان بۆ بسەلمێنێت، کە ویست پێویستی بە زانین نیە.[73] ئەم پەیوەندییەی نێوان ویست و زانین یان بە شێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین ویست و ئاگامەندی گرنگە و دەبێت ڕەچاو بکرێت. ئایا لە چی لایەنێکەوە ویست و ئاگامەندی پێویستیان بە یەکدی نیە؟ ئەگەر جوڵە و بزوێنی گەردوون و پەرەسەندنی ژیانی ڕووەک و ئاژەڵ و گۆڕانکارییە بایەلۆجییەکانی لەشی مرۆڤ بە (ویست) دابنێین ئەم پەرەسەندنە لە ئاگا بەدەرەر و لە سەر زانین ڕانەوەستاوە. کەسێک لە فەسلەجەی لەشی خۆی نەزانێ و بێ ئاگابێت لەوەی

73 - هەمان سەرچاوەی پێشو. لاپەرە٣٥٠ .

خواردن لە نێو گەدەدا چۆن ورد دەبێت و چەند مادەی کیمیاوی بە سەردا دەڕژێت، هەر خواردن هەرس دەکات. تاکو ئێرە، نیتشە بە دروستی بۆ کێشەکە چووە و لەگەڵیدا هاوڕاین. بەڵام، کە دێینە سەر هەڵبژاردنی پرۆژەکانی بوونمان و ویستی دامەزراندنی ئەو پرۆژانە ئاگامەندی ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە و لەگەڵ ویستدا پەیوەندییەکی بنەڕەتی دەبەستێت. پرۆژەکانی بوونێکی ئاگامەند بە شێوەی خواردن هەرسکردن نایەنەکایەوە و لە سەر ڕەوت و بەرنامەڕێژ کردنی ئاگامەندا ڕادەوەستن. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئاگامەندی و ویست دوو لایەنی ناکۆکن و دژانە بەرانبەر یەکدی ڕادەوەستن. لە بنەڕەتەوە، ئاگامەندی و ویست بوونیان جیاواز نیە و لە دوو سەرچاوەی مێتافیزیکییەوە هەڵنەقوڵاون. تەنانەت لای شۆپنهاوەریش ئەم دوو لایەنە لە بوونی مرۆڤدا سەر بە یەک جۆر ڕاستەقینەن. لە ڕوانگەی ئەم بۆچوونە یەکانەکییەوە )مۆنینۆمەوە (، کە بیریارانی، وەکو هیگڵ و فیختەش بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی نێو مێتافیزیکی دووانەکی کانت دایان مەزراندووە، بە ڕێگە چارەیەک بۆ لەناو بردنی ناکۆکییەکانی نێوان ئاگامەندی و ویست دەگەین. بۆچوونی یەکانەکی بەرەو ئەو باوەڕەمان دەبات، کە ئاگامەندی و ویست یەک (شت) بن. مەبەستمان لە (شت) ئاوەڕدانەوەمان لە ناوەڕۆکی گیانەکی دێکارت نیە، گەڕانەوەی هەر دووکییانە بۆ یەک سەرچاوە. لێرەدا، ئەگەر ئاگامەندی بە ڕێگری حەز و ئارەزووەکانی ویست دابنرێت و چاودێری ڕەوتەکەی بکات، هێشتا ناتوانین بڵێین، کە ئاگامەندی ویستی ناچار و سەربەستییەکەشی سنووردار کردووە چونکە ئاگامەندی شتێکی جیاوازتر لە ویست نیە.

بوونی مرۆڤ بە پێچەوانەی بوونی ئاژەڵەوە ویستێکی ڕووت نیە. مرۆڤ

به تەنیا کانیاوی غەریزە بایەلۆجیەکانی نیە. بوونێکی ئاگامەندانەی هەیە. ویستەکەشی ویستێکی ئاگامەندە و ئاگامەندییەکەش ویستگەرانەیە. ئەمەش هۆکارێکە مرۆڤی بە ئاژەڵی گلنەداوەتەوە و بە پلەیەکی بەرزتری گەیاندووە. کردوویەتی بە خاوەن بەرنامە و بیرکەرەوە لە داهاتوو یان دارشتنی ویست و هێزی ویست لە کەناڵەکانی وەبەرهێنان لە پێناوی گەیشتنی بە مرۆڤی بەرز ویستی مرۆڤی بەرز هەوڵ دەدات. ویستی مرۆڤ غەریزەیەکی رووتی ئاژەڵی نیە، کە بۆ ئارەزووە ساتیەکانی (ئێستا) هەوڵ بدات. ناگونجێت بە بێ سەربەستی لە رەوتی ویستی هێز بدوێین. سەربەستی پێشمەرجێکی رەوتەکەیە و تاکو مرۆڤ سەربەست نەبێت ویستی هێزی خۆی سەقامگیر ناکات و پەرەی پێناسەنێت. بەڵام نیتشە نایەوێت زاراوی (سەربەستی ویست) بەکاربهێنێت و تەنانەت رەتی دەداتەوە.[74] بۆ نیتشە ئەوانەی باوەریان بە سەربەستی ویست هەیە دەیانەوێت لێپرسینەوە بە سەر مرۆڤدا بسەپێنن و لێپرسینەوەکەش بۆ نوێنەرێکی مێتافیزیکی ژوور سنوری لەشەوە بگەرێننەوە. بێگومان ئەم بیرکردنەوەیەی نیتشە لەگەڵ سیستەمە مێتافیزیکییە هیچگەرایەتییەکەیدا ناکۆکە، تەنانەت لە نووسراوێکیدا بە ئاشکرا دەڵێت، "هیچ هۆیەکی گیانەکی بۆ کردەوەکان نیە".[75] یان "هیچ کردەوەیەک بە هۆ و مەبەستەوە گرێنەدراوە."[76] رەتدانەوەی هۆیەکی لە پێشتر لە ئاستی کردەوەکاندا سووربوونە لە سەر بیرۆکەی سەربەستی ویست. مرۆڤ سەربەستە چونکە هۆیەکی دەرەکی کردەوەکانی هەڵناسورێنێت و خۆی بریار لە

74- Friedrich Nietzsche. “Beyond Good and Evil”, in *Basic Writings of Nietzche*, p. 216, 219.

75 - Friedrich Nietzsche. *Twilight of the Idols*, p.21.

76 - Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 351.

سەر دامەزراندنیان دەدات. بڕیاردانەکەشی ڕۆڵی ئاگامەندی لە بوونی مرۆڤدا دەردەخات و ئەو خاڵە ڕووندەکاتەوە، کە ویستی هێز لە مرۆڤدا هەمیشە لە داهێنانی پرۆژەکاندا ویستێکی ئاگامەندە. ئەمەش بە پێچەوانەی بۆچوونی پێشوی نیتشەوەیە، کە جوڵانی ویستی بە ڕەوتێکی خۆ- ڕسکاو و لە ئاگا بەدەر دانا. نیتشە بە بێ ئەوەی بزانێت چۆن خۆی توشی کێشەیەکی ناکۆک کردووە، لە شوێنێکی دیکەدا بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەی خۆیەوە دەڵێت، ”کەسێک بە ئاگاوە خاوەنی خۆی بێت، دەتوانێت ببێت بە خاوەنی دەوروبەری.“[77] یان ” کەسێک غەریزە دەستی بە سەردا بگرێت، دەبێت بە هێزێکی ڕووخێنەر.“[78] ئەم شێوە پەیوەندییەی ئاگامەندی لەگەڵ ویستدا هەیەتی پەیوەندییەکی هۆیەکی نیە. ئاگامەنی بۆ ویست هۆ نیە، بەڵکو هاندەر و ڕێگرە. لە هەر دوو حاڵەتەکەدا دەستگر و ڕێگە نیشاندەری ویستە. ئەگەر ئاگامەندی ئەم شێوە پەیوەندییەی بە ویستەوە نەبێت، ڕەوتی کوێرانەی ویست ڕوو لە لاساری و هەڵەشەیی دەکات.[79] بێجگە لەم شێوە پەیوەندییە، نیتشە لەو باوەڕەشدایە ئاگامەندی لە بەر ڕۆشنایی کایەکانی ویستی هێزدا دەناسرێت. بە بێ کایەکان و دەرهێنانی ئاگامەندی لە نێویاندا ئاگامەندی نیە و پێناسە ناکرێت. ئاگامەندی بەو کایانەوە گرێدراوە و ناچارکراوە. کەوابوو، ئاگامەندی بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی لە بوونی تاکدا نیە و دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و هۆکردی کایەکانی ویستی هێزە.[80] ئەمەش دیسانەوە بوونی تاکی ئاگامەند بەرەو کۆڵانی دەرنەچووی ناچارەکی دەبات و

77- Friedrich Nietzsche. *The Genealogy of Morals*, p. 191.
78- Friedrich Nietzsche. *Twilight of the Idols*, p. 62.
79- Friedrich Nietzsche. “Beyond Good and Evil”, in *Basic Writings of Nietzsche*, p. 231.
80- Friedrich Nitetzsche. *The Gay Science*, p. 298.

ڕۆڵی داهێنەرانەی ئەو بوونە دەخاتە پەراوێزەوە، کە هەوڵی بوون بەرزی و دامەزراندنی ویستی هێزی خۆی سەربەستانە دەدات.

بیروباوەڕی نیتشە لە ناکۆکی و ئاڵۆزی بەدەر نیە. لە لایەکەوە بۆ ئەم بیریارە ویستی هێز سەربەستە و لە لاکەی دیکەوە ئاگامەندی گەمارۆی دەدات و دەبێت بە ڕێگری سەربەستییەکەی. لە لایەکەوە ئاگامەندی لە هەموو کاریگەرایەتییەکی مێتافیزیکی دوور خراوەتەوە و نە بەستراوە بە بنەڕەتێکی نادیار و نەگۆڕوە، لە لاکەی دیکەوە بوە بە هۆکردی کایەکانی ویستی هێز و دیاردەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. بە بۆچوونی من، دەتوانین، تاکو ڕادەیەک بەرگری لە بیروڕاکەی نیتشە بکەین و لە ناکۆکی و ئاڵۆزییەکەی دوور بخەینەوە، بە تایبەتی لەو خاڵەدا کە ویستی هێز بە سەربەست و ناچار دادەنێت. تەوقکردنی ویستی هێز لە ئاگامەندییەوە داگیرکردنێک لە لایەن هێزێکی دەرەکییەوە نیە. لەبەر ئەوەی ئەم دووانە یەک سەرچاوەی ئۆنتۆلۆجییان هەیە داگیرکردنەکە دەبێت بە خۆ-داگیرکردن. ئەمەش لە خۆیدا سەربەخۆییە. بەڵام، کە مامەڵە لەگەڵ ئاگامەندی، وەکو هۆکردی کایەکانی هێز دەکەین کێشەکە ئاڵۆز دەبێت و توێژینەوەکەی نیتشە ئاگامەندی دەخزێنێتە نێو سترەکچەری مێژوویی و کۆمەڵایەتییەوە. سترەکچەرەکە ئاگامەندی ناچار دەکات و ڕێگەی (ڕەتکردن) و پەرەسەندنی دەگرێت. مرۆڤی بەرز، کە خاوەنی ئاگامەندی و ویستی هێزە، لە نێو کۆمەڵدا دەژی بەڵام مندالّی سەردەمەکەی نیە و بەرەو داهاتوو دەڕوات. هۆکردی کایەکانی هێز نیە و داهێنەرە.

ئەگەر ئاگامەندی بەو شێوەیەی نیتشە باسی دەکات بە سترەکچەری

کایەکانەوە گرێدرابێت و کایەکان گۆڕانکاری بەسەردابهێنن چۆن مرۆڤی بەرز لە دایک دەبێت؟ ئەو مرۆڤە چۆن دەتوانێت سەردەمەکەی ڕەت بکات و لە داهاتوودا بژی؟ چۆن مرۆڤی ئازاد لە نێو زیندانی سترەکچەری کۆمەڵایەتییدا سەرهەڵدەدات؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لەوێدا پەیدا نابن و دەست ناکەون ئەگەر ئاگامەندی بکەین بە زادەی کایەکانی هێز و ئاوەڕ لە سەربەخۆیی و تەوانای ڕەتکردن و داهێنانی نەدەینەوە. تاکو ئەو شوێنەی نیتشە لەمەڕ مرۆڤی بەرز دەدوێت سەربەستی ئاگامەندی و دەستەڵاتی ڕەتکردن و داهێنانی پارێزراوە و جەختی لە سەر کراوە. بەستنەوەی ئاگامەندی بە کایەکانی هێزەوە ویستی مرۆڤ ناچار دەکات و سەربەستییەکەی لێ زەوت دەکات. گەیشتن بە بەرزی پێویستی بەڕەتکردنی سترەکچەر و دەرچوون لە نێو دۆگمای ئەشکەوت هەیە. ئەم ڕەتکردن و دەرچوونەش نەک سەربەستی مرۆڤ مسۆگەر دەکات بەڵکو بە بێ سەربەستی ڕوو نادات. جەختکردن لە سەر سەربەستی مرۆڤیش نکۆڵیکردن لە سترەکچەر و کایەکانی هێز نیە. ئەوەی دەمەوێت ئاماژەی بۆ بکەم و لێرەدا چارەسەری بکەم دوور کەوتنەوەمانە لەو ئاڵۆزی و ناکۆکییەی نیتشە توشی بووە. دروستە تاک بە بێ کۆمەڵ ناژی و لە نێو کایەکانی هێز و تۆڕی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندایە، بەڵام دەتوانێت ئەو سترەکچەرە ڕەتبکات و ببێت بەو مرۆڤە بەرزەی نیتشە بە شوێنیدا دەگەڕێت. ڕەتکردن هاوکات ڕەتدانەوەی سترەکچەرەکەیە. دەرچوون لە ئەشکەوت ڕووخانی دۆگمای ئەشکەوتە. ژیانی مرۆڤی بەرز ڕەتکردن و ڕەتدانەوەیە نەک چەقین و وەستان لە نێو سترەکچەر و کەلتووری نێو ئەشکەوتەکە. بەرزێتی لەم هەڵوێستە ڕادیکاڵەوە سەر هەڵدەدات و نزم بوونیش چەقینە لە نێو سترەکچەر و ڕازی بوونە بە ژیانی نێو ئەشکەوت. لە دایکبوونی

مرۆڤی بەرز لەگەڵ ئەم هەڵوێستە ڕادیکاڵانەدا دەستنیشان کردنی شێوازێکی بوونە، کە لە بوونی مرۆڤێکی نزمەوە جیاوازە. ئەم جیاوازییە لێرەدا، کە دوو جۆر مرۆڤایەتیشمان بۆ دیاری دەکات، (مرۆڤایەتی بەرز) و (مرۆڤایەتی نزم)[81] بۆ خەسڵەتی زکماکی و بنەڕەتێکی مێتافیزیکی ناگەڕێتەوە. بەرزێتی خەسڵەتێک نیە مرۆڤ پێوەی هاتبێتە جیهانەوە، یان مۆرکێکی گیانەکی نیە بەڵکو ڕووداوێکی فینۆمینۆلۆجی مێژووییە.[82] ئەوەی مرۆڤ بەرز و نزم دەکات سەقامگیر کردنی ویستی هێزێتی بۆ ڕەتکردن و ڕەت دانەوە. بەرزێتی مرۆڤ جوان و گەورە دەکات و نزمێتی ناشرین و بچوکی دەکات. بەرزێتی مرۆڤ بەرەو داهاتوو دەبات و نزمیش دەی کات بە منداڵی سەردەمەکەی. بەم جۆرە لە بیروباوەڕی نیتشەدا دوو جۆر مرۆڤی نایەکسان و جیاواز هەن، کە هەر یەکێک لەم جۆرانە خەسڵەتی خۆیان هەیە و بە یەکدی ناگەن. یەکسانی لە بەر ڕۆشنای بیروباوەڕەکەی نیتشەدا ئەفسانەیەکی (ئایینی)یە و دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونێکی مێتافیزیکی ڕووناکبینانە. لەو بیرۆکە ئایینییەوە هاتۆتە کایەوە، کە هەموو مرۆڤێکی بە منداڵی خوا ناوزەد کردووە. خوا، وەکو باوکێک جیاوازی لە نێوان منداڵەکانیدا ناکات. بەڵام نیتشە بکوژی ئەو باوکەیە و ڕوخێنەری ئەفسانەی یەکسانییە "لە بەردەم خوادا هەموومان مرۆڤین. بەڵام خوا مردووە، ئێمە بەرابەر و یەکسان نین."[83]

81 - Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p.517.

82 - نیتشە زاراوەی فینۆمینۆلۆجی بەکار نەهێناوە و من بەرانبەر زاراوەی ئۆنتۆلۆجی لە نووسراوەکانمدا دامناوە. بۆ نموونە دەڵێین مرۆڤ لە بنەڕەتە ئۆنتۆلۆجییەکەیەوە سەربەستە چونکە (هۆ) یەکی مێتافیزیکی بۆ بوونی نیە، بەڵام لە ڕووی فینۆمینۆلۆجییەوە (لە نێو کۆمەڵ و مێژوودا) دەشێ سەربەست نەبێت و بوونی داگیر کرابێت.

83 - Friedrich Nietzsche. *Thus Spake Zarathustra*, p. 276.

له دایکبوونی مرۆڤی بەرز سەرهەڵدانی جیاوازییەکانە، داهێنانی کەلتوورێکی بەرزە، کە لە کەلتووری بازاڕیی مرۆڤی نزم جیاوازترە و دژوەستاوە. مرۆڤی بەرز بانگەشەی یەکسانی ناکات چونکە بڕوای بە ئەفسانە نیە. بوون بۆ ئەو جیاوازییە و ژیانە بە جیاوازییەوە لە نێو جیاوازییەکاندا. نایەکسانی وجیاوازییەکان لە نێوان مرۆڤە تاکە بەرزەکانیشدا حوکم دەکەن. ویستی هێزی مرۆڤە بەرزەکان بۆ سەقامگیرکردنی دەستەڵات و گەیشتن بە داهاتوویەکی ڕووناکتر وەکو یەکدی نین. هەر تاکە خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی. تایبەتمەندیەکەی دەبێت بە بنەڕەتی جیاوازی ئەو لەگەڵ تاکەکانی دیکەدا. سووربوون لە سەر مانەوەی تایبەتمەندییەکە ڕەسەنیەت بە بوون دەدات. بە پێچەوانەی ئەم شێوەیەی بوونەوە، لە نێو ئەشکەوتەکەدا مرۆڤە نزمەکان و شوێنکەوتوانی کەلتوورە بازاڕییە باوەکە هەوڵی لەناو بردنی جیاوازییان داوە و ئەفسانەی یەکسانی بووە بە ڕاستی داکەوتەکەیان. نامۆ بوونیان و دۆڕاندنی تایبەتمەندییەکەیان و وازهێنان لە ڕەتکردن و ڕەتدانەوە دەبن بە خەسڵەتەکانی بوونیان، لاسایی کردنەوە بۆ ئەوان داهێنان و هونەرە و مەزنی شارستانیەتیش لە ڕابردوودا دەبینن و شانازی پێوە دەکەن. مرۆڤی نزم کەسێکی نامۆیە و دۆگمای نێو ئەشکەوت بە سەرییدا زاڵە و بوارەکانی بیرکردنەوەی داهێنەرانەی لێگیراوە.

# بەشی چوارەم
# هیچگەرایەتی و هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەتی هەمەکی بۆ بەهاکان

لەم بەشەی توێژینەوەکەمان لەو خاڵە گرنگە دەکۆڵینەوە، کە چۆن مێتافیزیکی هیچگەرایەتی لە بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشەدا بە تەنیا ڕوخێنەر نیە. وەکو هیچگەرایەتییەکەی شۆپنهاوەر ڕەشبینانە تەماشای ژیان ناکات. ئەمەش بە بیروڕای من کێشەیەکی گرنگ و سەرەکییە لە فەلسەفەی نیتشەدا پێویستە بە قوڵی لێیبکۆڵینەوە تاکو بزانین لە چی ڕوویەکەوە ئەم شێوە هیچگەرایەتییە لە فەلسەفەی ڕەشبینی شۆپنهاوەر دوور دەکەوێتەوە و دەبێت بە بیروباوەڕێکی فەلسەفی بەرنامە ڕێژو کردەگی. ئێمە لە پێشتر، لەگەڵ توێژینەوەکەمان لەمەڕ بوونی مرۆڤی بەرز چەند جارێک ئاماژەمان بۆ ئەم لایەنە گرنگ و گەشبینینەی بۆچوونەکانی نیتشە کردووە. ئاشکرایە، کە بە بێ هیچگەرایەتی بەرنامەڕێژ و کردەگەرایەتی ناتوانرێت باسی مرۆڤی بەرز و داهاتووی مرۆڤایەتی بکرێت. بەڵام لەمەش گرنگتر مامەڵە کردنی نیتشەیە لەگەڵ کێشەی ئاکار و بەهاکاندا، کە بۆچوونی هیچگەرایەتی بۆ ئەو دیو یان پاش هیچگەرایەتی دەبات.[84]

---

٨٤- من زاراوەی پاش- هیچگەرایەتیم لە پەرتووکێکی دیکەدا (بوون و داهێنان) بۆ هەمان بۆچوونی فەلسەفی بەکار هێناوە. هیچگەرایەتی نیتشە و بوونخوازەکانم (وەکو هایدیگەر و سارتەر) پێهەڵسەنگاندووە. بڕوانە: محەمەد کەمال، بوون و داهێنان، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤ . لاپەڕە ١٧٥ .

هیچگەرایەتی پێویستیەکی مێژووییە لە پەرەسەندنی بیروباوەڕی فەلسەفیدا. لە هەمانکاتدا ئەگەر گەشبینانە مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێت، ئەم شێوەی بیرکردنەوەیە دەبێت بە مەترسیەکی گەورە.[85] مەترسی گەورە لە وێدایە، کە هیچگەرایەتی بە تەنیا هێزێکی ڕووخێنەربێت و نەبێت بە بەرنامەڕێژ .لەم ڕوانگەیەوە ڕووخاندنی مێتافیزیکی ڕووناکبیرانە و هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەتە هەمەکییەکان و بێبەهاکردنی بەهاکان لە پێناوی دامەزراندنی بەرنامە و بنەڕەتێکی نوێیە بۆ بەهاکان. لێرەدا نیتشە و هیچگەرایەتییەکەی شۆپنهاوەر و فەلسەفە ڕەشبینیەکە ڕەتدەکەن و واتایەکی نوێ بە بوون دەدەن و لەو واتا نوێیەوە دەستەیەک بەهای نوێ دادەمەزرێنێت. بەڵام ئەو پرسیارەی یەخەمان دەگرێت ئەوەیە، کە سەرچاوەی ئەو دەستە بەها نوێیانە چییە و چۆنە؟ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا حەز دەکەم جیاوازی نێوان ڕەوشت (Ethics) و ئاکار (Morality) ڕوون بکەمەوە. مەبەست لە ڕەوشت ئەو تاقمە بەهایەیە لە دەرەوە (چی لە ڕێگەی ئایینەوە یان نەریتی کۆمەڵایەتییەوە) بە سەر تاکەکانی کۆمەڵدا چەسپاوە و چاوەڕوان دەکرێت تاکەکان پەیڕەوی بکەن. بۆ نموونە ئەگەر لە کەلتوورو نەریت و باوەڕی کۆمەڵێکدا گۆشت خواردن قەدەخە کرا بێت، لە کاتێکدا تاکێکی ئەو کۆمەڵە سەرکێشی دەکات و گۆشت دەخوات، بە بێ ڕەوشت یان خراپەکار ناوزەد دەکرێت. لە ژیانێکی ڕەوشتییدا تاکەکان خزێنراونەتە نێو سترەکچەری دەستەیەک بەها و چاکە و خراپەش بە گوێرەی شوێن کەوتن و لادان لەو سترەکچەرە پێناس دەکرێت. لە نێو سترەکچەری ڕەوشتدا، کە تاکەکان خاوەنی نین، بەهاکان بە هەمەکی و نەگۆڕ دادەنرێن. چەند گرێکانی سترەکچەرەکە توند کرابێتن ئەوەندەش

85 - Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 3.

تاکەکان بە گوێرەی بەرنامەی سترەکچەرەکە هەڵسوکەوتدەکەن و مامەڵە لەگەڵ یەکدی دەکەن. بە بێ دەربڕینی ویست و ئارەزووی خۆیان دەبن بە پارچەیەک لەو سترەکچەرە و شوێن بەها باوەکان دەکەون. لە ژیانی ڕەوشتییدا مانەوە و شوێن کەوتنی بەهاکان گرنگە و تاکەکان کراون بە قوربانی سترەکچەرە ڕەوشتییەکە. بە پێچەوانەی ژیانی ڕەوشتانەوە ئاکار وابەستە بە هەڵبژاردنی تاک و بڕیاردانی تاک لە سەر چاکە و خراپە. تاکێک دەتوانێت لە ڕەوشت یاخی بێت و بەها باوەکان ڕەتبداتەوە. بەڵام ناتوانێت بێ بەها بژی. لێرەدا کێشەی پاش هیچگەرایەتی ڕوون دەبێتەوە و نیتشە لە بەرنامە فەلسەفییەکەیدا لە هەڵوەشاندنەوەی بەهاکانەوە بۆ دامەزراندنی جۆرێکی دیکە لە بەها دەڕوات و بێ بەهایی لە لای دەبێت بە بەهایی و ڕوخاندنیش بە دامەزراندن. مرۆڤی بەرز ڕووخێنەری سترەکچەری بەها ڕەوشتیە سەپێنراوەکانە. سترەکچەری بەهاکان لە پێناوی داهێنانی بەهادا دەڕوخێنێت. ئەو بەهایەی مرۆڤی بەرز شوێنی دەکەوێت سەرچاوەیەکی دەرەکی نیە و خۆی دایهێناوە. بێجگە لە خۆی بوونێکی دیکە نیە بڕیار لە سەر چاکە و خراپە بدات. لەم ڕووەوە، مرۆڤی بەرز کەسێکی بێ ڕەوشتە بەڵام بێ بەها و بێ ئاکار نیە. بێ ڕەوشتی بۆ ئەو هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانەیە چونکە دەیەوێت سەربەست بێت و ڕەسەنانە بژی. بەڵام کەسێک نیە جیاوازییەکانی نێوان چاکە و خراپە نەزانێت. لە بەر ئەمە مرۆڤە نزمەکان خۆیان بە ڕەوشتدار دادەنێن. کوێرانە شوێن بەها باوەکان کەوتوون و خۆیان تەسلیمی دۆگمای نێو ئەشکەوتەکە کردووە. مرۆڤی بەرزیش بە بێ ڕەوشت لە قەڵەم دەدەن. بۆ مرۆڤی بەرزیش ئەو مرۆڤە نزمانە گومڕا و نامۆن. هێزی داهێنانیان دۆڕاندووە و ژیانیان بووە بە لاسایی کردنەوە. ئەوان خاوەنی ڕەوشتن بەڵام

بێ ئاکارن. لە بەر ڕۆشنایی ئەم بۆچوونەوە کەسێکی بێ ڕەوشت یاخی و خۆناسە و دەیەوێت خۆی لە سترەکچەری بەها باوەکان یان ڕەوشت ڕزگار بکات و ببێت بەوەی خۆی دەیەوێت.

سەرچاوەی بەها ڕەوشتیەکان بەرز و نەگۆڕە .ئەمەش خەسڵەتێکی هەمەکی یان گشتگری بە بەهاکان بەخشیوە. ئەم بۆچوونەش لە بیرکردنەوەی فەلسەفیانەدا بۆ مێتافیزیکی ڕووناکبین و ئایینەکان دەگەڕێتەوە. شوێنکەوتوانی ئەو شێوە مێتافیزیکییە لە سوکراتەوە هەوڵیانداوە زەمینەیەکی نەگۆڕ و هەمەکی بۆ بەهاکان دامەزرێنن و بۆ ئەم کارەش دەستەڵاتی بەها داهێنانیان لە مرۆڤ سەندووە و بە بوونێکی بەرز و تەواوکۆ و نەگۆڕیان بەخشیوە. بەهاکان، لەم بۆچوونەوە، بە پیرۆز و نەگۆڕ ناسراون و تاکەکان بۆیان نەبووە یان نەیانوێراوە گۆڕانکارییان بەسەردا بهێنن و ڕەتیان بدەنەوە. نموونەی بەردەستیش (دە) فەرمانە خواوەندییەکەی نێو تەورات و دواجاریش بیردۆزە ڕەوشتیەکەی )کانت(ە لە سەردەمی ڕۆشنگەرییدا.[86] مەبەستیش لە بەهای هەمەکی ئەوەیە، کە لە هەموو کات و شوێنێکدا ئەو بەهایە دەچەسپێت واتای خۆی ون ناکات. ئەگەر (ڕاستگۆیی) بە بەهایەکی هەمەکی دابنرێت ئەوا پێویستە مرۆڤ هەمیشە لە هەموو هەڵوێست و کردەوەیەکیدا ڕاستگۆ بێت و درۆ نەکات چونکە ڕاستگۆیی لە خۆیدا چاکە و درۆ کردنیش خراپە.

پرۆژەی هەڵوەشاندنەوەی بەها هەمەکیەکان و ڕەوشت لای نیتشە

---

86- لێرەدا دە فەرمانەکەی نێو (تەورات)م بە نموونە هێناوەتەوە. لە هەموو ئایینێکدا دەستەیەک بەهای ڕەوشتی چەسپاو و هەمەکی هەیە.

لەو خاڵەوە دەست پێناکات، کە بەهاکان چۆن لە هەموو کات و شوێنێکدا دەچەسپێن بە بێ ئەوەی ڕۆڵی خۆیان نەبینن. لەبەر ئەوەی پرۆژەکەی نیتشە فەلسەفییانەیە و هەڵوێستێکی ڕەتدانەوەی ڕادیکاڵە بنەرەتی ئەو بۆچوونە مێتافیزیکە دەدۆزێتەوە و لەوێوە دەست بە هەڵوەشاندنەوە دەکات. هەموو کۆڵەکە وەستاوەکانی بەهاو زانین و ڕاستی هەمەکی لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەتە مێتافیزیکییەکە هەرەس دەهێنن و بە سەردەمێک دەگەین، کە بێ بەهایی و نەزانین و نا-ڕاستی یەخەمان دەگرێت. ئێمە لە بەردەم لێپرسینەوە و ڕۆڵێکی مێژووییدا بۆ دامەزراندنی بەها و زانین و ڕاستی قوت دەکاتەوە. ئێمەی مرۆڤ، نەک بوونێکی تەواو کۆ یان سەدەمێکی هۆشەکی لە پێشتر، دەبین بە داهێنەری بەهاکان. لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی سەرچاوە مێتافیزیکییە هەمەکییەکەدا بەهاکان خەسڵەتی هەمەکی خۆیان دەدۆڕێنن و دەبن بە بەهایەکی هەندەکی، کە بۆ کات و شوێنێکی تایبەت دەگونجێن و بە بەردەوامی دەگۆڕێن. بەهایەک لە مرۆدا چاک بێت لە سبەینێدا خراپ دەبێت، بەهایەک لە شوێنێکدا چاکە دەشێ لە شوێنێکی دیکەدا خراپ بێت یان ئەوەی بۆ تاکێک چاکە بۆ تاکێکی دیکە خراپە. نرخ و واتای بەها کانیش تاکەکان بڕیاری لەسەر دەدەن و ئەو واتاو نرخە لە دەرەوەدا هێزێکی دەرەکی لە پێشوەختدا ئامادەی ناکات. پێوەری چاکە و خراپە لە ئاسمانەوە دەکەوێتە سەر زەوی و مرۆڤ و ویستی مرۆڤ دەبێت بە سەرچاوەکەی .ڕێژەگەرایەتی جێگەی ڕەهاگەرایەتی و گۆڕانیش جێگەی وەستان دەگرێتەوە. بەهاکان دەبن بە کاتی و ڕێژەیی. هەڵوەشاندنەوەی سترەکچەری بەها ڕەوشتییەکان تاکەکان لە ئاستی لێپرسینەوەیەکی مێژووییدا ڕادەگرێت و لێرەدا نیتشە ڕۆڵی گرنگی مرۆڤی بەرز و فەیلەسوفمان بۆ ئاماژە دەکات. لە

یەکێک لە نووسراوەکانیدا دوو جۆر فەیلەسوفی دەستنیشان کردووە و یەکەمیان لە دووەمیان گرنگترە.
یەکەم، ئەو فەیلەسوفەیە باوەڕی بە داهێنانی بەهای نوێ هەیە. دووەمیش ئەوەی بەها لە پێشتر دراوەکان دەسەپێنێت.[87] جۆری یەکەم ئەو فەیلەسوفەیە لە ڕوانگەیەکی هیچگەرایەتییەوە میتۆدی هەڵوەشاندنەوە بەکار دەهێنێت. دەبێت بە پێشەنگی کاروانی گۆڕانکارییەکان و پەرەسەندنی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە و ژیانی ئاکاری. جۆری دووەم ئەو دەستە و گروپەیە شوێن مێتافیزیکی ڕووناکبین دەکەون و بەهاکان و زانین و ڕاستی بە سەرچاوەیەکی بەرز و نەگۆڕەوە دەبەستنەوە و ویستی تاکەکانیش بەستراکچەرێکی هەمەکی لە پێشترەوە گرێدەدەن و سەردەمێکی هۆشەکی بۆ ئامادە دەکەن. ئەم دەستە و گروپە ئەو فەیلەسوفە هۆشەکیگەرانەن، وەکو سوکرات و ئەفلاتون و ئەریستۆ، مەبەستێکی لە پێشتردراو بە بوون دەدەن و نکۆڵی لە ڕۆڵی مرۆڤ لە داهێنانی بەهاکاندا دەکەن و سەربەستییەکەی ڕەتدەدەنەوە و دەیخزێننەوە ناو سترەکچەرێکی هەمەکی لە پێشتر.

لەم بۆچوونەوە هیچگەرایەتی بە تەنیا هەڵوەشاندنەوەی بنەڕەت و پوچەڵکردنی بەهاکان نیە. پرۆژەیەکی فەلسەفی بەرنامەگەریشە، کە نیتشە بە کردەوە و بەرنامەیەکی قۆناخیی بۆ گواستنەوەی بیرکردنەوەی فەلسەفیانە بە پێویستی دەزانێت.[88] هەڵوەشاندنەوەش، لەبەر ئەوەی پرۆژەیەکە لە پێناوی دامەزراندنی شتێکی باشتردا، لە نێو پەرەسەندنی ژیاندا ئەو پرۆسەیە بەردەوامە و لە قۆناخێکدا

87- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, pp. 509-510.
88- هەمان سەرچاوە. لاپەڕە، ١٠.

ڕاناوەستێت. هەڵوەشاندنەوە لە پێناوی دامەزراننددا بیرکردنەوەی فەلسەفیانە و بەها ئاکارییەکان لە قۆناخێکەوە بۆ قۆناخێکی دیکە دەگوێزێتەوە و بە بەردەوامی گۆڕانکارییەکان دەهێنێتەکایەوە. جەختکردنی نیتشە لە سەر ئەم پەیوەندییەی نێوان هەڵوەشاندنەوە و دامەزراندن کالایەکی دیکە بە بەری هیچگەرایەتیەکەیدا دەکات. خۆی لەو ڕەخنە و پەلاماردانانە دەپارێزێت، کە ئاڕاستەی هیچگەرایەتی دەکرێن و هیچگەرایەتی بە بێهودە و بێ بەرنامە و گومڕایی دەدەنە قەڵەم. ئەو خاڵەش گرنگە ڕەچاو بکرێت، کە هیچگەرایەتی بەرنامەڕێژی داوای دامەزراندنی بەرنامەیەکی ئاکاریی کۆمەڵایەتی ناکات. ئەوەی لەم بیرکردنەوە هیچگەرایەتییەدا گرنگە و ئاوڕی لێدراوەتەوە بوونی مرۆڤە، وەکو تاک. مرۆڤ، هەر چەندە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و لەگەڵ کەسانی دیکەدا دەژی، بوونێکی تایبەتمەندی هەیە. کەسێکی تاکە و بە ڕێگەی سەقامگیرکردنی ویستی هێزییەوە پەرەدەسەنێت و خۆی بەو شوێنە بەرزە دەگەیەنێت، کە نیتشە بانگەشەی دەکات.[89] لەم پرۆسەی پەرەسەندنەدا هەموو مرۆڤێک، وەکو تاکێک بە تەنیا بە سەر چیای ژیاندا هەڵدەگەڕێت و لە لوتکەیەکەوە خۆی بە لوتکەیەکی بەرزتر دەگەیەنێت. لە بۆچوونی کۆمەڵناسانەی نیتشەدا، کە لایەنێکە هێشتا لێکۆڵینەوەی قوڵ و توێژینەوەی ئەکادیمی لە سەر نەکراوە تاکەکان، وەکو ئەتۆمەکان سەربەخۆ و تایبەتمەندن. سووربوون لە سەر تایبەتمەندێتی و پەرەسەندن یان وازهێنان لەو تایبەتمەندێتییە و بە نامۆبوون لە ویستی تاکەکاندایە. لەم ڕووەوە دوو ڕێگا لە

89- شوێن یان شوێنی بەرز لێرەدا بەکارم هێناوە، مەبەستم (جێگا) نیە، بەڵکو قۆناخێکی بەرزی پەرەسەندن و پێشکەوتنە لە بووندا. بۆ نموونە ئاژەڵ لە ڕووەک و مرۆڤیش لە ئاژەڵ بەرزترە. لەنێو مرۆڤە تاکەکانیشدا تاکێک لەوی دیکە بەرزترە یان دەگاتە ئەو قۆناخەی بوون، کە نیتشە بە بەرزی دادەنێت.

بەردەم مرۆڤدا دانراوە: سەربەستی و کۆیلایەتی. ئەو کەسانەی دەبن بە (سوپەرمان) سەربەستن و کەسانێکیش لە نێو سترەکچەرێکی لە پێشتر و دەرەکیدا خزێنرابن بەو سترەکچەرە ڕازیبن ئەوا کۆیلەن و بوونێکی نزمیان هەیە.

ئەوەی لێرەدا گرنگە باسبکرێت، پاش گەڕانەوەی ئاکار و بەهاکان بۆ ڕێژەگەرایەتی، واتا بەخشینە بە بەهاکان. ئێمە چۆن لە واتای بەهاکان بگەین ؟ یان بەهاکان چی واتایەکیان هەیە و چۆن هەڵ دەسەنگێردرێن ؟ ئێمە چۆن بزانین بەهایەک لە بەهایەکی دیکە چاکترە؟ کێ ئەو بڕیارەی لە سەر دەدات؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە لە بەر ڕۆشنایی بیرکردنەوە فەلسەفییەکەی نیتشەدا کارێکی ئاسان نیە. نیتشە لە نووسراوەکانیدا ڕاستەوخۆ و ئەکادیمی لەم کێشانە نادوێت و ناچارمان دەکات لە واتای مێتافۆرەکانی بکۆڵینەوە و چەند نووسراوێکی بخەینە بەردەستمان. یەکێک لەو نووسراوانەی (**On the Genenlogy of Morals**) و دووەمیان (**The Will to Power**) سێیەمیان (**Beyond Good and Evil**) ە، کە لە چەند شوێنێکدا لەم نووسراوانەیدا مامەڵەی لەگەڵ ئەم کێشانە داکردووە. بۆ ئەوەی کێشەکە زیاتر لە بەردەم خوێنەردا ڕوونبێتەوە بەهاکان دەخەمە بەردەم دوو بیردۆزی ئاکاری لە فەلسەفەدا. یەکەمیان ئەو بیردۆزەیە یەبە (دیۆنتۆلۆجی) Deontology ناوزەد کراوە و بیریارانی، وەکو کانت و شاگردەکانی شوێنی کەوتوون. لەم بیردۆزەیەدا بەها ئاکارییەکان، بۆ نموونە چاکە کردن، لە خۆیدا چاکە و تاکەکان دەبێت بە بێ بیرکردنەوە لە ئاکامەکەی پەیڕەوی بکەن. ئەگەر ڕاستگۆیی بەها بێت، هەر چەندە ئەنجامەکەشی لە هەندێ بارودۆخدا خراپە یان دەشێ زیانمەند بێت ئەوا پێویستە هەمیشە ڕاستگۆ بین چونکە ڕاستگۆیی بەهایەکی چاکە. لە لایەکی دیکەوە،

بیردۆزەی ئەنجامگەرایەتی Consequentialism کە بیریارانی، وەکو ستیورات میل و جێرمی بێنتم بانگەشەی دەکەن، بیر لە ئەنجامی هەڵگرتن و بەکارهێنانی بەهاکان دەکەنەوە و ئەنجامەکە بڕیار لە سەر چاکە و خراپەی بەهاکە دەدات. لەم لایەنەوە، ئەگەر ڕاستگۆیی بۆ کەسێک ئەنجامێکی خراپی هەبوو ئەوا لەو بارودۆخەدا ڕاستگۆیی بەهایەکی خراپە.

بە بۆچوونی من، بیروڕاکانی نیتشە لە لایەکەوە سەر بە بیردۆزی یەکەم و لە لاکەی دیکەشەوە سەر بە دووەمن. نیتشە لەو باوەڕەدایە، کە بەهاکان وابەستن بە بارودۆخی ژیانەوە[90] یان بەهاکان هۆکردی بارودۆخی ژیانن لە پێناوی مانەوە و بەردەوامبوون بە ژیان داهێنراون.[91] لەبەر ڕۆشنایی ئەم بیروڕایانەدا دەتوانین توێژینەوەکەمان بە بیردۆزی ئەنجامگەرایەتییەوە ببەستینەوە و لە ئەنجامی سەپاندنی بەهاکانەوە بە ژیانەوە چاکە و خراپەیان هەڵسەنگێنین. ئەگەر بەهایەک بۆ ژیان زیانمەند بێت بەهایەکی خراپە و دەبێت هەڵبوەشێنرێتەوە. بەڵام پێویستە ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، کە مەبەستمان لە چاکی بەها بۆ ژیان چییە؟ چی شتێک واتای چاکە بە بەها دەبەخشێت؟ ئەو چاکەیەی لێرەدا بە بەهاکانی دەبەخشین (ژیان)ە. ژیانیش بەو جۆرەی لە پێشتر باسمان کرد خولەی بایەلۆجی و تێپەڕبوونی (کات) نیە،[92] بەڵکو (ویستی هێزە). بەهاکان ڕاستەوخۆ وابەستن بە ژیانەوە و لە خزمەتکردنی

90- Friedrich Nietzsche. *The Genealogy of Morals*, p. 140.
91- Friedrich Nietzsche. "Beyond Good and Evil", in *Basic Writings of Nietzsche*, p. 201.

92- ئەم (کات)ە ی لێرەدا باسیدەکەم کاتی بوونی مرۆڤە نەک کاتێکی ماتماتیکی یان فیزیکی.

ویستی هێزدان. بەهایەک لەوێدا چاکە، کە ببێتە هۆی پەرەسەندن و سەقامگیرکردنی ویستی هێز. بۆ ئەم مەبەستە نیتشە دەڵێت، "بێجگە لە هێز و چەندییەتی هێز ژیان بەهای دیکەی نیە."[93] یان "چی پێوەرێکمان بۆ بەها هەیە؟ چەندییەتی و پەرەسەندنی هێز."[94] هاوکات جوانی و چاکی ژیان بە پێچەوانەی ناشرینی و خراپی مردنەوە بە ویستی هێز دەبەخشێت، چونکە ژیان ویستی هێزە و هەمیشە چاکە. کەوابوو، دەگەینە ئەو ئاکامەی بڵێین (ویستی هێز)هەمیشە و لە خۆیدا شتێکی چاکە و چاکەکەش بەهایەکی نەگۆڕە. ئەمەش لەو بۆچوونەی (کانت)ە وە نزیکە، کە (ویستی چاک) Good Will بە چاکەیەکی نەگۆڕ دادەنێت و لەم بۆچوونەوە بیردۆزە ئاکارییەکەی نیتشە دەبێت بە دیۆنتۆلۆجی و (کانت) ی. نیتشە، وەکو کانت، هەوڵی نەداوە پێشمەرجی ئۆنتۆلۆجی و زەمینەی نەگۆڕ بۆ ئاکار دامەزرێنێت. بەڵام دەتوانین ئەم ڕاڤەکردنە بۆ بۆچوونەکەی بکەین و لە ڕوانگەکانیەوە بڕوانینە کێشەی ویستی هێز و بەهای چاکەی ئەو ویستە. بەڵام هێشتا کێشەی پەیوەندی نێوان ویستی هێز و چاکە بە ئاڵۆزی ماوەتەوە و ئەو خاڵەمان نەسەلماندووە، کە چۆن ئەو پەیوەندییە زەروری و هەمەکی نیە. هاوکات ئەوەشمان لا ڕوونە، کە هیچ پەیوەندییەک لە بەستێنی مێتافیزیکی هیچگەرایەتییەوە بە زەروری و هەمەکی دانانرێت. دەگونجێت ویستی هێز نەبێتە سەرچاوەی چاکەکردن و بۆ ڕوخاندن و پەلاماردان بەکاربهێنرێت. چۆن دڵنیابین لەوەی ویستی هێز بۆ ڕوخاندنی ژیان ناخرێتە گەڕ؟ لە بەر ئەوەی مرۆڤی بەرز بکوژی خوا و یاخییە لە سترەکچەرە دەرەکییە بە سەردا سەپێنراوەکان، ویستی

93- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 37.

94- هەمان سەرچاوە. لاپەڕە ٣٥٦

هێزی لە ژوور چاکە و خراپەوەیە. خۆی دەبێت بە پێوەری بەهاکانی و خۆشی بڕیار لە سەر نرخی ئەو بەهایانەدا دەدات. تاکە ڕێگە چارەیەک بۆ مەترسی لە بەکار هێنانی ئەو هێزە لە لایەن ئەم جۆرە مرۆڤەوە (زانین)ی مرۆڤەکەیە. ئەو کەسێکە بە ڕاستییەکانی دەرەوەی ئەشکەوتەکە گەیشتوە و جوانی و چاکە لە ژیان و پەرەسەندنی ژیاندا دەدۆزێتەوە. هەرچ بەهایەک دژی ژیان بێت و بناخەی ژیان بڕوخێنێ بە خراپی دادەنێت.[95] نیتشە باوەڕی بە مرۆڤی بەرز هەیە و ئەو بە سەرچاوەی چاکەکردن و مرۆڤی نزمیش بە بەرهەمهێنەری خراپە و کەلتووری بازاڕی ناوزەد دەکات.[96] مرۆڤی بەرزیش بە ئاگا دەهێنێتەوە، کە هێزی خۆی بۆ خراپەکردن نەخاتە گەڕ و دژی ژیان یان بۆ ڕووخاندنی ژیان بەکارینەهێنێت و دەڵێت، "ئەوانەی دژی دڕندەکان دەوەستن و جەنگیان لەگەڵدا دەکەن نابێت لە ئاکامدا خۆیان ببن بە دڕندە."[97]

پاش ئەم شیکردنەوەیە ئەو پرسیارەی لە لای خوێنەر خۆی

---

95- لە پێشتر بیروڕای نیتشەم لە سەر ئایین باسکرد. ئەو خاڵەم ڕوونکردەوە، کە ئایین بۆ نیتشە دژوەستانە بەرانبەر ژیان و ڕوخێنەرێتی. بە بۆچوونی من فرۆید، هەر چەندە ئامازەی بۆ نیتشە نەکردووە، لە نووسراوەکەیدا لە سەر شارستانیەت سودی لە نیتشە کردووە. ئێمە ناتوانین ئەوەش بسەلمێنین کە فرۆید نیتشەی نەناسیوە چونکە (سەلۆمی)، کە پێشتر هاوڕێی نیتشە بووە و نیتشە خۆشی ویستوە، لە دواییدا بووە بە هاوڕێ ی فرۆید. فرۆید لە ڕێگەی ئەم ژنە شاعیرەوە ئاگای لە بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشە بووە. بۆ نزیکی بۆچوونەکەی فرۆید لە نیتشەوە بڕوانە :
Sigmund, Freud. *Civilization and its Discontent*, translated by Leo New York: Penguin Books, 2002. P. 22. Bersani,

96- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 350

97- Friedrich Nietzsche. "Beyond Good and Evil", in *Basic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, p. 279.

دەسەپێنێت ئەوەیە، کە لە چی ڕوویەکەوە بۆچوونەکەی نیتشە نوێیە؟ ئێمە لەوەوپێش ئەوەشمان ڕوون کردەوە، کە نیتشە دژی بناخەگەرییە و بانگەشەی ڕێژەگەرایەتی دەکات. بەڵام ڕێژەگەرایەتی لە پێش نیتشەدا لە لایەن پرۆتاگۆراس و جۆرجیاسەوە باسکراوە و کێشەیەکی نوێ نیە. نیتشە بە دامەزرێنەری ڕێژەگەرایەتی دانانرێت. بە بیروڕای من بۆچوونە ئاکارییەکەی نیتشە لە دوو ڕووەوە نوێیە: یەکەم لەو ڕووەوە، کە بەهاکانی بە داهێنراو یان دەستکردی مرۆڤ داناوە و دووەمیش لە نێو قاڵبێکی نەگۆڕ و چەقیودا نەیچەسپاندون و بە دینامیکی و گۆڕاو دایان دەنێت. لێرەدا دوو کاتیگۆری بۆ ڕاڤەکردنی چییەتی بەهاکان دێنەپێش. یەکەمیان کاتیگۆری (پەیدابوون) و دووەمیان (پەرەسەندن)ە. دیسانەوە لە پێش نیتشەدا بیریارانی وەکو هیراکلیدس و هیگڵ ئەم دوو کاتیگۆرییەیان بەکارهێناوە، بەڵام نیتشە چۆنیەتی بەکارهێنانەکەی جیاوازە و دەبێت لە بەر ڕۆشنایی مێتافیزیکە هیچگەرایەتییەکەیدا ئەم جیاوازییە بناسرێت. لە سیستەمە مێتافیزکییەکانی هیراکلیدس و هیگڵدا پەیدابوون و پەرەسەندن بە سترەکچەرێکی مێتافیزیکی لە پێشترەوە گرێدراون و ئەو سترەکچەرەش سەر بە دەستەڵاتێکی ڕەها و هۆشەکی، وەکو (لۆگۆس Logos ) یان (گایست Geist )ە. لۆگۆس و دەستەڵاتی ڕەهای ئەو هەموو هەبوویەک و ڕووداوێک پەیدا دەکەن و پەرەی پێدەسەنن. دەستەڵاتی ڕەهای لۆگۆس (بوون) دەخزێنێتە نێو سترەکچەرێکی لە پێشتر دامەزراودا و هەبووەکان و ڕووداوەکان بۆ گۆڕانکارییەکان (پەیدابوون و پەرەسەندنیان) پەیڕەوی بەرنامە دامەزرێنراوەکەی نێو سترەکچەرەکە دەکەن. نیتشە لە سەرەتاوە بوونی لۆگۆس و سترەکچەرێکی لە پێشتر دامەزرێنراو بۆ بوون ڕەتدەداتەوە. ئەمەش جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان بۆ چوونەکانی نیتشە و بەکارهێنانی

(پەیدابوون و پەرەسەندن) لەگەڵ بۆچوونەکانی هیراکلیدس و هیگڵ دیاری دەکات. پەیدابوون و پەرەسەندنی بەهاکان یان سیستەمێکی ڕەوشتی کۆمەڵ پێکهاتەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتییە و لە ئاکامی (پێویستی)یەکی کۆمەڵایەتییەوە نەک دەستورێکی ئاسمانییەوە سەریهەڵداوە و بە نەمانی پێویستییەکەش واتای بەهاکە ناپێویست دەبێت. لەم بۆچوونەوە، بەهاکانی مرۆڤی بەرز و هەموو بەهایەک و سیستەمێکی ڕەوشت لە کۆمەڵدا دیاردەیەکی مێژوویی یە. پەیدابوون و پەرەسەندنیان لەسەر(پێویستی) ڕادەوەستێت، کە بەڕای نیتشە ئەو پێویستییە کەم کردنەوەی دەستەڵاتی تاک و ڕێگرتن لە و دەستەڵاتەیە لە پێناوی دەستەڵاتی دەستە و تاقمێکی کۆمەڵ. ئاکامی ئەمەش، کە دامەزراندنی سیستەمێکی ڕەوشتییە، ڕاستەوخۆ بۆتە هۆ بۆ داگیرکردنی دەستەڵاتی تاک و قوربانیدان بە سەربەستییەکەی. ئەو سیستەمە ڕەوشتییەش، کە دەستە و تاقمێکی کۆمەڵ بە خۆ فەرزکردن بە سەر کۆمەڵدا بۆ سەرکوتکردنی تاک سەقامگیریان کردووە، بووە بە نەرێتی باو و یاسا و ڕەچەڵەکی حەرام و حەڵاڵ کردن لە ژیانی کۆمەڵدا. بۆ ئەوەی سیستەمە ڕەوشتییەکە زیاتر دەستەڵاتی تاک خەفە بکات و لە ناوی بەرێت، ئەو دەستە و تاقمە ڕەچەڵەکی حەرام و حەڵاڵ کردنەکە بۆ دەستەڵاتێکی مێتافیزیکی نادیار دەگەڕێننەوە و شەرعییەتی ئایینی پێدەدەن و بەهاکانی بە پیرۆز و هەمەکی دادەنێن. سەقامگیرکردنی ئەم سیستەمە دەبێتە هۆی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی ڕەوشتی، کە تاکەکان ناتوانن سەرکێشی بکەن. هاوکات ئەو کۆمەڵگایە داخراوە و تاکەکان تیایدا چەوساونەتەوە و سەربەستییەکەیان دۆڕاندووە. کۆمەڵگایەکی زوڵمکەر و بێ بەزەییە و ڕێگاکانی داهێنان و پەرەسەندنی بیرکردنەوە دەبەستێت.

پێویستی و بەرژەوەندییەکانی تاکەکان و چینەکانی کۆمەڵ جیاوازن و یەک جۆر سیستەمی ڕەوشتی دانامەزرێنن. ئەم جیاوازییەی پێویستییەکان و بەرژەوەندییەکان جیاوازی نێوان سیستەمە ڕەوشتیەکانیش دەسەپێنێت. فەرمانکەر و فەرمانلێکراو، داگیرکەر و داگیرکراو، خاوەن کۆیلەو کۆیلە، سەربەست و چەوساوە بۆچوونیان بۆ ژیان و بەها ڕەوشتییەکان جیاوازە. بەڵام جیاوازییەکان فینۆمینۆلۆجییانەیە نەک ئۆنتۆلۆجییانە و بنەڕەتێکی زەروری پێنەدراوە. ئەو بارودۆخەی تاکێک دەکات بە داگیرکەر و تاکەکەی دیکەش بە داگیرکراو مێژوویی و دروستکراوە و قابیلی گۆڕانە. دەشێ تاکێک لە یەکەم ڕۆژی پەیدابوونیەوە بوونی داگیر بکرێت یان لە نێو خێزانێکی کۆیلە و چەوساوەدا لە دایک ببێت، بەڵام ژیانی داگیرکراو و کۆیلایەتییەکەی لە هەڵبژاردنی ئەودایە. ئەو دەتوانێت کۆیلایەتی یان سەربەستی هەڵبژێرێت و چارەنووسی خۆی بگۆڕێت .بوون بە کۆیلە زەرورەتێکی ئۆنتۆلۆجی نیە و ڕووداوێکی مێژووە. لەگەڵ شیکردنەوەی سیستەمی ڕەوشتی کۆمەڵایەتییدا بە گوێرەی شێوازی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و دابەشکردنی کۆمەڵ بۆ دوو دەستە و تاقم یان مارکس گوتەنی بۆ دوو چین، نیتشە خۆی لە فەلسەفە کۆمەڵایەتییەکەی هیگڵ نزیکدەکاتەوە و سودی لێوەردەگرێت. وەکو هیگڵ لەمەڕ دوو جۆر بوون دەدوێت: داگیرکەر و داگیرکراو یان خاوەن کۆیلە و کۆیلە. بەڵام بەکارهێنانەکەی نیتشە لە تەفسیر کردنە ڕەوشتییەکە نەچۆتەدەرەوە و باسی سەرچاوەی ناکۆکی و جیاوازییەکە و ڕۆڵی کارکردن و بەرهەمهێنان ناکات. بەو شێوەیەی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی چینە چەوساوە و چەوسێنەرەکان جیاوازە، بەها ڕەوشتیەکانیشیان بە گوێرەی پێویستیەکانیان دەگۆڕێن. واتای چاکە کردن لە داگیرکەرێکەوە

بۆ داگیرکراو وابەستە بە بەرژەوەندی و پێویستی هەر یەکێک لەو چینانەوە. ناکرێت ئەم جیاوازییانە داپۆشرێت و چاویان لێبپۆشرێت. لەم داکەوتە کۆمەڵایەتییەوە و لە بەر ڕۆشنایی پێویستیەکانی دوو جۆر بوونی مرۆڤ دوو سیستەمی جیاوازی ڕەوشتی خۆیان دەسەپێنن. سیستەمی یەکەمیان، کە هەنبانەی بەهاکانی کەسانی خاوەن دەستەڵات و داگیرکەرانە نوێنەرایەتی ڕەوشتی خاوەن کۆیلە دەکات و دوومیان ئەو دەستە و کۆمەڵە بەهایانە دەگرێتەوە، کە کەسانی بێ دەستەڵات و داگیرکراو یان کۆیلەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان دایان مەزراندووە.[98] بۆ نموونە کەسانی خاوەن دەسەڵات ئازایەتی و شەڕەنگێزی بە چاکە دادەنێن و ئەوانەی بێ دەستەڵاتن داوای بەزەیی و لێبوردن دەکەن. لەم ڕوانگەیەوە هەموو ئەو بەها ڕەوشتییانەی پێناسی چاکەکردن دەبەستن بە دەستەڵات و ئازایەتی و جەنگەوە سەر بە سیستەمی ڕەوشتی خاوەن کۆیلەن و بە پێچەوانەی ئەمەشەوە بەهاکانی، وەکو بەزەیی و لێبوردن دەبن بە ناوەڕۆکی سیستەمی ڕەوشتی کۆیلایەتی. دامەزراندنی ئەم دوو جۆرە سیستەمە ڕەوشتییە لە نێو هەموو کۆمەڵێکدا هەیە چونکە کۆمەڵێک بە بێ جیاوازیی دەستەڵات لە نێو تاکەکاندا پەیدا نەبووە. شارستانیەت نەگەیشتۆتە ئەو قۆناخەی تاکەکان بە یەکسانی تیایدا بژین و بەختەوەربن. لە هەموو قۆناخەکانی شارستانییەتدا دوو جۆر بوونی جیاوازی مرۆڤ فینۆمینۆلۆجییانە سەریهەڵداوە و یەکێک لەو بوونە بۆتە هۆی چەوساندنەوە و بە نامۆکردنی بوونەکەی دیکە و پەیوەندییەکی دژایەتی و بارودۆخی ئابووری و ڕامیاری نایەکسانیان دامەزراندووە. ئەو پرسیارەی لێرەدا یەخەمان دەگرێت ئەوەیە، ئایا مرۆڤی بەرز(سوپەرمان) سەر بە چی سیستەمێکی

98- Friedrich Nietzsche. “Beyond Goog and Evil”, in *Basic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, p. 394.

ڕەوشتە؟ ئایا کەسێکە خاوەن کۆیلە یان کۆیلە؟ ئەم پرسیارە لە سێ ڕووەوە بە نێگەتیڤانە وەڵام دەدرێتەوە. ئێمە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، کە مرۆڤی بەرز بێ ڕەوشتە، واتە سەر بە سیستەمێکی ڕەوشتی نیە چونکە ئەو سیستەمە خاوەنی سترەکچەرێکی دەرەکییە و بە سەر تاکدا فەرز کراوە. ئێمەش لەگەڵ دابەشکردنی سیستەمی ڕەوشتدا بە سەر خاوەن کۆیلە و کۆیلەدا لە ئاکار نادوێین. خاوەن کۆیلە و کۆیلە خاوەن ڕەوشتن بەڵام بێ ئاکارن. مرۆڤی بەرز بێ ڕەوشتە بەڵام خاوەنی ئاکارە. لەبەر ئەمە توێژینەوەکەمان لە سەر ڕەوشت و سیستەمە ڕەوشتییە باوەکانی کۆمەڵ مرۆڤی بەرز ناگرێتەوە. لە سەروو ئەمەشەوە جیاوازییەکی دیکەی گرنگ و بنەڕەتی لە نێوان مرۆڤی بەرز و خاوەن کۆیلە و کۆیلەدا هەیە، کە پێویستە جەختی لە سەر بکرێت. مرۆڤی بەرز لەگەڵ سەقامگیر کردنی ویستی هێز و پەرەسەندنی بوونیدا کەسێکی دیکە نا چەوسێنێتەوە. ئەو ڕزگارکەرێکی مرۆڤایەتی و پێغەمبەری سەربەستییە. دژی ئەو هێز و سترەکچەرانە دەجەنگێت، کە بوونی مرۆڤ داگیر دەکەن. مرۆڤی بەرز، لە ئەنجامی ئەم چونیەتییەی بوونی نە خاوەن کۆیلەیە و نە کۆیلەشە. تاکێکی سەربەست و ئازادیخوازە و دژی هەموو فۆرمێکی چەوساندنەوەیە. لە پێشتریش باسمان کرد، کە بە بیروڕای نیتشە کەسێک دژی چەوساندنەوە ڕاوەستێت و شەڕ لەگەڵ دڕندەکان بکات، نابێت لە ئەنجامدا پاش ڕووخاندنی داگیرکەرەکە خۆی جێگای بگرێتەوە و ببێت بە چەوسێنەر یان دڕندەیەکی دیکە. سیستەمی ڕەوشتی خاوەن کۆیلە و کۆیلە، هەر چەندە جیاوازن کاریگەرێتی نەرێ و نالەبار دەکەنە سەر ژیان و بەرەو پێشەوەی نابەن. ئەو دوو جۆرە سیستەمە ناشرین و نەزۆکن. هەرچ بەهایەکیش ناشرین بێت و دژی ژیان و پەرەسەندنی

ژیان ڕاوەستێت ویستی مرۆڤی بەرز نابێت بە داخوازی. ویستی هێزی مرۆڤی بەرز هەمیشە هەوڵی پەرەسەندنی ژیان و لەناوبردنی ناشرینی دەدات. لە ژوور حەز و ئارەزووی خاوەن کۆیلەوەیە و بەها ئاکارییەکانیشی لە ژوور سیستەمە ڕەوشتییەکانەوەیە. ئەمەش لێرەدا ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی کەلتوورە بازاڕییە زاڵبوەکە لە لایەن مرۆڤی بەرزەوە دیاری دەکات. پەرەسەندنی ژیانیش لە سەر ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی مرۆڤە بەرزەکەوە یان کەسە ئازادکراوەکەی نێو ئەشکەوتەکەوە ڕادەوەستێت و دەکەوێتە گەڕ. ڕەتدانەوە و ڕەتکردن، کە دوو کاتیگۆری بنەڕەتی مێتافیزیکی هیچگەرایەتی نیتشەن، دەبن بە دوو خولە بۆ گالیسکەی مێژوو. گۆڕانکارییەکانی مێژوو لەم زەمینە و لەم دینامیکیتییەوە سەر هەڵدەدەن. سیستەمە ڕەوشتییەکانی خاوەن کۆیلە و کۆیلە سترەکچەرێکی لە پێشتر دامەزرێنراون. بە زۆر بە سەر تاکەکاندا سەپێنراون. هەردووکییان سەر بەو کەلتوورە بازاڕییەن، کە سوورە لە سەر نامۆکردنی تاکەکان و ڕێگە گرتن لە ویستی هێزی ئەوان. خاوەن کۆیلە، بۆ نموونە نامۆکردن و نامرۆڤکردنی کۆیلە بە ئازایەتی و سەقامگیرکردنی هێزی خۆی دادەنێت. کۆیلەش یان ئەو تاکەی تەسلیمی کەلتووری بازاڕی بووە و نامۆکراوە شوێنکەوتنی کەلتوورەکە و مل کەچ کردن لە ئاستی دەستەڵاتی داگیرکەردا لە بەر ڕۆشنایی بەهاکانی، وەکو لێبوردن و ئاشتیخوازی لێکدەداتەوە و نکۆڵی لە ناوەڕۆکی مرۆڤایەتی خۆی دەکات. لە هەردوو حاڵەتەکەدا، چی لەگەڵ نامرۆڤ کردنی کۆیلە لە لایەن خاوەن کۆیلەوە، یان نکۆڵی کردنەکەی کۆیلە لە ناوەڕۆکی مرۆڤانەی خۆی، ئەوەی کراوە بە قوربانی و لە ناوبراوە (ویستی هێز)ە، کە هاوکات بۆ نیتشە ناوەڕۆکی بوونی مرۆڤە و سەرچاوەی ژیانە. خاوەن کۆیلە و کۆیلە، لەگەڵ دامەزراندنی

سیستەمە ڕەوشتییەکانیاندا (ویستی هێز) یان (ژیان) ڕەتدەدەنەوە و مرۆڤایەتیش لەگەڵ ئەم ڕەتدانەوەیەدا ناوەڕۆکی خۆی دەدۆڕێنێت. ئەوەی لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا وونە، لە ڕوانگەی ئەم بۆچوونەوە، پێویستییە ئابوورییەکان نیە. مرۆڤ لە ڕژێمێکی چینایەتییدا بە تەنیا برسی و ڕووت نیە، بەرهەمەکەی لە لایەن کەسێکی دیکەوە تالآن نەکراوە، بەڵکو لە مرۆڤایەتیش دابڕاوە و کەسێکە بێ ناوەڕۆک. کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، تاکو بەم شێوەیە بمێنێتەوە، چەند لە ڕووی تەکنەلۆجیا و بەرهەمهێنانەوە (گۆڕانکارییە چەندەکییەکان) ڕوو لە زۆری بکات، بە بێ ناوەڕۆکی مرۆڤانە و مرۆڤایەتی دەمێنێتەوە. کۆمەڵگایەکە، کە تاکەکان تێدا نامۆن و نارەسەنن و کراون بە کەلوپەل و کوێرانە شوێن بەها باوەکان و کەلتوورە بازاڕییەکە و سترەکچەرە لە پێشتر دامەزرێنراوەکەدا کەوتوون. مرۆڤی بەرز، کە لە نێو ئەم کۆمەڵەوە سەر هەڵدەدات، کەسێکە بە پێچەوانەی تاکەکانی نێو ڕەوەکەوە شوێن سیستەمی ڕەوشتی ڕەوەکە و کەلتووری باوی ڕەوەکە ناکەوێت. کەسێکە ناوەڕۆکی مرۆڤانەی خۆی ناسیوەتەوە و دەیەوێت مرۆڤایەتی ڕزگار بکات. ئەو ئومێدێکە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە مێژووییە. ئەو گۆدۆیەیە گەڕانەوە بۆ نێو ئەشکەوتەکە و هەڵوەشاندنەوەی سترەکچەری نێو ئەشکەوتەکە بە پرۆژەیەکی فەلسەفی دادەنێت.

جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان ئاکاری مرۆڤی بەرز و دوو سیستەمە باوە ڕەوشتییەکاندا هەیە، کە ناکۆکیش لە نێوانیاندا پەیدا دەکات. ناکۆکی و جیاوازیشیان دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندییان بە ژیان و پەرەسەندنی ژیانەوە یان سەقامگیر کردنی ویستی هێز و سەربەستی تاکەکان. ئاکار لای مرۆڤی بەرز لغاوکردن و بەستنەوەی حەز و

ئارەزووەکانی تاک نیە و شورای سترەکچەرێکی لە پێشتر بە دەوری ویستی هێزدا هەڵنابەستێت. دەربڕینێکی سەربەستانەی ویستە و بڕیاردانە لەسەرخۆ-ڕەتکردن و گەیشتن بە داهاتوو. ئەم دوو خەسڵەتە لە سیستەمە ڕەوشتییەکاندا نابینرێن و بە پێچەوانەوە سیستەمە دامەزرێنراوە ڕەوشتییەکان بەرانبەر خۆ-ڕەتکردن و گەیشتن بە داهاتوو دژانە ڕادەوەستن و جەخت لە سەر زەرورەت و گرنگی بەهاکانی دوێنێ و ئەمڕۆ دەکەن. گۆڕانکاری و ڕێژەگەرایەتی بە خۆیانەوە ناگرن. تاکەکانیش لەگەڵ هەموو جیاوازییە کانیاندا پەیڕەوی ئەو سیستەمە دەکەن. گەڕانەوە بۆ ڕەهاگەرایەتی و نکۆڵی کردن لە گۆڕان و ڕێژەگەرایەتی ڕەتدانەوەی ڕاستییە بنەڕەتییەکانی بوونە و باوەڕنەکردنە بە جیاوازی و دینامیکیەت و پەرەسەندنی بوون. سیستەمی ڕەوشت، لەم ڕووەوە، لە هەرچ سەرچاوەیەکی کۆمەڵایەتییەوە سەری هەڵدابێت، ئابووری یان ئایینی، دژی ژیان و پەرەسەندنی ژیانە. ئاکار لە خزمەتگوزاری ژیاندا کار دەکات. ئەگەر مرۆڤی بەرز بگاتە ئەو باوەڕەی بەهایەکی ئاکاری زیان بە ژیان و پەرەسەندنی ژیان دەگەیەنێت ئەو بەهایە هەڵدەوەشێنێتەوە و بڕیار لە سەر داهێنانی بەهایەکی چاکتر دەدات. هەڵوەشاندنەوە و دامەزراندنی بەها ئاکارییەکان پرۆسەیەکی بەردەوامی خۆ-ڕەتکردن و ڕەوتە ژوورکێشییەکەی ژیانە. بۆ مرۆڤی بەرز هیچ بەهایەکی دەرەکی و هەمەکی و نەگۆڕ نیە. بەها ئاکارییەکان زادەی کات و شوێنی خۆیانن و بۆ پەرەسەندنی ژیان داهێنراون.[99] لێرەدا دەگەینە ئەو ئاکامەی، کە ئاکار سەر بە سیستەمێک نیە چونکە سیستەم پێویستی بە سترەکچەرێکی لە پێشتر هەیە. دامەزراندنی سترەکچەریش هۆیە بۆ تەسک کردنەوەی بوارەکانی سەربەستی و داهێنان. لە کاتێکدا

99- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 168.

دژی سترەکچەر ڕادەوەستین و هەڵی دەوەشێنینەوە، ناگونجێت هەوڵی دامەزراندنی سترەکچەرێکی دیکە بدەین. سەربەستی مرۆڤ لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی سترەکچەرێک و دامەزراندنی سترەکچەرێکی دیکەدا مسۆگەر ناکرێت. بۆ مسۆگەرکردنی سەربەستی پێویستە خۆمان بەو دیو سترەکچەر بگەیەنین و لەمەڕ ئاکار و بەها ئاکارییەکان، نەک ڕەوشت بدۆیین. دامەزراندنی سترەکچەرێکی ڕەوشتی ڕەتدانەوەی سەربەستی و خەفەکردنی تاکەکانە. بۆچوونە ئاکارییەکانی نیتشە لەم بەستێنەوە مێتا-سترەکچەرە یان ئاکارێکی لە سترەکچەربەدەرە. لە لایەکی دیکەوە ئەوەی بڕیار لە سەر چاکە و خراپەی بەهایەکی ئاکاری دەدات داگیرکەر یان داگیرکراو نیە. چونکە بەهای ئاکاری لە دەرەوەی سترەکچەرێکی ڕەوشتیدایە. مرۆڤی بەرز خۆی دەبێت بەو پێوەرە و واتا بە بەهاکە دەبەخشێت. ئەمەش بەها ئاکارییەکان دەکات بە جۆرە بەهایەک لەو دیو پێوەری چاکە و خراپە ڕەوشتییەکان و بە مێتا- بەها یان بەهای ئەودیو چاکە و خراپە دایاندەنێت.[100] خاڵێکی گرنگی دیکەش لە کۆتاتی ئەم بەشەدا دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە، یەکێکە لەو ئاکامانەی لە توێژینەوەکەماندا پێی گەیشتوین. ئەوەیە، کە یەک جۆر ئاکارمان نیە. چەندییەتی بەها ئاکارییەکان و ژمارەی ئاکارەکان دەکەونە سەر ژمارەی مرۆڤە بەرزەکان. مرۆڤی بەرز کەسێکی تاکە و سەر بە هیچ چین و ئایینێک نیە. نە خاوەن کۆیلەیە و نە کۆیلە. لە بەر ئەمە ئاکارەکان فرەن. هەر یەکێک لە مرۆڤە بەرزەکانی کۆمەڵ خاوەنی ئاکاری خۆیەتی. ئەمەش ڕێگە لەوە ناگرێت، کە دوو یان

100- نیتشە پەرتووکێکی بە ناوی (ئەو دیو و چاکە و خراپە) نووسیوە و هەمان مەبەستیشی هەیە چونکە بەهاکانی مرۆڤی بەرز ناکەونە نێو چوارچێوەی سترەکچەری ڕەوشتییەوە.

چەند مرۆڤێکی بەرز پەیڕەوی یەک جۆر بەهای ئاکاریی بکەن. بەڵام ئەم هاوبەشییە لە بەهادا بڕیاردانێکی سەربەستانەیە چونکە مرۆڤی بەرز کەسێکی دیکە داگیر ناکات. بەهاکانی خۆی بە سەر کەسانی دیکەدا بە زۆر ناسەپێنێت.

# بەشی پێنجەم
# نیتشە و میتافۆر

نیتشە بیروباوەڕە فەلسەفییەکانی لە گەلێک شوێندا بە میتافۆر Metaphor دەربڕیوە.[101] میتافۆر شێوازێکی دەربڕینە تێدا بە هۆی دۆزینەوەی لێکچونی وشەکە یان بابەتە باسکراوەکە لەگەڵ وشە و بابەتێکی دیکەدا واتاکەی نیشان دەدرێت. لە هەموو زمانێکدا میتافۆر بەکاردێت، بەڵام لە ئەدەبدا بەتایبەتی هۆنراوە میتافۆر ڕۆڵێکی سەرەکی لە ڕوون کردنەوەی واتای وێنە هونەرییەکاندا هەیە. بۆ نموونە (مەحوی) دەڵێت،

وەک بولبول ئەو دڵە بە گوڵی ڕوو کە ڕوو دەکا
پەروانەیە، زیارەتی شەمع ئارەزوو دەکا[102]

لەم پارچە هۆنراوەیەدا (مەحوی) بە میتافۆر حەز و ئارەزووی خۆی بەرانبەر خۆشەویستەکەی دەربڕیوە. دڵی خۆی کردووە بە بولبول و ڕووی خۆشەویستەکەی بە گوڵ. بە ئەمەش ڕازی نەبووە و هەوڵیداوە شەوق و سوتانی خۆی بۆ خۆشەویستەکەی لە نێو میتافۆری مۆم

101- میتافۆر Metaphor وشەیەکی لێکدراوی یۆنانییە (metaphora) (مێتافۆرا): میتا meta واتە ئەو دیو یان دوای، pherein (فێرین یان فۆرما) گواستنەوە یان گوێزانەوەیە.

102- مەلا عەبدول کەریمی مودەریس، دیوانی مەحوی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٨٤.لاپەڕە ٢٥

و پەروانەدا دەربڕێت. شاعیر خۆی، وەکو ئەو پەروانەیە لە دەوری خۆشەویستەکەی دادەنێت، کە بە دەوری گڕی مۆمدا لە تاو عەشقی بۆ ئاگرەکە دەسوڕێتەوە و خۆی دەسوتێنێت.

گەلێک لە فەیلەسوفەکان لە مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا لەمەڕ میتافۆر دواون و واتاکەیان ڕوون کردۆتەوە. لە پێش هەموویانەوە ئەریستۆ هەوڵیداوە پێناسی بکات و لە واتاکەی بکۆڵێتەوە. بە دیدی ئەریستۆ میتافۆر ناونانی شتێکە، کە ئەو شتە خۆی ئەو ناوەی نیە، یان واتایەک بە وشەیەک دەدەین، کە ئەو وشەیە خۆی هەڵگری ئەو واتایە نیە.[103] هەروەها لەو باوەڕەدایە بەکارهێنانی میتافۆر نیشانەی ئاڵۆزی و تەمومژاوی بیرکردنەوەیە. لە کاتێکدا میتافۆر بەکار دێت، کە واتای وشەیەک یان بابەتێکی باسکراو نادیار و شاراوەبێت.[104] بیریارانی پاش ئەریستۆ ، بە تایبەتی ئەوانەی لە ئەدەب و هونەرەوە نزیکن لەگەڵ ئەریستۆدا هاوڕانین و میتافۆر بە شێوازێکی دەربڕینی گرنگ و خاوەن بەهای جوانی لە ئەدەبدا دادەنێن، بە تایبەتی لە هۆنراوەدا، کە بە بێ میتافۆر بەهای جوانییەکەی کەم دەبێتەوە. لە تیۆلۆجیشدا (خواناسی) میتافۆر جێگایەکی گرنگی هەیە. زۆر جار واتای خوایەتی و دەستەڵاتی خوایەتی بە میتافۆر دەردەبڕێت، بۆ نموونە "خوا باوکێکی بە دەستەڵاتە لە ئاسماندا".

ئەم لێکچونە لە نێوان دەستەڵاتی دوو بوونی جیاوازدا بۆ

---

103- Aristotle. *Poetics*, translated with an introduction by Malcolm Heath, London: Penguin Books, 1996. 576, p. 34.

104- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٣٧.

ڕوونکردنەوەی چییەتییەکەی بە میتافۆر ڕازاوەتەوە. ڕۆڵی سەرەکی میتافۆر، بێجگە لەوەی کاڵایاکی جوان بە فۆرمە ئەدەبییەکەدا دەکات، هاوکات پەیوەندی نێوان دوو شتی جیاوازمان بۆ دەردەخات یان ئاماژەی لێکچونی دوو شتی لێکنەچوومان بۆ دەکات.[105] لە پارچە هۆنراوەکەی (مەحوی) دا دڵی شاعیر و بولبول و پەروانە جیاوازن و ئەگەر لە نێو بەستێنی فۆڕمە هونەرییەکەدا دەربهێنرێن جیاوازییەکانیان دەردەکەون. بەڵام لەو شێوازە هونەرییەدا و لە بەرگی ئەو میتافۆرەدا ئاماژە بۆ لێکچونیان نەک جیاوازی نێوانیان کراوە. دڵ و پەروانە لەگەڵ ئەوەی دوو بابەتی جیاوازن و پەیوەندی ئۆنتۆلۆجییان لەگەڵ یەکدا نیە و بوونی یەکێکیان بە بێ ئەوی دیکە دەناسرێت، لەو هۆنراوەیەدا بە دوو شتی لێکچوو دانراون و ئەو لێکچوونەشیان لە خۆشەویستیدا دەرکەوتووە. تێگەیشتن لە دڵی شاعیر بەرانبەر خۆشەویستییەکەی بۆ خۆشەویستەکەی لە بەر ڕۆشنایی لێکچوونی سوڕانەوەی پەروانە بە دەوری ئاگری مۆم و سوتانی پەروانە بەو ئاگرە باشتر دەست دەکەوێت.

ئەو پرسیارەی یەخەمان دەگرێت و خۆی دەسەپێنێت سەبارەت بەکارهێنانی میتافۆر لای نیتشە ئەوەیە، بۆچی ئەم بیریارە بۆ دەربڕینی بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی پەنای بۆ میتافۆر بردوە؟ میتافۆر چی ڕۆڵێک لە فەلسەفەی نیتشەدا دەبینێت؟ پێش مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم کێشەیەدا پێویستە ئەو خاڵە ڕەچاو بکرێت، کە نووسینی فەلسەفی فرەشێوازە. نووسەریش سەربەستە بیروباوەڕی خۆی بە یەکێک یان چەند شێوازێکی نووسین دەربڕێت. باشترین

105- Alex Preminger. *Princeton Encyclopedia of Poetry and Poetics*, Princeton University Press, 1975. P. 490.

نموونەی بەردەستمان هۆنراوەی (عیرفانی) شاعیر و سۆفیەکانمانن، کە لەو بەرگە هونەرییەدا کێشە فەلسەفییەکانیان دەرخستوە. لە کۆنەوە بیروباوەڕی فەلسەفی لە هۆنراوەکانی مەلای جەزیری و ئەحمەدی خانێ و مەولەوی و مەحوی و گەلێکی دیکەش لە شێوەی هۆنراوە بە میتافۆر ڕازێنراوەتەوە. ئەم شێوازی دەربڕینە لەگەڵ شێوازی نووسینی (پەخشان) بە تایبەتی پەخشانی ئەمڕۆ، کە بۆ توێژینەوەی فەلسەفی بەکاردێت جیاوازە. حەزدەکەم نموونەیەکی دیکەی هۆنراوەیەکی (مەحوی) لە سەر ئەم کێشەیە بهێنمەوە،

لەسەر تۆم دوژمنە دنیا، قەزیییەم (مانع الجمع) ە
کە تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دنیا نەکەم چیبکەم[106]

مەحوی کێشەیەکی فەلسەفی لەم پارچە هۆنراوەیەدا لە فۆرمێکی هونەرییدا دەربڕیوە. هەروەها ناڕاستەوخۆ شارەزایی خۆی لە لۆجیکی ئەریستۆدا دەردەخات.

کێشەی (مانع الجمع) پەیوەندی بە یەکێک لە یاساکانی بیرکردنەوە لە لۆجیکی ئەریستۆدا هەیە. ئەم یاسایە دژی کۆکردنەوەی دوو لایەنی ناکۆک ڕادەوەستێت. ڕێگە بە بیر کردنەوە نادات لە نێو ناکۆکیدا بمێنێتەوە. مەحوی لە نێوان دوو لایەنی ناکۆکدا لەم پارچە هۆنراوەیەدا گیری خواردووە و ناتوانێت هەردووکیانی هەبێت . جیاوازی و ناکۆکییەکانی نێوان ئەو دوو لایەنەش (کە تەرکی تۆ نەکەم، تەرکی هەموو دنیا نەکەم) وابەستن بە بۆچوون و تێڕوانینی فەلسەفییانەی شاعیر بۆ (تۆ) و (دنیا). بەڵام بۆ ئەوەی لە ناوەڕۆکی

106 - مەلا عەبدول کەریمی مودەریس ، دیوانی مەحوی، لاپەڕە٢٣٢.

باسەکەم دوورنەکەومەوە نامەوێت زۆرتر لە سەری بڕۆم.[107] دەتوانین بڵێین یەکێک لەو هۆکارانەی نیتشەی بەرەو بەکارهێنانی میتافۆر بردبێت سەربەستی دەربڕین و نووسینە و گوێنەدانە بە نەریتی نووسینەوە لای نیتشە. گرتنەبەری ڕێگەیەکی جیاوازترە یان چەند ڕێگەیەکە بۆ دەربڕینی بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی. نیتشە لەم بارەیەوە دەنووسێت،

بۆ گەیشتن بە ڕاستی چەند ڕێگەیەکی جیاوازم بڕیوە.
بۆ بینینی ئاسۆ و گەیشتن بە لوتکە
چەند پەیژەم بەکارهێناوە.
. . .
ئەمە ڕێگەی منە. کوا ڕێگەی تۆ؟
خەڵکی ئەم پرسیارەم لێدەکەن .
منیش لە وەڵامدا دەڵێم : خاوەنی ڕێگە نیم .
زەردەشت وای گوت.[108]

---

107- سێ یاسای بیرکردنەوە لە سیستەمی لۆجیکی ئەریستۆدا هەن: یاسای ناسنامە (ئەگەر پرۆپۆزیشنێک ڕاست بێت ئەوا هەر ڕاستە.) یاسای ناکۆکی (ئەگەر پرۆپۆزیشنێک ڕاست بێت، ناڕاست نیە.) یاسای ناوەند وەر-نەگرتن (مانع الجمع) یان Excluded the Middle (پرۆپۆزیشنێک یان ڕاستە یان ناڕاست و نابێت هەردووکیان بێت.) بڕوانە: Irving M.Copi. *Introduction to Logic*, New York: The Macmillan Co., 1963. P. 271.

108- Friedrich Nietzsche. *Thus Spake Zarathustra*, Part lll, p. 190.
هەروەها بڕوانە:
Friedrich Nietzsche. “Ecce Homo”, in *Basic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufman, p. 721.

هۆکارێکی دیکەش لەمە گرنگتر و سەرەکیتر بۆ بەکارهێنانی میتافۆر دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی نیتشە لە ڕاستی و دەربڕینی ئەو ڕاستییە بە شێوەیەکی ڕەوان و بە بێ شێواندنی واتا و ناوەڕۆکی ئەو ڕاستییە. بەو جۆرەی من لە نیتشە تێدەگەم (زمان) و(نووسین) لە فەلسەفەکەیدا پەیوەندییەکی بنەڕەتییان بە ڕاستی بوونەوە هەیە. زمان بە تەنیا ئامێر بۆ بیر و ڕاگواستنەوە نیە و دەربڕینی ڕاستی بوونە. فەیلەسوف(هەروەها شاعیر) لە دەربڕینی ئەو ڕاستییەدا نابێت (زمان) ێکی نەگونجاو و ناڕێک، کە وشەکانی لە بازاڕدا سواون و دوورن لە ڕاستییەوە، بەکاربهێنێت. پێویستی زمانێکی نوێ خۆی دەسەپێنێت، کە ڕاستی بوونمان بە پڕی و تەواوی بۆ دەربخات و لە ژێر پەردەی وشە سواوەکانەوە ڕاستییەکە نەشارێتەوە. نیتشە نایەوێت ڕاستی بوون بە زمانی بازاڕی دەربڕێت و دەیەوێت لە نێو کاڵای زمانێکی هونەری(شیعری) بە میتافۆر بیرازێنێتەوە. بێگومان ئەمەش لەگەڵ بۆچوونەکەی ئەریستۆ بەرانبەر بەکارهێنانی میتافۆر و دەربڕینی ڕاستییە فەلسەفییەکان ناکۆکە، کە لە دواییدا دەگەڕێمەوە سەری. بۆ تێگەیشتنمان لەم بۆچوونەی نیتشە و پەیوەندییە بنەڕەتییەکە لە نێوان ڕاستی و زماندا دەبێت ئەو پرسیارە بکەین، ئەو ڕاستییە چییە نیتشە دەیەوێت لە زمانی بازاڕیی دوورخاتەوە و بە زمانێکی جیاوازتر دەریبڕێت ؟

لە ڕوونکردنەوەی مێتافیزیکی هیچگەرایەتی و پەیوەندی هیچگەرایەتی بە تراجی دیاوە بە درێژی واتای ڕاستی و بنەڕەتی بوونمان باسکردووە. پێویست ناکات جارێکی دیکە خۆمان بەم کێشەیەوە ماندوو بکەین. ئەوەندە دەڵێم ، کە ڕاستی و بنەڕەتی بوون، بە تایبەتی بوونی مرۆڤ، بنەرەتێکی هۆشەکی نیە و مرۆڤ

ئەو ئاژەڵە هۆشیارە نیە ئەریستۆ ئاماژەی بۆ کردووە. بوونی مرۆڤ، کە سەرچاوەکەی ویستی هێزە، لە ڕوانگەی کەلتووری دایۆنسیسە وە لە واتاکەی تێدەگەین. بوونێکە ڕسکاوە و حەز و ئارەزووە هەڵچوەکانی، نەک (هۆش) نوێنەرایەتی دەکەن. بە ڕێگەی زمان ئەو ڕاستییە دایۆنسیسە، کە ویستێکی ڕەوانە دەکەین بە کێشەیەکی فەلسەفی و دەری دەبڕین. پێویستە شێوەی دەربڕینەکە بە جۆرێک بێت ئەگەر بە تەواویش نەتوانێت ڕاستییەکەمان پێبناسێنێت تاکو ڕادەیەک خۆی لەو ڕاستییە نزیک بکاتەوە و واتاکەی دەربخات. ئەمەش کارێکی ئاسان نیە و فەیلەسوف توشی گرفت دەکات چونکە ڕاستییەکە ناوەکییە و زمانیش دەرەکی. وەرگێڕانی ڕاستی و ئەزمونی ناوەکی بۆ دیاردەیەکی دەرەکی بە زمان لای (هێنری برگسۆن)یش بووە بە کێشەیەکی فەلسەفی گرنگ، کە حەزدەکەم لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەم. سەرهەڵدانی ئەم کێشەیە لای برگسۆن هەمان هۆی هەیە. ئەویش، وەکو نیتشە ڕاستی بوون بە هێزێکی ناوەکی هەمیشە جوڵاو دادەنێت، کە لە نێو (کات)دا بە بەردەوامی لە پەرەسەندایە. بە پێچەوانەی ئەم ڕاستییە ناوەکی و کاتییەوە دەربڕین بە زمان ڕوودانێکی نێو (شوێن)ە. کات و شوێن دوو ڕەهەندی جیاوازی دوو ڕاستەقینەی جیاوازن (وەکو ئاگامەندی و ئەستو)، کە وەرگێڕانی ناوەڕۆکی یەکەمیان لە نێو بەستێنی دووەمیاندا توشی گرفتی نەپێکانی ئەو ڕاستییە دەکات.[109] بۆ نموونە کەسێک باسی (ژانە سەر)مان بۆ دەکات. ئەو کەسە هەست بەو ئازارە دەکات و لەم کاتەدا بەو ئەزموونەدا دەڕوات. ئازارەکەی لەناو سەریدا ئەزموون و هەستکردنێکی ناوەکییە، کە ئێمە لە دەرەوەی ئەودا نایدۆزینەوە.

109- Henri Bergson. *Introduction to Metaphysics*, translated by T. E. Hulme, Indianapolis: The Bobbs-Merrill Co., 1976. PP. 23-25 .

هاوکات، ناتوانین بچینە نێو ئەزموونی ئازارەکەی ئەو کەسەوە. ئەو دەتوانێت بە دوو ڕێگە ئەزموونەکەی دەربڕێت. ڕێگەی یەکەم بە نیشاندانی ماندووبوونی و زویری و تەنانەت گریان، کە ئێمە بەو باوەڕە دەگەیەنێت ئەو کەسە سەری دەیەشێت. لەم حاڵەتەدا، ئێمە دەزانین ئەو کەسە بە ئەزموونێکی ناخۆشدا تێدەپەڕێت، بەڵام نازانین ئەو ئەزموونە چییە. منداڵێک، کە ناتوانێت بە زمان لە ئازارەکەی بدوێت بە بێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە لە کوێی لەشیدا هەست بە ئازار کردن دەکات دەگری. لە ڕێگەی زمانیشەوە پەنا دەبەینەبەر (وشە) یان (واژەکان)ی نێو سەبەتەی زمان و وەکو هەموو ئەوانەی بەو زمانە دەدوێن، واژەکان بەکاردەهێنین. ئەو کەسە لە نێو سەبەتەی زماندا واژەی (ژانە سەر)مان بۆ دەردەهێنێت و بەو واژەیە لەمەڕ ئازارەکەی دەدوێت. ئێمەش ڕاستەوخۆ دەزانین ئەو کەسە هەست بە ئازاری سەر دەکات. بەڵام ئایا تاکو چەند تێگەیشتنەکەی ئێمە لە ئەزموونی ژانە سەری ئەو کەسەوە نزیکە ؟ چۆن بزانین ئەو کەسە لەو دەربڕینەدا ڕاستگۆیە؟ چۆن بزانین ئەو ئازارە چییە و چۆنە، لە کاتێکدا ئێمە لە نێو ئەزموونەکە دانین؟

بێگومان، ئێمە دەزانین ئەو کەسە باسی چی دەکات چونکە ئێمەش ئەو واژەیە بەکاردەهێنین. ئێمەش بە ئەزموونی ژانە سەردا تێپەڕیووین یان لەو کاتەدا ئێمەش لەگەڵ ئەودا سەرمان دەیەشێت. بەڵام چۆن دەزانین ئەزموونەکەی ئەو لەگەڵ ئەزموونەکەی ئێمەدا لێکدەچن و وەکو یەکن؟ بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە بێجگە لە زمان و نووسین چی دیکەمان لەبەر دەستدا نیە ببێت بە وەرگێڕی ئەزموونە ناوەکییەکان. زمان و نووسینیش بۆ نیتشە و برگسۆن ناتەواون. لەبەر ئەمەیە نیتشە پەنا بۆ میتافۆر دەبات. لەو

باوەڕەدایە میتافۆر دەتوانێت خۆی لەو ڕاستییە زیاتر نزیک بکاتەوە. لەسەرو ئەمەوە زمان، بە تایبەتی زمانێک وەکو سەبەتەی واژەکان نوێنەرایەتی ڕاستییەکە ناکەن. واژەی (ژانە سەر)، سەریەشە نیە. ئەزموونی سەریەشە شتێکی جیاوازترە لەو چەمک و واژەیەی بۆ ئاماژەکردنی ئەو ئەزموونە بەکارهێنراوە. کەوابوو، لە زماندا پەنا دەبەینە بەر شتێکی جیاوازتر لەو ڕاستییەی دەمانەوێت بیخەینە ڕوو. چەمکی (ژانە سەر)ی نێو زمان ئەزموونی (ژانە سەر) نیە کەسێک هەیەتی، بەڵکو نوێنەری ئەزموونەکەیە و نیتشە گومان لە دڵسۆزی نوێنەرەکەش دەکات. وا هەست دەکات، کە نەتوانێت ڕۆڵی بنەڕەتی خۆی لە ناسینی ڕاستییەکە بۆ ئێمە ببینێت.

نیتشە لە پەرتووکی (لە دایکبوونی تراجیدیا) گرنگی میتافۆری بۆ دەربڕینی ڕاستیی بوون باس کردووە. لەو خاڵەش دەدوێت، کە (مۆسیقا) بەرزترین شێوازی میتافۆرە و بە دروستی و ڕەوانی ڕاستیی بوونمان پێ دەناسێنێت. مۆسیقا نزیکترین و باشترین نوێنەری ڕاستییەکەیە. ئەو زمانە هەمەکییەیە ناوەڕۆکی ڕاستییەکەمان بۆ دەردەخات و بە ئەزموونەکانمانی دەگەیەنێت. لە بەر ئەوەی مۆسیقا میتافۆرێکی بەرز و ڕەوانە و ناوەڕۆکی ڕاستیی بوونمان بۆ دەردەخات، پێویستە دوو خاڵی گرنگ بەرانبەر مۆسیقا ڕەچاو بکرێن. یەکەم مۆسیقا بیر لە ڕادەی تێگەتشتن و حەزی بیسەر ناکاتەوە. دووەمیش، مۆسیقا زمانێکی بەرز و جوانە و دەربڕینێکی ڕاستەقینەی ڕاستییەکەیە و دەبێت لەگەڵ دەق یان چەمک و واژەکانی زماندا تێهەڵکێش نەکرێت.[110] نابێت مۆسیقا بۆ حەزی بیسەر و لە ئاستی تێگەیشتنی بیسەردا دابهێنرێت.

110- Friedrich Nietzsche. *The Birth of Tragedy*, p. 19.

ئەوەی بەرزێتی و نەمری بە مۆسیقا دەدات تێگەیشتن و حەزی بیسەر نیە و دەربڕینێکی ڕەوانی ڕاستی بوونە. مۆسیقا و هونەری شێوەکاری زمانن بۆ دەربڕینی ڕاستی بوون. ناگونجێت لەگەڵ شێوە زمانی وشە سازییدا تێکەڵ بکرێت. سەروەت سەوز بە تابلۆیەکی هونەری و بە ڕێگەی هێڵ و تێکەڵ کردنی ڕەنگەکانەوە ناوەڕۆکی ڕاستییەک دەردەخات. ئەگەر ئەم هونەرمەندە بیویستایە بە (وشە) ئەو ڕاستییە دەربڕێت پەنای بۆ هونەر نەدەبرد. لە بەر ئەمە، کە لە بەردەم تابلۆیەکی سەروەت سەوزدا ڕادەوەستین دەبێت هەوڵ بدەین لەو زمانە هونەرییە تێبگەین، کە پێدەوترێت بەرهەمی هونەری. داوا لە هونەرمەند نەکرێت لە سەر بەرهەمەکەی بدوێت چونکە ئەوەی هونەرمەند ویستویەتی دەریبڕێت لە بەرهەمەکەیدا هەیە.

نیتشە لێرەدا دژی تێهەڵکێش کردنی دەق و زمانی مۆسیقایە چونکە مۆسیقا خۆی زمانە و شێوەی دەربڕینە و پێویستی بە زمانێکی دیکە نیە لە دەربڕیندا یارمەتی بدات. ئایا سەروەت سەوز داوا لە نوسەرێکی وەکو ڕەوف بێگەرد دەکات چیرۆکەکانی خۆی بە تابلۆی هونەری نیشان بدات؟ ئەی بۆچی داوا لە سەروەت سەوز بکرێت واتای تابلۆ هونەرییەکانی بۆ ئێمە باس بکات؟ یان داوا لە ئەنوەر قەرەداخی بکرێت لەمەڕ پارچە مۆسیقایەکی بدوێت؟ چیرۆکەکانی ڕەوف بێگەرد و تابلۆکانی سەروەت سەوز و مۆسیقای ئەنوەر قەرەداخی سێ زمانی جۆراوجۆری دەربڕینن و هەر یەکێک لەو زمانانە لە ڕێگەی خۆیەوە ڕاستی بوون دەناسێنێت.

دژوەستانی نیتشە لە ئاستی تێهەڵکێشکردنی دوو جۆر زمانی دەربڕین (مۆسیقا و دەق) دەمانگەڕێنێتەوە بۆ کێشەی پەیوەندی

نێوان ئەم فەیلەسوفە لەگەڵ واگنەری مۆسیقاردا. مۆسیقا، کە زمانە، ڕاستەوخۆ و بە ڕەوانی ڕاستیی بوون دەردەبڕێت. ئەو ڕاستیەش بنەڕەتێکی هۆشەکی نییە و حەز و ئارەزوویەکی ڕەوانە و وزەیەکی دایۆنسیسە. لە بەر ئەمە مۆسیقا کاریگەرێتییەکی ڕاستەوخۆی بە سەر بوونی مرۆڤەوە هەیە .بوونی مرۆڤیش بەشێکە لەو ڕاستییە. لەم بۆچوونەوە، مۆسیقا بە پێچەوانەی دەربڕینی گوتارێکی هۆشەکی بە زمانی وشەسازی، ڕەنگدانەوەی ڕاستەقینەی ڕاستیی بوونە و هەموو کاتێک مرۆڤ دەجوڵێنێت و حەز و ئارەزووی دەهەژێنێت. تێگەیشتنی ئێمە لە مۆسیقا نەبەستراوە بە چەندەکی زانینمان لە بارەی ئەم هونەرە و شێوەی مۆسیقا و ناسنامەی هونەرمەندەکەی. پێوەری ئەو تێگەیشتنە (زانین) نیە، هەژانی سۆز و ئارەزووەکانە. ئەمە پێوەری مۆسیقایەکی بەرز و جوانە، کە نیتشە لە بەرهەمەکانی دوایی نێو مۆسیقای واگنەردا، بە تایبەتی لە ئۆپراکانییدا بەدی ناکات. لە نێو ئۆپرادا مۆسیقا و دەق تێهەڵکێش دەکرێن و خەڵکی هێندەی هەوڵی تێگەیشتن و چێژ وەرگرتن لە دەقەکە دەدەن، ئەوەندە حەز و ئارەزووەکانی خۆیان تەسلیمی مۆسیقاکە ناکەن. لە ئۆپرادا دەق بە سەر مۆسیقادا زاڵە و ئەو ڕاستییەی نیتشە باوەڕی پێدەکات و مۆسیقا دەریدەبڕێت، لە نێو دەقەکەدا بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. بێجگە لەمەش، خاڵێکی دیکەشمان لە پێشتر سەبارەت ڕەخنەگرتنی نیتشە لە واگنەر ڕوون کردەوە. واگنەر لە ئۆپێراکانیدا ئەوەندەی بایەخی بە حەز و ڕازیبوونی بیسەر داوە بایەخی بە بەرزی ناوەڕۆک و شێوەی هونەرەکەی نەداوە. ئەمەش بۆتە هۆی دابەزینی هونەری واگنەر لە ئاستی پلەی بەرز و جوانیدا و قوربانیدان بەو جوانییە لە پێناوی بیسەردا و هاوتەرازبوونی لەگەڵ هونەرە ڕووخاو و بازاڕییەکەدا. لە سەرو ئەمانەشەوە، جارێکی دیکە بۆ ڕازیکردنی

بیسەر و گەڕانەوە بۆ دۆگمای نێو ئەشکەوتەکە ئۆپراکانی واگنەر لە ڕووی ناوەڕۆکی فەلسەفییەوە بە یەکێک لەو منارانە دادەنرێت بۆ گەشەکردنی نەریتی ئایینی و باو بانگی لێوە کرابێت. مۆسیقا، نەک دەق یان چەمک، دەربڕینی ڕاستەقینەی ئەو ڕاستییە دیۆنسیسەیە، میتافۆرێکە هەموو کەسێک دەتوانێ لە واتاکەی تێبگات و هاوکات بە چەند جۆرێکیش ئەو واتایە لێکبدرێتەوە. زمانێکە هەموو جارێک گوێمان لێدەبێت بە شێوەیەکی جیاوازتر سۆز و ئارەزووەکانمان دەهەژێنێت و ڕاستی بوونی خۆمان دەخاتەدەر.[111] لە نووسینەکانی نیتشەدا، میتافۆر لە سەر زەمینەی پەیوەندی نێوان بیرکردنەوەی فەلسەفییانە و هونەردا دامەزرێنراوە. میتافۆر بووە بە شێوازێکی بەرز و ڕەوانی دەربڕینی ئەو بیرکردنەوەیە و جێگایەکی نزمی بۆ دانەنراوە. لە هەندێک شوێندا هێندە میتافۆر بە سەر نووسینەکانی نیتشەدا زاڵە، کە لە هۆنراوە جیاناکرێتەوە. ئەم نزیک بونەوەیەی فەلسەفە لە هۆنراوەوە لەو بۆچوونەوە سەری هەڵداوە، کە نیتشە و هایدیگەر بانگەشەی بۆ دەکەن و زمانی فەلسەفە و هۆنراوە بە یەک جۆر دەربڕین دادەنێت.[112] هایدیگەریش، وەکو نیتشە، فەلسەفە و هونەر لە هونەریشدا، بە تایبەتی هۆنراوە بە هێزێکی ڕزگاریکەر دادەنێت. گرنگی و تایبەتمەنییەتی هونەریش بۆ خەسڵەتی (داهێنان) دەبەستێتەوە، کە مرۆڤ بۆ بوونی ڕەسەنی خۆی دەگەڕێنێتەوە و بە داهێنەر دەیهێڵێتەوە. زمانی پەخشانی زانستانە و ماتماتیکی، کە بە سەر زانستە سروشتییەکاندا و فەیلەسوفەکانی ڕاڕەوی

---

111- Friedrich Nietzsche. *Twilight of the Idols*, p. 44.
112- Friedrich Nietzsche. "Ecce Homo", in *Basic Writings of N - etzche*, translated by Walter Kaufmann, p. 721.
هەروەها سەبارەت بە بۆچوونەکەی هایدیگەر بڕوانە: محەمەد کەمال، ناهێلیزم و ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە، چاپ و پەخشی سەردەم ، سلێمانی ، ٢٠٠٥. لاپەڕە ١٠١.

هۆشەکییدا زاڵە و لە سەردەمی ئەریستۆوە بۆ توێژینەوە فەلسەفی و زانستییەکان بووە بە نەریتێکی نووسین و باسکردن ناوەڕۆکی ڕاستی بوون ناپێکێ و خۆی بە تەواوی پێناگەیەنێت. فەیلەسوف، بە دیدی نیتشە، دەبێت هونەرمەندانە یان شاعیرانە بە ئەندێشە و لە بەرگێکی میتافۆردا ناوەڕۆکی ڕاستی دەربڕێت. میتافۆریش لە سەر دەوڵەمەندی و دەستەڵاتی ئەندێشە ڕادەوەستێت. بە ڕەوانی و پڕی ڕاستیی بوون دەردەخات و زمانی زانستانە و ماتماتیکیش هەژاری و شاردنەوەی ڕاستییەکەیە. هەرچەندە (چەمک) جۆرێکە لە میتافۆر بەڵام نیتشە پەنا دەباتە بەر میتافۆری هونەری و بە بەرزترین و جوانترین میتافۆری دەزانێ. هونەر و فەلسەفە هاوشان دادەنێت. لە بۆچوونی ئەودا هونەر نەک زانست، داهێنانی هونەری، نەک پێشکەوتنی تەکنەلۆجی ڕاستی ناسە و بەردەوامی بە بوونی مرۆڤ دەدات، "بۆ ئەوەی لە ڕاستی دانەبڕێین، دەبێت هونەرمەندانە بژین".[113] بەم جۆرە ئەگەر بە وردی تەماشای کێشەی (زمان) لەم بەستێنەوە بکەین هەموو چەمکێک بە میتافۆر دابنێن ئەوا هیچ زمانێک نیە ڕاستی بوون بە تەواوی و وەکو خۆی دەربڕێت. با ئەو خاڵەشمان لە یاد نەچێت، کە چەمکەکان لە هەرچ زمانێکدابن، هەمەکین و بە سەر گەلێک بابەتی دەرەکی هەندەکییدا دەچەسپن. چەمکی (درەخت) هەمەکییە و ئاماژە بۆ یەک بابەتی هەندەکی ناکات. ئاماژە کردنە بۆ کۆمەڵ و دەستەیەک بابەتی هەندەکی، کە هاوکات لێکدەچن و جیاوازیشن. درەخت هەیە گەورە، بەرز، گەڵاسەوز، میوەدار، هەروەها درەختیش هەیە بچوک و کورت و گەڵازەرد و بێبەر. درەخت هەیە سێو دەگرێت و یەکێکی دیکەش گوێز...هتد. بەڵام ئێمە بە هەموویان دەڵێین (درەخت) یان ئەم

113- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 435.

چەمکە هەمەکییە بۆ ناسینی هەموو ئەو بابەتە جیاوازانە دادەنێین. ئەوەی مرۆڤ لە ئەزموونە هەستەکییەکەیدا دەیناسێت بابەتێکی هەندەکییە و ئەو چەمکەی بۆ دەربڕینی ناسینەکە بەکاری دەهێنێت هەمەکییە و شتێک نیە، وەکو بوونی درەختەکە لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا بسەلمێنرێت. ئەوەی ئێمە بە ئەزموون دەیناسین لەگەڵ ئەوەدا جیاوازە لە نێو زماندا باس دەکرێت. لە میتافۆریشدا واتای شتێک، وەکو دڵی شاعیر لە پارچە هۆنراوەکەی مەحوییدا، بە شتێکی دیکە (پەروانە) ڕوون کراوەتەوە. دڵ و پەروانە دوو شتی جیاوازن بەڵام شاعیر هەوڵیداوە جەخت لە سەر لێکچونیان بکات و لە لایەنێکەوە یان چەند لایەنێکەوە، لە ناوەڕۆک و فۆرمدا یان شێوازی بوونیاندا لێکچونەکەیان دۆزراوەتەوە.

بەکارهێنانی (چەمک)، کە بنەڕەتی زمانە هەمان شێوازی هەیە و بەرانبەر بابەتەکانی بە میتافۆر دادەنرێت. لە بەر ئەمەشە هەندێک لە فەیلەسوفەکان، بە تایبەتی ئەوانەی لە سەر کێشەی (زمان) دواون لە ئاستی باسکردن لە نێوان چەمک و بابەتی ئاماژەکراودا توشی گرفت بوون. یەکێک لەوانە نیتشەیە، چونکە (ڕاستی بوون) دیاردەیەکی دەرەکی (وەکو درەخت) نیە ڕاستەوخۆ پەنجەمانی بۆ ڕاکێشین و هەوڵی ناسینی بدەین. هێزێکی ناوەکییە، بۆ ناسینی و دەربڕین پێویستیمان بە ئەپستمۆلۆجی و زمانی تایبەتی هەیە و ماسییەک نیە بە هەموو تۆڕێک بگیرێت. ڕاستی بوون بێجگە لە وەی ناوەکییە، دینامیکییە و لە پەرەسەندنی بەردەوامدایە.[114] شوێنکەوتوانی مێتافیزیکی ڕووناکبین بە دوای چەمکە هەمەکییەکاندا بۆ ناسینی ڕاستی دەگەڕێن. ئەو چەمکانەی لە هەموویان زیاتر هەمەکیتر و پوچەڵتر و بێ ناوەڕۆکترن. لە نێو ئەمانەشدا لە هەموویان هەمەکیتر

114- Friedrich Nietzsche. Twilight of the Idols, pp. 15- 16.

هەڵدەبژێرن بۆ ئەو ڕاستییەی باوەڕیان پێیەتی و دەیکەن بە (هۆ) یەکی لە پێشتر بۆ هەموویان.[115] ئەگەر چەمکەکان لە هونەر نزیک نەبنەوە و خۆیان نەخەنە سەر زاری شاعیر و نێو هەنبانەی فەرهەنگە هونەرییەکەیەوە، بە پوچەڵی لە لای شوێنکەوتوانی مێتافیزیکی ڕووناکبیندا دەمێننەوە و خزمەتی بیر و باوەڕی سەردەمی ڕووخاو دەکەن. هونەر ناوەڕۆکی بوونمان پێ دەناسێنێت و لەو ڕاستییە نزیکمان دەکاتەوە. بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕاستییدا بین و ڕاستیناس بین ئەوا پێویستە خاوەنی هونەربین.[116] شوێنکەوتوانی مێتافیزیکی ڕووناکبین، کە خۆیان بە خاوەنی فێرگەی هۆشەکی دادەنێن و (هۆش) بە سەرچاوەی زانین و تەنیا ئامێرێکی ڕاستیناس دادەنێن هونەریش لە بەر ڕۆشنایی هۆش و زانینی هۆشەکییدا تەفسیر دەکەن. بۆ ئەوان هونەرێک لە سەرچاوەی حەز و ئارەزووە ناوەکییەکانەوە و لە ویستی هێزەوە سەری هەڵدابێت نزمە و هۆش قبوڵی ناکات. نیتشەش، بە پێچەوانەی ئەوانەوە، دەیەوێت هونەر لە بەندی هۆش ڕزگار بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ ویستی هێز و ئامێرێک بۆ دەربڕینی ویستی هێز و لە میتافۆری دیۆنسیسدا ڕازاندوویەتەوە.
ئەگەر لەگەڵ ئەو بۆ چوونەدا هاوڕابین، کە (چەمک) بە میتافۆر دادەنێت، ئەوا هەموو شێوازێکی نووسین و دەربڕین دەبێت بە میتافۆر. لە نێو نووسینەکانیشدا نیتشە پەنای بۆ میتافۆری دیکە بردووە و بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی بە ڕێگەی میتافۆری جۆراوجۆر دەربڕیووە. ئەمەش پەیوەندی بەو ڕاستییە فەلسەفییەوە هەیە، کە ڕاستی بوون و ویستی هێز بە یەک ڕاستەقینەی نەگۆڕ و چەسپاو دانانێت و دەیکات بە ناوەڕۆک و دیاردەیەکی فرە لایەن و

115 هەمان سەرچاوە.
116- Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p.435. F

هەمیشەگۆڕاو. کەسێکیش بیەوێت ئەم ڕاستییە بناسێت و لە بوونی بکۆڵێتەوە دەبێت وەکو (ئارگۆس) خاوەنی چەند چاوێک بێت و لە دەربڕینی ڕاستیەکەش چەند جۆرێک میتافۆر بۆ ئاماژەکردنی لایەنە فرەجۆرەکانی بخاتە گەڕ. هەموو میتافۆرێک لایەکی ئەو ڕاستییە فرە لایەنەمان بۆ دەردەخات و لە بەر ئەوەی خۆدەرخستنی لایەنەکانی ئەو ڕاستییەش بێ سنوور و جۆراو جۆرە ئەوا مرۆڤ بەردەوام پێویستی بە میتافۆر و داهێنانی هونەرانەیە.[117] هەموو لایەنێکی بوون ببینێت و بە تەنیا ئاوەڕ لە یەک لا نەداتەوە.

117- ئارگۆس Argus پاڵەوانێکە لە ئەفسانەی یۆنانییدا سەد چاوی هەبووە و هەموو لایەکی بینیوە. ئەم پاڵەوانە لە ژێر چاودێری (هیرا) خوایەکی ژنی یۆناندا بووە. کاتێک (هێرمس)ئاراگۆس دەکوژێت، هیرا چاوەکانی دەردرهێنێت و دەیانخاتە سەر پەڕەکانی کلکی تاوس. من (ئارگۆس) م، وەکو میتافۆر بۆ ئەو کەسە بەکارهێناوە، کە دەیەوێت هەموو لایەنێکی بوون ببینێت و بە تەنیا ئاوەڕ لە یەک لا نەداتەوە. لەم میتافۆرەدا لێکچونی نیتشە و ئارگۆسم خستۆتەڕوو.

# بەشی شەشەم

# نیتشەی پاش نیتشە

لەم بەشەدا توێژینەوەکەمان مامەڵە لەگەڵ گەشەکردن و گونجاندنی بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشە دوای مردنی نیتشە دەکات. ئەو لایەنانە ڕووندەکاتەوە چۆن بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی بە باشی و خراپی بەکارهێنراوە و لێکدراوەتەوە. نیتشە یەکێکە لەو بیریارانەی دۆستی کەم و دوژمنی زۆری هەبووە. ئەمەش بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ ڕادیکالبوونی بۆچوونە فەلسەفییەکانی و دژوەستانی ئەم فەیلەسوفە بەرانبەر نەریتی مێتافیزیکی زاڵبووی سەردەمەکەی. هەندێک جار دۆستەکانیشی بە چەواشەیی لە بیروباوەڕەکەی گەیشتوون و بۆ مەرام و مەبەستێکی تایبەتی خۆیان لێکیانداوەتەوە.

ئەم دۆستانە لە دوژمنان زیاتر زیان بەخشن و دەبنە هۆی شێواندنی تێگەیشتن لە بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی . یەکێک لەو کەسە نزیکانە لە نیتشەوە )ئەلیزابێت (ی خوشکێتی، کە دوای مردنی براکەی خۆی کرد بە خاوەنی سامانە بەجێماوەکە و میراتی فەلسەفی نیتشە. بۆ مەبەستی خۆی و بەرژەوەندی، بۆ سازشکردن و خزانە نێو قەوارویەکی تەسکی ڕامیاری نەتەوە پەرستانەوە، بەرنامەی ڕامیاری نازییەکانی بە سەر ئەم میراتە فەلسەفییە مرۆڤخوازەدا سەپاند. ئەم هەڵوێستەی ئەلیزابێت بە تەنیا هەلپەرستانە و شوێنکەوتن بە دوای بەرژەوەندی خۆ و دەستەڵاتدا نەبوو، لە ئاکامی باوەڕهێنان بە ئایدۆلۆجیی نازییەکان بوو. ئەو دەیویست بیروباوەڕی فەلسەفی

نیتشه ببێته منارەی ئەو ئایدۆلۆجییە ڕامیارییە. بەڵام تاکو چ ڕادەیەک بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشە دەتوانێت ئەو خزمەتە بە نازیزم بگەیەنێت؟ ئایا نیتشە لەگەڵ ئەو ئایدۆلۆجییە ڕامیارییەدا یان ئەو بۆ چوونەدا، کە لە مەودوا بە (دژایەتیکردن لەگەڵ جولەکە) ناوزەدی دەکەم، کۆک بووە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بە کورتی لە سەر پەیوەندی نێوان نیتشە و ئەلیزابێتی خوشکی دەدوێم و لەوێوە کێشەی بەنازیبوون یان دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکەدا، لە بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشەدا ڕووندەکەمەوە. دەزانین، کە تەمەنی نووسینی نیتشە کورت بووە و وەکو بیریارێکی ئەڵمانیش زۆربەی تەمەنی لە دەرەوەی ئەڵمانیا بە سەر بردووە. نیتشە لە ساڵی ١٨٨٩ لە تەمەنی چل و پێنج ساڵیدا شێت بووە و یانزە ساڵ بە شێتی ژیاوە و ٢٥ ی مانگی ئابی ١٩٠٠ مردووە. لە بەر ئەوەی نیتشە تەمەنی شێتێتی لەگەڵ دایکی و خوشکەکەیدا بە سەر بردووە پاش مردنی، ئەلیزابێت خۆی دەکات بە خاوەنی نووسین و بڵاوکراوەکانی براکەی و کەس بە بێ ڕازیبوونی ئەو نەیتوانیوە نووسراوەکانی نیتشە لە چاپ بدات. بێگومان ئەمە مافێکی یاسایی ئەلێزابێتە، بەڵام ئەو بەدەستکارییەوە و گۆڕینی چەند ڕاستییەک نووسراوەکانی نیتشەی بڵاوکردۆتەوە. بۆ نموونە نیتشە لە نووسراوەکەیدا لە سەر ژیانی خۆی دەنووسێت )باوکم توشی نەخۆشی دەرونی و مێشک بوو، شێت بوو پاش ئەو نەخۆشیە مرد.) ئەلیزابێت پاش مردنی نیتشە، کە ئەم نووسراوەی جارێکی دیکە بڵاوکردەوە، ئەم دێڕەی بەم جۆرە داناوە (باوکم توشی نەخۆشی بوو، پاش ئەو نەخۆشیە مرد).[118] لە ساڵی ١٩٠١ بۆ یەکەم جار پاش مردنی نیتشە نووسراوی

118– نیتشە لە ڕۆژی لە دایکبوونی (فردریک ویڵهێلم)ی چوارەمی پاشای پروسیا لە دایکبووە. لەبەر ئەوە نیتشە ناودەنێن (فردریک نیتشە). ئەم پاشایە و باوکی نیتشە

(ویستی هێز)ی لەگەڵ ٤٨٣ تێبینی لە پەراوێزدا بڵاوکردەوە. لە ساڵی ١٩٠٤، کە بۆ جاری دووەم لە چاپدرایەوە دوو سەد لاپەڕەی بۆ زیاد کرد. هەروەها پرۆفیسۆر ئەلفرید باوملەر Alfred Bäumler لە بەر ڕۆشنایی ئایدۆلۆجییەتی نازیزمدا لە فەلسەفەی نیتشەی دەکۆڵییەوە.[119]

نیتشە هاوڕێی کەمی هەبووە. یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانی ئەلیزابێتی خوشکی بووە. ئەلیزابێتیش هاوڕێیەتی و نزیکبوونەوەی لە نیتشەی برای پێخۆش بووە، بۆیە هەندێک جار، کە نیتشە زیاتر لە ئافرەتێک نزیکبۆتەوە و هاوڕێیەتییەکەی بەرەو پێشەوە چووە، ئەلیزابێت (غیرە)ی کردووە و نەیتوانیوە هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا دروست بکات. هاوڕێیەتییەکەی نێوان نیتشە و ئەلیزابێت، تاکو ئەو ڕۆژەی ئەلیزابێت دەبێت بە هاوسەری بێرن هارد فورستەر، بێ کێشە دەمێنێتەوە. لە ساڵی ١٨٨٥ ئەلێزابێت ئەم پیاوە، کە یەکێکە لە پێشەوایانی ڕێکخراوێک سەر بە ئایدۆلۆجی (دژایەتیکردن لەگەڵ جولەکەدا) بە هاوسەری خۆی هەڵدەبژێرێت و نیتشە بەجێدەهێڵێت و لەگەڵیدا بۆ پەرەگوای لە ئەمەریکای لاتینی

---

ونیتشە، هەرسێکیان بە شێتی مردن. من لێرەدا پەیوەندی شێت بوونی ئەم سێ کەسە پێکەوە نابەستمەوە، وەکو ڕووداوێک دەیخەمە بەردەم خوێنەر. چەند هۆیەک بۆ شێت بوونی نیتشە دانراوە. یەکێک لەو هۆیانە، کە پیاوانی ئایینی (کەشیشەکانی نزیک نیتشە) باسیان کردووە بە دیدی ئەوان بێبڕوایی و دوورکەوتنەوەی نیتشە لە ئایینی مەسیحایەتی و خواوەیە. بڕوانە:
Gianni Vattimo. *Nietzsche*: *An Introduction*, p. 169

119 - بڕوانە: پێشەکی ئەم پەڕتووکەی نیتشە، کە والتەر کاوفمان وەریگێڕاوە:
Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 1.

دەڕوات. لە دوو لایەنەوە ئەم ڕووداوە کاریگەرێتییەکی نەرێی کردە سەر نیتشە: لە لایەکەوە ئەلیزابێت هاوڕێیەکی ئازیز و خوشکێکی دڵسۆزی نیتشە بوو، دوورکەوتەوە. لە لاکەی دیکەوە، کە بۆ توێژینەوەکەی ئێمە گرنگە ئاماژەی بۆ بکرێت، ئەلێزابێت کەسێکی نەتەوە پەرستی ئەڵمانی سەر بە ئایدۆلۆجی دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکەدا بە هاوسەری خۆی هەڵبژارد. نیتشە لە نامەیەکدا بۆ ئەلیزابێت دەنووسێت،

> تۆ بۆ ئەو پەڕی دنیا ڕۆیشتیت... ئەم هەڵوێستەی تۆ بۆ من سوکایەتی و برینداربوون و گەمژەیی یە، کە چەند زیان بە من دەگەیەنێت ئەوەندەش بە تۆ.[120]

دوای ساڵێک بە سەر ئەو ڕووداوەدا، لە ساڵی ١٨٨٦ نیتشە نامەیەکی دیکە بۆ خۆشکەکەی دەنووسێت و دەڵێت، (من ئەورووپیم و دژی ئەوانەم باوەڕیان بە دژایەتیکردن لەگەڵ جولەکەدا هەیە.) داواش لە خوشکەکەی دەکات بە فورستەر بڵێت دەست لەو بیروباوەڕە هەڵگرێت و بۆ ئەڵمانیا بگەڕێتەوە[121] نیتشە حەزیکردووە سەردانی پەرەگوای بکات، بەڵام نەیویستوە فورستەر ببینێت، ( لەبەر ئەم جۆرە کەسانە ناتوانم سەردانی پەرەگوای بکەم. بەڵام خۆشحاڵم، کە ئەورووپایان چۆڵکردووە. دروستە من ئەڵمانییەکی خراپم، بەڵام ئەورووپییەکی چاکم.)[122] گۆڤارێکی سەر بە ڕێکخراوی دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکەدا بە ناوی Anti-Semitic Correspondence چەند جارێک لە نووسراوەکانیاندا گوتەکانی نیتشەیان لە (زەردەشت وای

120- هەمان سەرچاوە. لاپەڕە٤٣.
121- هەمان سەرچاوە.
122-هەمان سەرچاوە. لاپەڕە٤٤

گوت) دەرهێناوە و تێهەڵکێشیان کردوە. هەوڵیانداوە بۆچوونەکانی نیتشە بە ئایدۆلۆجییەکەی خۆیانەوە ببەستنەوە. لەمەشدا ئەلیزابێت دەستی هەبوە. لە سەرەتاوە نیتشە پێکەنینی بەم کارەهاتوە و لە نامەیەکدا بۆ (ئۆڤەر بێک)ی هاوڕێی دەنووسێت،

> من کاریگەرێتیم بە سەر دژایەتیکردن لەگەڵ جولەکەدا هەیە. لە هەموو ژمارەیەکی گۆڤارەکەیاندا ناوم دەبەن. زەردەشت بووە بە سەرچاوەی ئیلهامیان. من پێکەنینم بەمە دێت.[123]

بەڵام، کە دەزانێت ئەو کێشەیە دەبێت بە لەکەیەکی چڵکنی ڕامیاری و نزمکردنەوەی بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی ناتوانێت بە پێکەنین و گاڵتە پێکردن بەرانبەر ئەو ئایدۆلۆجییە ڕاوەستێت. ئەمجارە لە نامەیەکدا ئەلیزابێتی خوشکی ئاگادار دەکاتەوە و دەنووسێت،

> یەکێک لەو کارە گەمژانەی تۆ کردووتە و زیان بە من و تۆ دەگەیەنێت پەیوەندییەکەتە لەگەڵ پێشەوای ئەوانەی خۆیان بە خاوەنی دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکە دادەنێن. ئەمەش سەرچاوەی خەم و پەژارەی منە... بۆ من گرنگە گەندەڵیم پێوە نەبێت. من لە نووسراوەکانمدا دژی ئەوانەم دژایەتی لەگەڵ جوولەکەدا دەکەن... لە هەموو ژمارەیەکی گۆڤارەکەتانAnti-Semitic Correspondence ناوی زەردەشت دەهێنن. ئەمە چەندەها جار منی توشی نەخۆشی کردووە.[124]

---

123- هەمان سەرچاوە

124- هەمان سەرچاوەلاپەرە ٤٥.

ئەلیزابێت و هاوبیرانی ڕامیاری ئەو بوونە هۆی پەرێشانی نیتشە. ئەم خوشکە دڵسۆزەی فەیلەسوف بە مەشەوە نەوەستاوە. زیادە ڕۆیی لە کێشەکەدا کردوە. پاش مردنی نیتشە (ئەرشیفی نیتشە)ی لە شاری (وایمەر) دامەزراند و (هیتلەر)ی بۆ کردنەوەی ئەرشیفەکە بانگکردوە.[125]

سەردانەکەی هیتلەر بڕوانامەیەکی ڕامیاری و دەوڵەتی بوو، کە ئەلیزابێت چاوەڕوانی بوو. بێگومان ئەم کارەش تەنیا پاش مردنی نیتشە دەبوایە بە ئەنجام بدرایە چونکە ئەگەر نیتشە زیندوو بوایە و شێتیش نەبوایە خۆی نەدەکرد بە خاوەنی ئەو بڕوانامەیە. لەو ڕۆژەوە نازییەکان بێ تێگەیشتن لە فەلسەفەی نیتشە ئەم فەیلەسوفەیان بە پێشەوای ڕۆحانی خۆیان لە قەڵەمداوە. بە نازی کردنی نیتشە بۆ چەند لایەنێک دەگەڕێتەوە، کە پێویستە بە وردی لێیان بکۆڵینەوە. دوو لایەنی بە بیروڕای من گرنگ نین و دەتوانین چاوی لێ بپۆشین بەڵام پێویستە لایەنی سێیەم بە قوڵی مامەڵەی لە گەڵدا بکرێت. لایەنەکانیش ئەمانەن،

یەکەم، پەلکێشکردنی نیتشە بەرەو نازیزم لە سەر خواستی ئەلیزابێتی خوشکی نیتشە.

دووەم، پێویستی نازییەکان بە فەلسەفە.

سێیەم، نزیکی بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشە لە ئایدۆلۆجی ڕامیاری نازییەکانەوە.

125- هیتلەر چەند مانگێک پاش هاتنە سەر حوکم بۆ ساڵڕۆژی واگنەر و بینینی ئۆپێرای (تریستاو ئیسۆڵدە) چوو بۆ شاری وایمەر و سەردانی ئەرشیفی نیتشەی کرد. بڕوانە:

Curtis Cate. *Friedrich Nietzsche*: *A Biogrephy*, London: Pimlico, 2003. Pp.575-76.

بیروباوەڕی ڕامیاری ئەلیزابێت، بە تایبەتی پاش هەڵبژاردنی یەکێک لە ڕابەرانی بزوتنەوەی دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکەدا و کارکردن لە نێو ئەو بزوتنەوەیەدا، لە پاشان بانگکردنی هیتلەر بۆ کردنەوەی ئەرشیفی نیتشە، بە ئاشکرا ڕوو لە نازیزم دەکات. لەگەڵ ئەم هەڵوێستە ڕامیارییەی خۆیدا نیتشەی برای پاش مردنی بە پێشەوایەکی فەلسەفی ئەو بیروباوەڕە ناوزەدکرد. بە بێ ئەوەی فەلسەفەی نیتشەی بە قووڵی خوێندبێتەوە، ئەم ژنە نازییە بە بڕوایەکی تەواوەوە هیتلەری بەو (مرۆڤە بەرزە)ی نیتشە دانا. ئەم کارەش، لە کاتێکدا، کە نیتشە خۆی بە دوژمنی ئەو بزوتنەوەیە دادەنێت دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکەدا دەکات و بانگەشەی ئایدۆلۆجییەکی بیر تەسکی ئەڵمانخوازی دەکات. بەبێ ڕێزلێنان لە نیتشە و بیروباوەڕی فەلسەفی ئەم بیریارە ئەو خاڵەی ڕەچاو نەکرد، کە نیتشە لە نامەکەیدا دەڵێت، (یەکێک لەو کارە گەمژانەیەی تۆ کردووتە زیان بە من و تۆ دەگەیەنێت، پەیوەندییەکەتە لەگەڵ پێشەوای ئەوانەی خۆیان بە خاوەنی دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکە دادەنێن. ئەمەش سەرچاوەی خەم وپەژارەی منە...). نیتشە بە پەیوەندی ئەلیزابێت لەگەڵ ئەو بزوتنەوەیەدا پەرێشان بوو. ئەگەر بزانێت پاش مردنی ئەلیزابێت نیتشە بە پێشەوای ڕۆحانی ئەو بزوتنەوەیە دادەنێت چی هەڵوێستێکی دەبێت؟ ئەم کارە نەک گەمژانەیە، بەڵکو خیانەتە لە بیروباوەڕی فەیلەسوفێک، کە تا ئەو ڕۆژەی دەیتوانی بیربکاتەوە دژی ئەو بیروباوەڕ و بزوتنەوانە ڕادەوەستا کالای بە مرۆڤبوون لە بەر مرۆڤایەتییدا دادەماڵن و کۆمەڵگایەکی دڕندانە دادەمەزرێنن.

ئەلیزابێت ئەم خیانەتەی لەگەڵ بیروباوەڕی نیتشەدا کرد و

نازییەکانیش بێ وچان کێشەکەیان بۆ خۆیان قۆزییەوە. ئەوان پێویستیان بە بنەڕەتێکی فەلسەفی، وەکو مارکسییەکان، بۆ بزوتنەوە ڕامیارییەکەیان هەبوو. ڕوویان دەکردە دەرگای هەموو بیریار و هونەرمەند و فەیلەسوفێک. لە سەرەتاوە بە بەکارهێنانی میتۆدێکی نەرم و بەرتیل و کڕین ئەم ڕۆشنبیرانەیان بە موڵکی خۆیان دەکرد و لە دواییدا، پاش سەقامگیرکردنی دەستەڵاتەکەیان ئەو لۆجیکە فاشستیەیان بەکارهێنا، کە ئەو کەسەی ئەوانی بە ڕاست دانەنایە دەخرایە نێو لیستی دوژمنانی کۆمەڵ و قەلاچۆکردنیان شەرعیەتی پێدەدرا. نازییەکان، لە بەر تێنەگەیشتنیان لە فەلسەفە و گەمژەییان، بە بێ ئەوەی بیروباوەڕەکانی نیتشە بخوێننەوە و ئاگاداری نامەکانی ئەو فەیلەسوفە بن بۆ ئەلیزابێت، بە بێ ئەوەی بزانن نیتشە شانازی بە گەلی ئەڵمانەوە نەکردوە ، لە لایان بوو بە پێغەمبەرێکی مەزن. ئەم دوو لایەنە، وەکو باسمکرد، هێندە گرنگ و بایەخدار نین. هەر دووکیان وابەستن بە هەڵەی ئەلیزابێت و ساکاری بیروباوەڕی نازییەکانەوە. بەڵام ئایا دەتوانین بڵێن، بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی لە بەر ئەوەی لەگەڵ ئایدیۆلۆجی نازیزمدا دەگونجێت، نازییەکان بە شانازییەوە نیتشە یان بە فەیلەسوفی خۆیان دانا؟

لە سەرەتاوە وەڵامی ئەم پرسیارە نەرێیە و دەتوانین لە چەند لایەنێکەوە بەرگری لە نیتشە بکەین. یەکەم، نیتشە شانازی بە ئەڵمانەوە ناکات. خۆی بە مرۆڤێکی ئەوروپی دادەنێت. سەرەڕای ئەمەش زۆربەی تەمەنی لە دەرەوەی ئەڵمانیا بە سەر بردووە. بەڵام هێشتا ئەمەش نەگونجاندن و ناکۆکی نێوان بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشە و نازیزم دەرناخات. بۆ سەلماندن و دەرخستنی ناکۆکییەکانی نێوانیان پێویستە قوڵتر بڕوانینە کێشەکە و بە وردی ئاوەڕ لە

بۆچوونەکانی نیتشە بدەینەوە. ئەم سەلماندنەش بە بۆچوونی من لە سەر دوو کۆڵەکەی گرنگ ڕادەوەستێت، یەکەم تێگەتشتنی نیتشە لە بوونی مرۆڤ. دووەمیش ڕەخنە و دژایەتیکردنی نیتشە لەگەڵ واگنەردا. پێویستە ئاماژە بۆ ئەو خاڵە بکەین، کە نازیزم، وەکو ئایدۆلۆجی و بزوتنەوە دیاردەیەکی ڕامیاری تازەگەرایەتییە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت نازیزم لەگەڵ دیاردە ڕامیارییەکانی دیکەی ئەم قۆناخەدا بڕوا بە جیاوازی و هاوبوونی لەگەڵ جیاوازییەکاندا ناکەن. بیروباوەڕێکە سەر بە لۆجیکی خۆ بەحەقزان. ڕێگە بە خۆی دەدات جیاوازییەکان لە ناوبەرێت و نەریتێکی یەک ڕەنگی بازاڕی و باو بهێنێتە کایەوە، کە تاکەکان لە نێو ئەو نەریتەدا هاوتەراز و وەکو یەکدی بن. قەلاچۆکردنی جیاوازیەکان، چی بیروباوەری و فەلسەفی یان ڕەگەزی و ئایینی و زمانەوانی بەرنامەی کارکردنی نازییەکان بوو. ئەوان دەیانویست کۆمەڵی ئەڵمان بخزێننە نێو سترەکچەرێکی ئایدیۆلۆجی تەسکەوە. دەبوایە هەموو کەسێک، وەکو (ئەوان) بیربکاتەوە و مامەڵە لەگەڵ دەوروبەریدا بکات. ئەگەر تاکێک هەوڵی پاراستنی تایبەتمەندی خۆی و جیاوازییەکەی خۆی دەربڕێت، ڕیزپەر لە قەڵەم دەدرێت و بە تاوانی لادان و خیانەتکردن و شکاندنی تەلیسمی (تابوو) ە ڕامیارییەکە سزا دەدرێت.[126] سەرۆکی بزوتنەوە ڕامیارییەکەش دەبێت بە (سمبۆڵێک)ی باوکایەتی و ڕۆڵی

126- زاراوەی (تابوو) بەم جۆرەی بەکارمهێناوە لە فرۆیدەوە وەرمگرتووە. فرۆید لە نووسراوێکیدا بەناوی *Totem and Taboo* بۆ دۆزینەوەی بنەڕەتی بیروباوەڕی ئایینی لەمەڕ سزادانی ئەو تاکانە دەدوێت، کە تابووی خێڵەکەیان دەشکێنن و گوێ نادەنە حەرامکردنی ئەو شتانەی خێڵەکە بۆی داناون. بڕوانە:
Sigmund Freud. “Totem and Taboo”, in *The Standard Edition of the Complete Psychological Works of Sigmund Freud*, translated by James Strachey, vol. 13, London: Vintage, 2001. P. 5.

باوک دەبینێت. داوا لە ئەندامانی کۆمەڵ دەکات، وەکو منداڵێکی چاک بۆ پاراستنی نەریت و کەلتوور و بەرژەوەندی هەمووان، سەر شۆڕ و مل کەچ بن و پەیڕەوی فەرمانەکانی بکەن. تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی نیتشە بۆ بوونی مرۆڤ لەگەڵ ئەم شێوازی نازییەدا یان تازەگەرێتییەدا نەک جیاوازە بەڵکو دژایەتیشی لە گەڵدا دەکات. بیروباوەڕی فەلسەفی ئەو کەلتووری بازاڕیی و لە ناوبردنی جیاوازییەکان ڕەتدەداتەوە. دژی بە نامرۆڤکردنی مرۆڤە. دژی ئەو بیروباوەڕ و سترەکچەرە کۆمەڵایەتییەیە تایبەتمەندێتی تاکەکان لە نێو خۆیدا دەتوێنێتەوە. یەک جۆر کاڵا بە بەر هەموویاندا دەکات. ڕەوەیەک لە کەسانی نزم و ناشرین دەکات بە خاوەنی دەسەڵات. لە لایەکی دیکەوە (مرۆڤی بەرز)ی نیتشە هیتلەر نیە. مرۆڤێکی خاوەن ویستی هێزە لە پێناوی پەرەسەندنی ژیاندا بۆ دامەزراندنی جوانی نەک شێواندن و ڕووخاندنی ژیان. مرۆڤێکە نایەوێت ببێت بە دڕندە. بە نامرۆڤکردنی کەسانی دیکە بۆ ئەو تاوانێکە بەرانبەر هەموو مرۆڤایەتی. مرۆڤی بەرز ویستی هێزی خۆی سەقامگیر دەکات، بەڵام بۆ مەبەستی پەرەسەندن و پێشخستنی ژیان، نەک بۆ قەلاچۆکردنی ڕەوەیەک لە خەڵک و سەپاندنی ڕەگەز و دەستەو تاقمێکی کۆمەڵ بە سەر کەسانی دیکەدا. ئەگەر نیتشە دژی ئایدیۆلۆجییەتی دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکە بێت ئەو بیروباوەڕە ڕەگەزپەرستە نیتشە نەخۆش ناکات. بێگومان مرۆڤی بەرزیش قێز لەو بیروباوەڕە دەکاتەوە. نازییەت بە ئایدیۆلۆجی (خاوەن کۆیلە) نەک خۆی دادەنێت.

نیتشە پاش مارکس یەکەم بیریارە ڕەخنەی لە تازەگەری و ڕەهەندە ئایینی و ڕامیارییەکانی ئەو سەردەمەی گرتبێت. تەنانەت ناڕازە

لەوەی ئەڵمانییە. پەشیمانە لەو بۆچوونانەی پێشوتری، کە بە ڕووناکبینی لە کەلتووری ئەڵمان و فەلسەفەی شۆپنهاوەر و هونەری مۆسیقای واگنەر دەدوێت،

> لە هاوینی ١٨٧٦ لەگەڵ یەکەم **Festspiele** لە دڵەوە ماڵئاواییم لە واگنەر کرد. لە سەر ئەم بڕیارەم دوو دڵ نیم. واگنەر بوو بە ئەڵمانی و بەرەو ئەو بیروباوەڕانە ڕۆی، وەکو دژایەتیکردن لەگەڵ جوولەکەدا، کە من ڕقم لێیانە.....
> واگنەر بە ڕواڵەت هونەرمەندێکی سەرکەوتووە بەڵام لە ناوەڕۆکدا ڕووخاوە و نزمە و لە بەردەم خاچی مەسیحدا چۆکی داداوە.[127]

هۆکارەکانی پەشیمان بوونەوەی نیتشە لە بۆ چوونەکانی پێشوی لە سەر شۆپنهاوەر و واگنەر جیاوازن و لەگەڵ یەکدیا کۆنابنەوە. هەر چەندە شۆپنهاوەری بە مامۆستا و فەیلەسوفێکی مەزنی سەردەم داناوە لە دوا جاردا دەگاتە ئەو باوەڕەی سیستەمی فەلسەفی مامۆستاکەی ڕەشبینانەیە و بۆ چوونە هیچگەرایەتییەکەشی ویستی مرۆڤ زەبوون و بێدەستەڵات نیشان دەدات.[128] لێرەوە نیتشە هیچگەرایەتییەکەی خۆی لە هیچگەرایەتی شۆپنهاوەر جیادەکاتەوە. سیستەمێکی بەرنامەگەرایەتی دادەمەزرێنێت، کە مرۆڤ تێیدا خۆی بە زەبوون نابینێ و داهێنەرانە دەڕوانێتە بوون. هۆکاری پەشیمان بوونی لە بۆچوونەکانی لە سەر هونەری واگنەر و هاوڕێیەتییەکەی

---

127 -Friedrich Nietzsche, “Nietzsche Contra Wagner”, in *The Port - ble Nietzsche*, translated and edited by Walter Kaufmann, pp. 675-76.

128 -هەمان سەرچاوە. لاپەڕە. ٦٦٩.

لەگەڵ ئەم هونەرمەندەدا کێشەی بە نازی نەبوونی نیتشە باشتر ڕوون دەکاتەوە. لە سەرەتاوە نیتشە ئومێدێکی گەورەی بە واگنەر هەبوو. بە بیرەڕای ئەو واگنەر هونەرمەندێک بوو بتوانێت سەردەمەکەی ڕەتبکات و هونەرێکی ڕەسەن بهێنێتەکایەوە. بەڵام نەیتوانی لەم کارەدا سەرکەوتووبێت. بە پێچەوانەوە واگنەر بوو بە زادەی سەردەمەکەی خۆی. هونەرەکەشی بە شتێکی بازاڕیی و باو. هەموو کەسێک لە نێو ڕەوەکەدا توانی لە هونەرەکەی تێبگات و چێژی لێوەرگرێت. نیتشە دژی هونەری بازاڕیی و باوە. هونەرێکیش تاکەکانی نێو ڕەوە خۆیان بکەن بە خاوەنی ئەو بە نزمی دادەنێت. کەلتووری بازاڕیی و باو لە هەرچ شێوازێکدا بێت (ڕامیاری و هونەری و ڕەوشتی) ڕەسەنیەتی تاکەکان پێشێل دەکات و ڕەوەیەکی نامۆو پێکدەهێنێت. نازییەکان نموونەیەکی بەردەستی ڕەوەی نامۆیە، کە نیتشە لە گەڵیدا دژایەتی دەکات و ڕەتیدەداتەوە. بێجگە لە دیاردەی نامۆیی ڕەوەکە، ویستی هێزی تاکە کەسێک (وەکو سەرۆک) دەکەوێتە ژوور ویستی هێزی ڕەوەکەوە و دەستی بە سەردا دەگرێت. ویستی هێزی ئەم تاکە کەسە دەکەوێتە قەلاچۆکردنی جیاوازییەکان و دامەزراندنی ویستی هێزی خۆی و بە ڕەهاکردنی ئەو هێزە. کەلتوورێکی ڕامیاری، وەکو کەلتووری نازی، هەوڵی لە ناوبردنی جیاوازییەکان دەدات. لە لایەکەوە بە نامۆکردنی تاکەکانی نێو ڕەوەکەی خۆی جیاوازییەکانیان لا دەبات و لە لاکەی دیکەوە شەڕەنگێزانە لەگەڵ جیاوازییە دەرەکییەکاندا بەرەنگار دەبێتەوە. تێگەیشتن لەم بەرنامە ڕامیارییەی کەلتوورێکی ڕامیاری، وەکو نازی بۆ ئێمە ئاسانە. مرۆڤی کوردیش لە بەردەم هەڕەشەکردنی ئەم جۆرە کەلتوورە ڕامیارییەدایە. بەکارهێنانی هێز لەم ڕووەوە، لە لایەن ڕەوەی نامۆوە ئاکامێکی نالەباری هەیە. بەکارهێنانی ئەو

هێزە دەبێتە هۆ بۆ سەرهەڵدانی کارەسات و خراپە.[129] ئەو مرۆڤە بەرزەی نیتشە خەونی پێوە دەبینێت سەرکردەیەکی نازی نیە، کە دەبێت بە سەرچاوەی شێواندنی جوانی و ڕێگەنەدان بە جیاوازییەکان. تێنەگەیشتنی ئەلیزابێت و نازییەکان لە فەلسەفەی نیتشە لە سەر ئەم خاڵە ڕاوەستاوە. ئەوان مرۆڤی بەرز بە هیتلەر و دەستە و تاقمە بکوژەکەی دادەنێن. دڵنیام، ئەگەر نازییەکان بە دروستی لە فەلسەفەی نیتشە تێبگەیشتنایە پەرتووکەکانیان لەگەڵ پەرتووکەکانی مارکسدا دەسوتاند.

لەگەڵ ئەم تاوانە گەورەیەی ئەلیزابێت و نازییەکان بەرانبەر نیتشە کردیان، بیروباوەڕی ئەم فەیلەسوفە لە ژێر تەم و مژی ئایدیۆلۆجی نازییەکاندا نەشاردرایەوە. تاریکایی ئەو شەوەی مێژوو نەیتوانی ڕووناکییەکەی بکوژێنێتەوە. ئەوانەی بە دروستی لە ناوەڕۆکی بیروباوەڕەکەی تێگەیشتن هەوڵیاندا بە قووڵی بیخوێننەوە و سودی لێوەرگرن. خایم وایزمان، یەکەم سەرۆکی ئیسرائیل لە چەند نامەیەکیدا بۆ هاوسەرەکەی پێشنیاری ئەوە دەکات نیتشە بخوێنێتەوە و لە فەلسەفەکەی تێبگات.[130] مارتن بیوبەر، فەیلەسوفێکی جولەکە لە ژیاننامەکەیدا باسی ئەوە دەکات، کە فەلسەفەی نیتشەی هێندە بە لاوە گرنگ بووە بەشی یەکەمی (زەردەشت وای گوت)ی بۆ زمانی

129 - Friedrich Nietzsche. *The Will to Power*, p. 350.

130- خایم وایزمان لە نامەیەکیدا، کە لە٣ی ئابی ١٩٠٢ بۆ هاوسەرەکەی نووسیوە دەڵێت، (پەرتووکێکی نیتشەت بۆ دەنێرم. بیخوێنەرەوە و لێی تێبگە. بە ڕای من ئەمە باشترین دیارییە بۆتی ڕەوانە دەکەم). بڕوانە:
Walter Kaufmann. *Nietzsche: Philosopher, Psychologist, Antichrist*, p. 419.

PDF 4 KURD

پۆڵۆنی وەرگێڕاوە.[131] کارڵ یاسپەرز لە ساڵی ١٩٣٤تا ١٩٣٥ چەند وانەیەکی لە سەر فەلسەفەی نیتشە گوتەوە و لە پاشاندا لە شێوەی پەرتووکێکدا لە ساڵی ١٩٣٦ لە چاپدران. یاسپەرز هەوڵیداوە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشە، بە پێچەوانەی نازییەکانەوە دەربخات و دەڵێت،

> نیتشە گەورەترین فەیلەسوفی سەدەی ڕابردووە. هیوام وایە تەفسیرێکی دروست و بێ لایەنانە بۆ چوونە فەلسەفییەکەی بکەم. لە ساڵی١٩٣٤- ١٩٣٥ هەوڵمدا تەفسیرەکەم بە پێچەوانەی تەفسیری نازییەکان بێت.[132]

هایدیگەر لە ساڵی ١٩٣٦ تاکو ١٩٤٠ زنجیرەیەک وانەی لە سەر فەلسەفەی نیتشە گوتەوە. بۆچوونەکەی هایدیگەریش لەم وانانەدا هەوڵدانێک بوو بۆ پاکردنەوەی ناوی نیتشە و بە نازی نەکردی ئەم فەیلەسوفە. ئەم وانانەی هایدیگەر، کە ئێستا لە چوار بەرگدا بە زمانی ئینگلیزیش لە چاپدراون لە دوو ڕووەوە گرنگن. یەکەم لەو ڕووەوە، کە هایدیگەر بۆ ماوەیەکی کورت پەیوەندی لەگەڵ نازییەکان هەبووە و لە ڕووی دووەمەوە نازییەکان لەو وانانەی هایدیگەر ناڕازبوون. بۆچوونەکانی هایدیگەریان بە نەیاری ئایدۆلۆجی

---

131- هەمان سەرچاوەی پێشو. مارتن بیوبەر(١٨٧٨-١٩٦٥) فەیلەسوفێکی جوولەکەیە لە شاری ڤیەننا لە دایک بووە. لە سەر فۆلکلۆری جوولەکە و ڕۆمان و تیۆلۆجی و تەسەووف و فەلسەفە نووسیویەتی. یەکێک لە نووسراوەکانی (من و تۆ) لە جیهانی فەلسەفە و تەسەووفدا جێگایەکی دیاریکراوی هەیە. بیوبەر زۆربەی تەمەنی لە ئیسرائیل بە سەر بردووە و لەوێ مردووە.

132- بڕوانە پێشەکی یاسپەرز بۆ چاپی سێیەمی پەرتووکەکەی لە سەر نیتشە:
Karl Jaspers. *Nietzsche: Introduction to the Understanding of his Philosophical Activities*, P.xiii.

نازی و تەفسیری خۆیان بۆ نیتشە داناوە. هایدیگەر لەم بارەیەوە لە چاوپێکەوتنەکەییدا لە ساڵی ١٩٦٦ لەگەڵ گۆڤاری *Die Spiegel* دا دەڵێت،

> دوای وازهێنانم لە سەرۆکایەتی زانکۆ زیاتر خۆم بەوانە گوتنەوە خەریک کرد. لە هاوینی ١٩٣٤ وانەم لە سەر لۆجیک دەدا و دوای ئەمەش لە سەر هۆڵدەرلن.
> لە ساڵی ١٩٣٦ وانەکانم لە سەر نیتشە دەستیانپێکرد. هەموو ئەوانەی ئامادەی وانەکانم بوون و گوێیان لە دەنگم بوو دەیانزانی من دژی نازی دەدوام.[133]

نازییەکان لە نزیکەوە چاویان بڕیبوە چالاکییەکانی هایدیگەر و دکتۆر (هانکە)یان کردبوو بە سیخوڕ بە سەریەوە. دکتۆر هانکە خوێندکاری فەلسەفە بوو، لە ژێر دەستی هایدیگەر خوێندبووی. نەیدەتوانی زیان بە مامۆستاکەی بگەیەنێت. کاتێک هایدیگەر وانەکانی لە سەر نیتشە گوتەوە، هانکە بۆ ئەوەی خۆشی لەگەڵ نازییەکاندا توشی گرفت نەبێت ناچار بوو خۆی لای هایدیگەر ئاشکرا بکات و هایدیگەریش ئاگادار بکات ئاگای لە خۆی بێت،

> دکتۆر هانکە هات بۆ لام. ئەو دکتۆراکەی لە زستانی ١٩٣٦-١٩٣٧ تەواوکرد و لە ساڵی ١٩٣٧ ئامادەی سێمینارەکانی من دەبوو. دکتۆر هانکە لە لایەن دەستگای ئاسایشەوە دانرابوو من بخاتە ژێر چاودێرییەوە. لە بەر وانەکانم لە ساڵی ١٩٣٧ لە سەر نیتشە، ئەو گوتی، کە لەوە زیاتر

133- Martin Heidegger. *Philosophical and Political Writings*, edited by Manfred Stassen, London: Continuum, 2003. P. 33.

ناتوانێت من بخاتە ژێر چاودێرییەوە و داوای لێکردم ئاگام لە خۆم بێت.[134]

دواجار نازییەکان سزای هایدیگەریان دا و چالاکییەکانیان بڕی. بەڵام نکۆڵی لەوە ناکرێت، کە وانەکانی لە سەر نیتشە جێگا و گرنگی خۆی دیاریکردووە. ئەمڕۆ سەرچاوەیەکی سەرەکین بۆ تێگەیشتن لە بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە. نیتشە کاریگەرێتی خۆی بە سەر بیریارە بوونخوازەکانی، وەکو سارتەر و کامۆ و پێشەوایانی فێرگەی پاش- بونیادگەرایەتی یان پاش تازەگەرایەتی بە جێهێشتوە. هەر یەکێک لەم بیریارانە بۆ پەرەسەندنی بیروباوەڕی فەلسەفی خۆی سودی لە نیتشە وەرگرتوە. ئێمە هەوڵدەدەین لەم بەشەدا ئاماژە بۆ ئەم لایەنە بکەین و ڕوونی بکەینەوە چۆن هەندێک لەم بیریارانە گەڕاونەتەوە بۆ بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی نیتشە و بەکاریانهێناوە. لە نێو ئەم بیریارانەدا لە هەموویان گرنگتر هایدیگەرە، کە نەک بە تەنیا سودی لێوەرگرتووە بەڵکو نووسراوێکی بە نرخیشی لە سەر نیتشە لە چوار بەرگدا بۆ ئێمە بەجێهێشتوە و هەوڵدەدەین لەپێش بیریارەکانی دیکەوە ڕۆشنایی بخەینە سەر بۆچوونەکانی.

هایدیگەر یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی لە ڕوانگەی بۆ چوونە فەلسەفییەکەیەوە مامەڵەی لەگەڵ بیر و مێژووی گەشەکردنی بیرداکردووە. هەوڵیداوە بیر و مێژووی بیر بۆ بەڵگە و سەلماندنی دروستی پرۆژە ئۆنتۆلۆجییەکەی خۆی، کە (بوون) بە ڕاستییەکی لە پێشتر و بنەڕەتی دادەنێت بخاتەگەڕ. بەڵام مامەڵە لەگەڵ مێژووی بیردا، بە تایبەتی بیرکردنەوەی فەلسەفییانە ڕەخنەگرانە و داهێنەرانەیە. هەر

134 - هەمان سەرچاوە. ٩٧

دوو ئەم لایەنە لە سەر میتۆدێکی تایبەتی بناخەکانیان دادەکوتن، کە هایدیگەر بە هەڵوەشاندنەوە Deconstruction ناوزەدی دەکات. لە بەر ڕۆشنایی میتۆدی هەڵوەشاندنەوەدا بۆچوونە فەلسەفییە ئۆنتۆلۆجییەکان لە ئەفلاتونەوە هەڵدەوەشێنێتەوە و دەیەوێت بیسەلمێنێت (بوون) لە هەموو شتێکی دیکە لە پێشترە و بە بێ بوون هیچ ڕاستەقینەیەکی ئۆنتۆلۆجی و مێژوویی دانامەزرێت. بیریارانی ڕۆژئاوا لە ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە ئەم خاڵە بنەڕەتییەیان فەرامۆش کردووە. پەلاماری (هەبوو)ەکانیان داوە و (هەبووەکان) نەک (بوون) بوون بە بابەت و ناوەڕۆکی توێژینەوە فەلسەفییەکەیان. لە ئاکامدا بیرکردنەوەیەکی فەلسەفی سەریهەڵداوە ، کە لە (بوون) ناکۆڵێتەوە. لەو ڕاستییە نامۆ بووە و خۆی بە لایەنێکی نزم و خۆ-ڕانەگرەوە ماندوو کردووە. بە بیروڕای ئەم بیریارانە (بوون) بە پێچەوانەی هەبووەکانەوە ڕاستییەکی بابەتی و شتێک نیە بیرکردنەوە لە دەرەوەییدا بیدۆزێتەوە. چەمکێکە لەناو بیرکردنەوەدا پەیوەندی لەگەڵ بابەتێکی نێو داکەوتدا نابەستێت. بوون شتێک نیە لە نێو کات و شوێندا بدۆزرێتەوە و ئاماژەی بۆ بکرێت.[135] بیروڕای ئەم بیریارانە بە گوێرەی ئەپستمۆلۆجییە هۆشەکییەکەیان و لۆجیکەکەیان پەیڕەوی دەکەن ئەم دەرەنجامە نەرێیانە سەبارەت بە ناسینی (بوون) لۆجیکمەندانەیە. هاوکات بۆ ناسینی (بوون) ناگونجێت. ئێمە ناتوانین ناسینی (کات)، بۆ نموونە، ڕەتدەینەوە و هەڵیوەشێنینەوە لە بەر ئەوەی (کات) شتێک نیە بکەوێتە بەر ڕۆشنایی ئەو ئەزموونە ئەپستمۆلۆجییەی بەکاری دەهێنین. شێوازی

135- شەهاب ئەلدین سوهرەوەردی، بە (المقتول)و (شێخ الاشراق) ناوزەد کراوە لە پەرتووکەکەیدا (حکمةالاشراق) بە هەمان شێوە ڕەخنە لە ڕاستی (بوون) دەگرێت. ناوەڕۆک (الماهیة) پێش بوون دەخات. ئەم بۆچوونەی سوهرەوەردی، کە دواجار مەلاسەدرا ڕەتیدایەوە پێدەوترێت (اصالة الماهیة).

ئەپستمۆلۆجی و میتۆدی گەڕان بە شوێن (بوون) دا لای ئەم بیریارانە خراونەتە بەردەست بۆ ئەم مەبەست شیاو نین.

بێجگە لە لادان لە توێژینەوە لە سەر(بوون)و خۆماندووکردن بە شتە (هەبوو)ەکانەوە بیریارەکان ئۆنتۆلۆجی ناوچەگەرایەتییان دامەزراندووە و کردوویانە بە ویستگەی سەرەتا و کۆتایی گەشتە فەلسەفییەکەیان. لەمەشدا نەیانتوانیوە جیاوازییە بنەڕەتیەکانی نێوان دوو جۆر ئۆنتۆلۆجی؛ ئۆنتۆلۆجی هەبووەکان و ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ بخەنەڕوو. ئەوان (بیرکردنەوە)یان بە خاڵێکی سەرەکی جیابوونەوەی ئەم دوو جۆرە ئۆنتۆلۆجییە داناوە. مرۆڤ بە بیرکردنەوە لە شتێکی هەبوو(وەکو دار و بەرد) جیاکردۆەتەوە. ئەم جیاوازییەشیان بۆ سەرچاوەیەکی مێتافیزیکی چەقوەستاو گەڕاندۆتەوە، کە ئەویش، وەکو هەبووەکان خاوەنی چییەتییەکی نەگۆڕ و لە پێشترپێدراوە. بە تێکڕا، بیرکردنەوەی فەلسەفی ڕۆژئاوا لە ئەفلاتونەوە بۆ نیتشە نوێنەرایەتی ئەم نامۆبوونەی بیرکردنەوە لە بنەڕەتی خۆی دەکات. نیتشەش دوا بیریاری ئەم بۆچوونە ئۆنتۆلۆجییەیە و بنەڕەت بە سەرچاوەیەکی نزمتر و لەپاشتر لە(بوون)ەوە دەبەستێتەوە.[136] بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم کێشەیە هایدیگەر لە نووسراوێکیدا بەم شێوەیە پێناسی هیچگەرایەتی دەکات و لە دوا جاردا بە مێتافیزیکی ئەفلاتون و بیریارانی دوای ئەفلاتون

136 - Martin Heidegger. *Contributions to pilosophy(Enowning)*, translated by Perviz Emad and Kenneth Maly, Bloomington: lndiana University Press, 1999. P. 97

هەروەها بڕوانە:

Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol.1, translated by David Farrell Krell, New York: Harper and Row, 1991. P. 150.

و نیتشەوە ی گرێ ی دەدات،

لە کوێدا هیچگەرایەتی سەرهەڵدات لەوێدا بیر لە ناوەڕۆک دەکرێتەوە و پرسیارکردن سەبارەت (بوون) ڕەتدەدرێتەوە. بوون، وەکو نەبوون یان (هیچ) مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. لەبیرچوونی بوون و جەختکردن لەسەر ناوەڕۆک هیچگەرایەتییە.[137]

مێتافیزیکی نیتشە (بوون)بە )هیچ **nihil**) دادەنێت. (ویستی هێز) دەکات بە بنەڕەتی هەموو شتێک. ویستی هێز ئەو ناوەڕۆکەیە لە نێو هەموو شتێکدا هەیە و هیچ شتێک بە بێ ئەو نابێت. گەڕانەوەی هەموو شتێک بۆ ناوەڕۆک، کە لە سیستەمی مێتافیزیکی ئەفلاتونەوە دەستپێدەکات نیتشەش دەخاتە ڕیزی شوێنکەوتوانی ئەم جۆرە مێتافیزیکەوە، کە بە ناوەڕۆکگەرایەتی دەناسرێت. ئێمە لەگەڵ هایدیگەردا لە ەر ئەم خاڵە و ئەم تێگەیشتنەی فەلسەفەی نیتشە هاوڕاین، بەڵام پێویستە ئاماژە بۆ جیاوازی نێوان ئەفلاتون و نیتشەش بکرێت. نیتشە دژی فێرگە هۆشەکییەکەی ئەفلاتون و کەلتووری ئەپۆلۆی ڕووتە. ئەگەر مێتافیزیکی ئەفلاتون و نیتشە لە هەندێ لایەنەوە لە یەکدی بچن ئەوا لە لایەنی دیکەوە جیاواز و ناکۆکن.

وانەکانی هایدیگەر لە چوار بەشدا بڵاوکراونەتەوە. هەر بەشێک لەوان مامەڵە لەگەڵ کێشەیەکی فەلسەفەی نیتشەدا دەکات. بەشی

137- Martin Heidegger. *An Introduction to Metaphysics*, translated dy Relph Manheim, New Haven: Yale University Press, 1987. P. 203.

یەکەم بە ناوی (ویستی هێز وەکو هونەر) لە چەند وانەیەکدا لە وەرزی خوێندنی زستانی ١٩٣٦-١٩٣٧ لە زانکۆی فرایبۆرگ و بەشی دووەمی (گەڕانەوەی هەمیشەیی) لە وەرزی خوێندنی هاوینی ١٩٣٧ دا لە هەمان زانکۆ پێشکەش کراون. وانەکانی دیکە لە دوو بەرگی دیکەدا لە چاپدراون دوو ساڵ دوای ئەم وانانەی پێشو ئامادەکراون. هەندێکیان لە بەرگی سێیەمی پەرتووکەکە بە ناوی (ویستی هێز وەکو زانین و مێتافیزیک) و بەرگی چوارەم لە سەر (هیچگەرایەتی Nihilism) لەساڵی ١٩٣٩ تاکو١٩٤٠ لە زانکۆی فرایبۆرگ پێشکەش کراون.

ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە هایدیگەر لە ئۆنتۆلۆجییەوە توێژینەوەکەی دەست پێناکات. ڕاستەو خۆ لە بۆچوونەکەیەوە سەبارەت هیچگەرایەتی و پەیوەندی مێتافیزیکی نیتشە بە ئەفلاتونەوە ناکەوێتەڕێ. هەوڵیداوە ناوەڕۆکێکی ڕادیکاڵانەی (ویستی هێز) لە نێو هونەر و بەرهەمی هونەرییدا ڕوون بکاتەوە. ئێمەش لەم توێژینەوەیەمان لە کێشەی تراجیدیا و هونەرەوە گەشتەکەمان دەستپێکردووە. بەڵام مەبەستی ئێمە لەوەی هایدیگەرەوە جیاوازە. دەستپێکردنەکەی ئێمە بە قۆناخی گەشەکردنی بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشەوە وابەستە. هایدیگەر ئاوەڕی لەم خاڵە نەداوەتەوە. ئەو دەیەوێت بیسەلمێنێت نیتشە فەیلەسوفێکی ڕادیکاڵ و ڕەسەنە و دژی بە نامرۆڤکردن و ناڕەسەنایەتییە. ئایا پەیوەندی هونەر بە ناڕەسەنایەتی و بە نامرۆڤکردنی مرۆڤەوە چییە؟ گریمان هونەر و نازیزم لەگەڵ یەکدی ناکۆکن، خۆ نازییەکانیش هونەرمەندییان هەبووە و گەلێک لە گەلەریی هونەری و هۆڵی سەمفۆنی و شانۆیان دامەزراند. ئایا ئەوە هونەر نەبوو، کە نازییەکان شانازییان پێوە

دەکرد؟ ئەم پرسیارانە لە ناوەڕۆکی بەرهەمی هونەری و چییەتی ئەو ناوەڕۆکە ناکۆڵنەوە. تێگەیشتنی ئێمە بۆ هونەر و بەرهەمی هونەری پەیوەندی بە بیروباوەڕ و بۆچوونی مێتافیزیکییەوە هەیە، کە من لە شوێنێکی دیکەشدا ڕوونم کردۆتەوە.[138]

ویستی هێز دەستەڵاتی (داهێنان)ە. داهێنانیش لاسایکردنەوە و وەرگرتن نیە. پەلکێش کردنی بوونە لە نەبوونەوە.[139] ئەم پێناسەیە لە بەر ڕۆشنایی مێتافیزیکی ئەفلاتون و ئەریستۆدا بێ واتا و نەگونجاوە، چونکە هیچ بوونێک لە نەبوونەوە پەیدا نابێت. لە بۆ چوونی مێتافیزیکی ئەفلاتوندا، ئەوەی هەیە وەرگیراوی فۆرمەکەیەتی، کە لە جیهانی بەرزدا دانراوە. هیچ شتێک نوێ نیە و بۆ یەکەم جار پەیدا نەبووە. بەرهەمی هونەریش وەرگیراوە و کۆپی و لاسایکردنەوەی شتێکی دیکەیە. تابلۆیەکی هونەری داهێنان نیە، بەڵکو لە بەر وەرگرتنی داکەوتێکە، هونەرمەند بێجگە بە لاسایی کردنەوەی ئەو داکەوتە شتێکی دیکەی پێک نەهێناوە. ئەمەش ئاکامی ڕوانینە مێیافیزیکییە ئەفلاتونییەکەیە، کە جیهانێکی بەرز و پڕ و تەواوکۆ لە نهۆمی دووەم و جیهانی ئێمەی لە بەروەرگیراویش لە نهۆمی یەکەم دادەنێت. جیهانی نهۆمە بەرزەکە سەرچاوەی جیهانەکەی خوارەوە و هەموو هەبووەکانی ناوییەتی. جیهانێکە پڕ و هیچ نەویست. لە بەرئەوە گۆڕانکاری تێدا ڕوونادات. لەم بۆ چوونەوە مەحاڵە بیر لە پەلکێش کردنی بوون لە نەبوونەوە بکەین. نەبوون لەو حاڵەتەدا باسی لێدەکرێت، کە بوون پڕ و تەواوکۆ نەبێت

138 - بڕوانە: محەمەد کەمال ، بوون و داهێنان، سلێمانی، دەستگای سەردەم، ٢٠٠٥. لاپەرە ١١٣.

139- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ١١٥.

بەو هەژارییەوە هەبێت. بوونی مرۆڤ لە فەلسەفەی نیتشەدا لە پێشتر (هەبوو) نیە. بوونێک نیە پڕ و تەواو بێت و لە کەموکورتی یان نەبوونی بەدەر بێت. بوونێکە کە نیە. مەبەست لەم نەبوونیە ئەوەیە، کە مرۆڤ بە پڕی و تەواوی نەهاتۆتە جیهانەوە. ناوەڕۆک و خۆڕسکێکی چەسپاو و نەگۆڕی پێنەدراوە. لەم نەبوونییەی بوونیەوە، بە پێچەوانەی هەبووەکانەوە، مرۆڤ بوونی خۆی دادەمەزرێنێ و ناوەڕۆکی خۆی دادەهێنێت. بۆ نیتشە پاڵپێوەنەری ئەم ڕەوتە و پەیداکردنی گۆڕانکارییەکان ویستی هێزە. لەم ڕێگەیەوە بوونی مرۆڤ دەبێت بە بوونێکی هونەرمەندانە. پەلکێشکردنی بوونێکی پەیدانەبوو لە نەبوونەوە دەبێت بە پرۆژەی ژیانی ڕۆژانە و مرۆڤ هونەرمەندانە دەژی.[140] ژیانی هونەرمەندانە ژیانێکی پڕ واتاو سەربەستە چونکە بوونی مرۆڤ لە داهێنان دانابڕێت و بە بەردەوامی ئەو بوونە بەرەو پڕی و بەرزی دەبات. ئەم شێوەیەی بوونیش سەرچاوەی هونەرە، بەو واتایەی هایدیگەر و نیتشە پێناسی دەکەن، ناوەڕۆکی مرۆڤی بەرزە. بەڵام ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت مرۆڤی نزم یان (نازی) بێ هونەرە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە نەرێیە. ناتوانین مرۆڤی نزم لە هونەر بێبەش بکەین یان بڵێین هونەری نیە. مرۆڤی نزمیش چێژ لە بەرهەمی هونەری وەردەگرێت و تەنانەت بانگەشەی هونەرمەندی بۆ خۆشی دەکات. واگنەر هونەرمەندە و نازییەکان بە کەڵە هونەرمەندی مۆسیقای ئەڵمانیان دادەنا.

تێگەیشتن لە واتای هونەر دەگەڕێتەوە بۆ بۆچوونی مێتافیزیکی و ڕاڤەکردنی بوونی مرۆڤ لەو بۆچوونەوە. ئەگەر هونەر داهێنان بێت و داهێنانیش پەلکێشکردنی بوون لە نەبوونەوە بێت، کە بۆ تەواو

140- Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol.1, p. 69.

کردنی بوونی مرۆڤ و بەڕەسەن کردنی ئەو بوونە دەبێت بە مەرجێکی بنەڕەتی، ئەوا زۆر کەس ناسنامەی هونەرمەندێتی لێدە سەندرێتەوە و هونەرەکەی دەبێت بە لاسایی کردنەوە. هونەری مرۆڤە نزمەکان خسڵەتی لاسایکردنەوە و (باو)ی هەیە. هونەرێکە بوونی تاکەکان لە قۆناخێکی نزمەوە بە قۆناخێکی بەرزتر ناگەیەنێت. سەردەمەکەی ڕەت ناکات. بێجگە لەوەی هەموو تاکەکان (مرۆڤە نزمەکان) شوێنی دەکەون، هونەرێکە سازش بۆ بەها باو و دامەزراوەکان دەکات و دەستەڵاتی ڕەتدانەوەی نیە. شوێنکەوتوانی ئەم جۆرە هونەرە مرۆڤە بە نامرۆڤکراوەکانن، کەسانی ناو ڕەوەکەن، کە ڕەسەنیەتی خۆیان دۆڕاندووە و بوونیان داگیرکراوە. ویستی هێزی نیتشە سەرچاوەی داهێنانی هونەری و سەقامگیرکردنی ڕەسەنیەتی بوونە. نابێت بە دەستەڵاتێکی ڕامیاری داگیرکەر و چەوسێنەر. هونەر و داهێنانی هونەری لەم گەندەڵییەوە دوورە و لەگەڵ بە نامرۆڤکردنی مرۆڤدا دژایەتی دەکات. هونەرێکە ڕەسەنانە لە بوون تێدەگات و مرۆڤایەتی لە نامۆیی دەپارێزێت و هایدیگەر گوتەنی دەبێت بە هێزی ڕزگاریکەر.[141] بەستنەوەی ویستی هێز بە داهێنانەوە و داهێنانیش بە ڕەسەنیەتی بوونەوە ڕاڤەکردنێکی بوونخوازانەی فەلسەفەکەی نیتشەیە. ئێمە لە سەرەتای ئەم توێژینەوەیەمان لەم پەرتووکەدا پەیڕەویمان کردووە و لێرەشدا هایدیگەر دەیەوێت ئاماژەی بۆ بکات. هەروەها ئەم ئاماژەکردنەی گەلێک لە بۆچوونە فەلسەفییەکەی لە پەرتووکی (بوون و کات) سەبارەت دوو شێوازی بوونەوە، ڕەسەن

---

141- Martin Heidegger. ”Questions Concerning Technology“, in *Basic Writings*, translated by Davil Farrell Krell, London: Routledge, 1996. P. 341.

و نارەسەن نزیکە.[142] هۆکاری جیاکردنەوەی ئەم دوو شێوازی بوونە بۆ نیتشە و هایدیگەر ئۆنتۆلۆجییانە نیە. بوونێکی ڕەسەن بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی جیاوازتری لە بنەڕەتی بوونێکی نارەسەن پێنەدراوە. هۆکاری جیاکردنەوەکەیان فینۆمینۆلۆجییانە و مێژووییە. بارودۆخێکی تایبەتە و سەریهەڵداوە. بوونی تاکێک لە سەر بنەڕەتە ئۆنتۆلۆجییەکەی نابێت بە ڕەسەن و ئەویدیش بە نارەسەن، تاکێک کۆیلە و ئەویدیش خاوەن کۆیلە. هیچ تاکێک بە نارەسەنییەوە پەیدا نەبووە و بە نارەسەن کراوە. ڕەسەنی و نارەسەنی بوون ڕووداون و تاکەکان خۆیان بڕیاری لە سەر دەدەن. تاکێک خۆی خاوەن خۆیی یان شێوازێکی دیکەی بوون هەڵدبژێرێت. ئێمە بەو جۆرەی بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ نارەسەنی بوون ڕەتدەکەینەوە بە هەمان شێوەش باوەڕ بە بوونی بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی بۆ ڕەسەن بوونی ئەو بوونە ناهێنین. ئەو بوونەی باسی دەکەین لە بونیادە ئۆنتۆلۆجییەکەیدا هەژارترین بوونە و هیچە و هاوکات دەوڵەمەندترین بوونیشە. بوونێکە لەو (هیچ) ەوە ئاگامەندانە هەوڵی دامەزراندنی خۆی دەدات. ئەگەر لەم پێگەیەوە نەڕوانینە مرۆڤ و بوونی بە بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی و چییەتی ئەو بنەڕەتەوە گرێیبدەین، ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ سەر زەمینە فەلسەفییەکەی دێکارت و ڕاڤە کردنەکەشمان بۆ ئەم بوونە لە کالآیەکی دێکارتییدا خۆی دەپێچێتەوە و بوونە کە بە شتێکی نەگۆڕ و خاوەن خسڵەتی چەسپاو دادەنێت. ئەم کارەش لە بەر ڕۆشنایی فەلسەفەی بوونخوازییدا (بوونگەرایەتی) ناکۆکە. مرۆڤ هەرچییەک بێت، هەرچ شێوازێکی بوونی هەبێت، ڕەسەن یان نارەسەن، خۆی داهێنەری خۆیەتی. نارەسەنی بوون، کە لێرەدا بووە بە ناوەڕۆکی کێشەکەمان بۆ دوورخستنەوەی بیروباوەڕی فەلسەفی

142- Martin Heidegger. *Being and Time*, translated by John Macqua - rie, Edward Robinson, London, Blackwell, 1977. p. 220.

نیتشه له ئایدیۆلۆجی نازییەوە، پلەی جۆراوجۆری هەیە. بە گوێرەی پێکهاتە و سترەکچەرەکانی مێژوو پلە جۆراوجۆرەکانیش دەگۆڕێن. شێوازی ناڕەسەنی تاکێک لە کۆمەڵێکی خێڵگەری و ئایینیدا لە شێوازی ناڕەسەنی تاکێکی کۆمەڵی لیبراڵی سەرمایەدارییەوە جیاوازە. هێشتا ئەم گۆڕانکارییە ئەوە ناگەیەنێت تاک لە کۆمەڵی لیبراڵی سەرمایەدارییدا نامۆ نیە. تاکی نێو ڕەوەی نازی و ئەو قۆناخە مێژووییەی نازییەکان تێدا دەسەڵاتمەداربوون ناڕەسەن و نامۆیە. بوونی ئەو کەوتۆتە نێو ڕەوەکە و ژێر کاریگەرێتی نەریتی ئایدیۆلۆجی و بەهای ڕەوەکە و ڕەسەنیەتی خۆی دۆڕاندووە. ئەو بووە بە یەکێک لە (ئەوان)و جیاوازییەکانی لەگەڵ تاکەکانی دیکەی ڕەوەکەدا لە ناوبردووە. تاکێکە، وەکو (ئەوان) باوەڕی بە هەمان بەهای ڕەوشتی و ئایدیۆلۆجی هەیە، هەڵسوکەوت ئەکات، دێت و دەچێت، حەز لە شتەکان دەکات، لە واتای بوون تێدەگات. شوێنکەوتنی کوێرانە و ناڕەسەن بوونی تاکی نێو ڕەوە نازییەکە چەند جۆرێک تەفسیری بۆ دادەنرێت. من لێرەدا لە دووجۆریان دەدوێم، کە پەیوەندییان بەو بۆچوونە فەلسەفییەوە هەیە پەیڕەوییم کردووە. جۆری یەکەم ئەوەیە ئەو تاکە بە ناڕەسەن کراوە و بە زۆر بوونی داگیر کراوە. لەم حاڵەتەدا تاک لە ناڕەسەنی خۆی بە ئاگایە بەڵام ناتوانێت بارودۆخی ناڕەسەنییەکە بگۆڕێت. لە جۆری دووەمدا تاکەکە ناڕەسەن بوونەکە دەناسێتەوە و دەزانێت، کە بوونی لەنێو نەریتی ڕەوەکەدا ونبووە، بەڵام ئەو نارەسەن بوونە بە ڕێگەچارە و تاکە شێوازێکی بوونی دادەنێت. ئەو لەم حاڵەتەدا درۆ لەگەڵ خۆیدا دەکات و سەربەستی و ڕەسەنیەتی خۆی ڕەتدەداتەوە. بوون بۆ ئەو دەبێت بە بوون لە نێو ڕەوەکەدا. بە بۆچوونی من ئەم درۆ لەگەڵ خۆکردنە چەند پاڵپێوەنەرێکی هەیە و بۆ ناسینیان دەتوانرێت

سود لە توێژینەوە شیکارییەکەی فرۆیدیش بکرێت بە ناوی *Group Psychology and the Analysis of Ego*، کە دەساڵ پێش سەرهەڵدانی نازیزم نووسیویەتی. لەو پاڵێوەنەرە دەروونییە دەدوێت تاکێک لە ژێر کاریگەرێتیەکەیدا دەبێت بە کەسێکی فاشیست. بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە لانەدانە لە توێژینەوە فەلسەفییەکەمان و هەوڵدانی دامەزراندنی ڕاڤەکردنێکی فەلسەفییە بۆ ئەو پاڵپێوەنەرەی تاکە ناڕەسەنەکان بە بڕوای (درۆ لەگەڵ خۆ)کردن دەگەیەنێت. درۆ-لەگەڵ-خۆداکردن پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە ڕوانینی مرۆڤ بۆ بوونی خۆیەوە هەیە. ڕوانینێک، کە ناتوانێت چاوی لە ئاستی ڕاستی بووندا داخات و مرۆڤ بە سەربەست دانەنێت. مرۆڤی سەربەستیش پێویستی بە داهێنان و لێپرسینەوەیە. داهێنان دەستەڵاتێکی لە بن نەهاتوو بە مرۆڤ دەدات. چەند ئەو دەستەڵاتە گەورە بێت ئەوەندەش لێپرسینەوە بە قەدەر دەستەڵاتەکە گەورە دەبێت. ئەوانەی درۆ لەگەڵ خۆیان دەکەن و بەو بارودۆخە بەسەردا سەپێنراوەدا ڕازی دەبن، ڕێگە چارەیەک بۆ ناڕەسەنی و داگیرکردنە نادرۆزنەوە، دەبن بە ژمارەیەکی ناو ڕەوەکە. خۆیان لە لێپرسینەوە بەرانبەر سەربەستییەکەیان دەدۆزنەوە. خۆدۆزینەوەش لە لێپرسینەوە، نکۆڵی کردنە لە سەربەستی و دەستەڵاتی داهێنان. تاکەکانی نێو ڕەوەخەڵک (سەر بە هەرچ دەستە و تاقمێکی ڕامیاری و ئایینی بن) ناڕەسەن و نامۆن، ویستیان داگیرکراوە و هێزی تاکەکەسی خۆیان ونکردووە. ئەوان تەنیا لە نێو ڕەوەکە و لە ڕێگەی ڕەوەکەوە ویستی هێزی خۆیان، کە بووە بە ویستی هێزی ڕەوەکە، دیاریدەکەن و بەبێ ڕەوەکە هیچن.

بۆچوونەکەی هایدیگەر بۆ نیتشە و توێژینەوەکەی لە سەر ویستی

هێز، وەکو هونەر، هونەرمەند لەگەڵ فەیلەسوفدا هاوتەراز دەکات. لە پێشتریش ئاماژەمان بۆ ئەو خاڵە کرد، کە لای نیتشە دوو جۆر فەیلەسوف هەیە: داهێنەرەکان و لاسایکەرەوە.[143] ئەمەش لێرەدا نزمکردنەوەی پلە و ڕۆڵی فەلسەفە نیە، بەرزکردنەوەی هونەرە بۆ ئاستی فەلسەفە و بایەخدانی نیتشەیە بە هونەر و داهێنانی هونەرمەندانە. نیتشە لە نووسراوێکیدا سەبارەت بە ڕۆڵی هونەر دەڵێت، (هونەرمان هەیە تاکو لە ڕاستی دانەپچڕێین).[144] بیرکردنەوەی فەلسەفییانە و هونەر ڕاستی ناسن. ئەو ڕاستیەش ڕاستی بوونە، کە هایدیگەر لە نووسراوەکانی پاش (بوون و کات)، بە تایبەتی لە سەر هونەر و شیعر و تەکنەلۆجیا ئاماژەیان بۆ دەکات و لەم بۆ چوونەی نیتشەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. (زەردەشت)ی نیتشە ئەو کەسایەتییە مێژووییە نیە گەلانی ئێران دەیناسن، بەڵکو واتایەکی میتافۆری پێدراوە و فێرکەرە. بەڵام ئایا زەردەشت چی فێردەکات؟ ئەو دەیەوێت سێ بیرۆکەی گرنگ بە خەڵکی ڕابگەیەنێت: ژیان، ژان و خولانەوە. ئەم سێ بیرۆکەیە سێ ناون بۆ سێ بۆچوونی سەرەکی نێو بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە، کە لێرەدا بەم شێوەیە ڕیزیان دەکەین: ویستی هێز و مرۆڤی بەرز و گەڕانەوەی هەمیشەیی. من واتاکانی ئەم سێ بیرۆکەیەم لە بەشەکانی پێشوی ئەم نووسراوەدا ڕوونکردۆتەوە و نامەوێ جارێکی دیکە لەسەریان بدوێم. ئەوەی گرنگە و بۆ ئێمە مەبەستە ئەوەیە بزانین چۆن هایدیگەر لە واتاکانیان دەکۆڵێتەوە و توانیویەتی بیروباوەڕی نیتشە لە ئایدیۆلۆجی نازییەکان دوور بخاتەوە. هایدیگەریش لەو باوەڕەدایە، کە ویستی هێز ناوەڕێکی مێتافیزیکی هەموو هەبووەکانە و بە تەنیا لە نێو بوونی مرۆڤدا نیە. بەڵام ژان خسلەتێکی مرۆڤانەیە

143- Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol. 1, p. 73.
144- Friedrich Nietzsche. *Will to Power*, p. 435.

چونکە مرۆڤ ئاگامەندە. ژیانیش یان (ویستی هێز) لە گۆڕان و پەرەسەندنی بەردەوامدایە. پەرەسەندنیش پرۆسەیەکی ئاسان و بێتاسە نیە و گۆڕانکارییەکی سەختە و پێویستی بە قوربانیدان و تێکۆشانە. بەڵام ئەو مرۆڤە بەرزەی بەم ژان و ئازارەدا دەڕوا و بۆ گەیشتن بە پلە بەرزەکانی بوونی قارەمانانە تێدەکۆشێت، کەسێک نیە سەریهەڵدابێت و هەبێت. تاکێکی نێو ڕەگەزێکی تایبەتیش نیە لە ڕێگەی ڕەگەزەکەیەوە ویستی هێزی خۆی بێبەزەییانە سەقامگیر کردبێت. مرۆڤی بەرز کەسێکە بارودۆخی مرۆڤایەتی ئەمڕۆ ڕەت دەکات. دەیەوێت ناوەڕۆکێک بە مرۆڤایەتی بدات، کە هێشتا، پێینەدراوە.[145]

ئەو مرۆڤە بەرزەی نیتشە خەونی پێوە دەبینێت بکوژێکی نازی و ڕوخێنەری ژیان نیە. کەسێکە دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا مرۆڤایەتی بە ترۆپکی بەرزی بوون و ژیان بگەیەنێت. ئەمڕۆ، بە دیدی هایدیگەر نە ئەو مرۆڤە بەرزە لە دایکبووە نە ئەو قۆناخە پەرەسەندووەی مێژوویش هاتۆتەپێش. هایدیگەر بە ئاشکرا لەو خاڵە دەدوێت، کە ئەم مرۆڤە بەرزە لەگەڵ سەرکردە و دەسەڵاتی تاکی نێو ڕێکخراوێکی ڕامیارییدا (کە مەبەستی هیتلەر و سەرکردە نازییەکانی دیکەیە) بەراورد ناکرێت، چونکە مرۆڤی بەرز قارەمانی ڕەگەزێک یان نەتەوەیەک نیە و دەستەڵاتی ڕزگاریکەری بوونە. بۆ ئەو هەموو مرۆڤایەتی نەک دەستە و تاقمێک، ڕەگەزی ئەوە. هەموو زەمین، نەک سنوورێکی ڕامیاری دیاری کراو، نیشتمانی ئەوە.[146]

مرۆڤی بەرز لە گۆڕانکاری و پەرەسەندنی بەردەوامدایە. قۆناخەکانی

145- Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol. 2, p. 215.

146 -هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٢١٦.

بوونی لەم پەرەسەندنەدا (کات) ین و هیچ کامێکیان نابن بە قۆناخێکی نەبراوە و هەمیشەیی. لە هەموو قۆناخێکدا، لەم پەرەسەندنە بەردەوامییەدا، لەگەڵ ڕەتدانەوەی بەها هەمەکی و نەگۆڕەکاندا خۆی دەکات بە (پرد)ێک تاکو مرۆڤایەتی بۆ گەیشتن بەو ناوەڕۆکە پەیدانەبوەی بەسەرییدا تێپەڕێت. بەبێ (شەوق) ی بۆ مرۆڤایەتی و نیگەرانی ناتوانێت خۆی بەو پردە بکات. شەوقی ئەویش خەمێکی شیرینە بۆ دوورییەک، کە نزیکە و بۆ نزیکییەک، کە دوورە و پێی نەگەیشتوین. ئایا مرۆڤی بەرز بە چ ڕێگەیەک دەبێت بەو پردەی مرۆڤایەتی بەسەردا بۆ داهاتوویەکی ڕووناکتر و ناوەڕۆکێکی باشتر بپەڕێتەوە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە نیتشە لەو باوەڕەدایە، کە پێویستە مرۆڤی بەرز دەروونی خۆی لە چڵکی تۆڵە سەندنەوە پاک بکاتەوە. ئایا مەبەستی نیتشە لە تۆڵە سەندنەوە چییە؟ بە بۆچوونی هایدیگەر واتای تۆڵە سەندنەوە لەوە فراوانتر و قوڵترە کەسانی سادە و ئەوانەی شارەزاییان لە بیرکردنەوەی فەلسەفییدا نیە تێدەگەن. ئەم زاراوەیە واتایەکی مێتافیزیکی هەیە. تۆڵەسەندنەوە پەیوەندی بە لەناوبردن یان داگیرکردنی ئەو دیاردەیەوە هەیە کەسێکی بریندار کردبێت یان ئەو کەسە خۆی لە ئاستی دیاردەکەدا بە کەمتر دابنێت. لەم ڕووەوە تۆلە سەندنەوە بۆ لە ناوبردنی نزم ئاستی ئەو کەسەیە بەرانبەر دیاردەکە. لە کاتێکدا واتایەکی مێتافیزیکی، هایدیگەر گوتەنی، بە تۆڵە سەندنەوە دەبەخشین ئەو دیاردەیەی لە تۆڵە سەندنەوەدا بەرانبەری ڕادەوەستین و دەمانەوێت تۆڵەی لێبسەنین، دیاردەیەکی مێتافیزیکییە و لەگەڵ تۆڵە سەندنەوەی مرۆڤە نزمەکان لە یەکدی بەراورد ناکرێت. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەو دیاردەیە و تۆڵە سەندنەوەکەش دوو شتی ڕیزپەڕن (ناشان)، بەڵکو دەکەونە ژوور

دیاردە بەردەستەکییەکانەوە و تەنانەت دیاردەیەکە مرۆڤ بە هیچ جۆرێک ناتوانێت بەو جۆرەی کەلوپەلێکی لەبەردەستایە و داگیری دەکات، ئەو دیاردە مێتافیزیکییە داگیر بکات. نیتشە لە بەشی دووەمی (زەردەشت وای گوت) دەنووسێت، (تۆڵە سەندنەوە ویستی ویستێکی نەخۆشە بەرانبەر کات).[147] یان تۆڵەیە دژی کات. ئەو کاتەی، کە ڕابردووە. پێش ئەوەی لە واتای (کات) بکۆڵینەوە ئاماژە بۆ ئەو خاڵە دەکەم، کە واتایەکی مێتافیزیکی بە (تۆڵە) دەبەخشێت. بۆ نیتشە ئەو تۆڵەیە تۆڵەی ویستە، ویستیش بە تەنیا ویستی تاکە کەسێک نیە و ڕاستییەکی مێتافیزیکییە. ویست بوونی هەبووەکانە.[148] لێرەوە تۆڵە بە بوونی هەبووەکان و بنەڕەتی بوونەوە لەگەڵ (کات) دا دەبەستینەوە و پەیوەندی نێوانیان دیاریدەکەین. هەروەها نیتشە کات بە شێوەیەکی دیکە باس دەکات و باشتر بە وشەیەکی دیکە لەو ڕستەیەدا (بەرابنەر کات، بەرانبەر ئەو کاتەی ڕابردووە) ڕوون دەکاتەوە. بەڵام بە بۆچوونی هایدیگەر، کات بە تەنیا ڕابردوو نیە و ئێستا و داهاتووشی هەیە. نیتشەش لە پێناسکردنی کاتدا ئەم سێ ڕەهەندەی کات لە یەکدی جیا ناکاتەوە. دروستە نیتشە لەو ڕستەیەدا تەنیا باسی ڕابردوو دەکات، بەڵام ڕابردوو چۆن پەیدادەبێت؟ ئایا ئەو ڕابردووەی هەمانە لە داهاتوودا نەبووە و بووە بە ئێستا و چۆتە نێو ڕۆخانی ڕابردووشەوە؟ کات گۆڕانکارییەکی بەردەوامە. داهاتوو بەردەوام دەبێت بە ئێستا و ئێستاش بە ڕابردوو. ئێستا و داهاتوو دەڕژێنە نێو ڕۆخانی ڕابردووەوە و لەوێدا بە چەقیوی دەمێنێنەوە و لەوە زیاتر گۆڕانکارییان تێدا ڕوونادات. دەتوانین بە دوو جۆر، ئەگەر بمانەوێ پێناسی (کات) بکەین لە واتاکەی تێبگەین. کات، وەکو

147- Friedrich Nietzsche. *Thus Spake Zarathustra*, p. 138.

148- Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol. 2, p. 223.

ڕەوتکردن بەرەو داهاتوو، هەروەها ڕژانە نێو ڕۆخانی ڕابردووەوە. هەرچەندە، بەو جۆرەی لە پێشتر، لە مامەڵەکردن لەگەڵ بوونی مرۆڤی بەرزدا، من زیاتر گرنگی (داهاتوو)ی کاتم باسکرد و ئەم بوونەم بە بوونێکی (داهاتوویی) دانا، نیتشە و هایدیگەر نایانەوێ بەم شێوەیە واتای کات لەم کێشەیەدا ڕوون بکەنەوە. بێگومان من بۆ مەبەستی تایبەتی خۆم و تێگەیشتنم لە بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە ئەو جەختەم لە سەر داهاتوو کردووە. ئەم دوو بیریارەش مەبەستی خۆیان هەیە و لەم توێژینەوەیەیان دەیانەوێت ڕاستییەکی نوێمان پێبناسێنن. ئەویش ئەو ڕاستیەیە، کە کات ڕابردووە، لە بەر ئەوە دەبێت تۆڵەی لێبسەنرێت. بۆ منیش کات داهاتوو بوو، دەبوایە مرۆڤ بە بەردەوامی هەوڵی بدایە بەو داهاتووەی بگات. ئەمەش پێشکەوتنخوازی بۆچوونی من و پاشکەوتنخوازی نیتشە و هایدیگەر نیشان نادات. بەڵکو دوو بۆچوونی جیاوازە بۆ یەک بابەتی لێکۆڵینەوە، کە هەر دوو بۆچوونەکە لە ئاکامدا بە یەکدەگەن و دەبن بە یەک. بۆ چی تۆڵە دەبێت بە ویستی (ویستێکی نەخۆش)؟ چی ئەو ویستە توشی نەخۆشی دەکات؟ مەبەستی نیتشە لە نەخۆشی توشبوونی گرانەتا نیە، ویست بە بەردەوامی هەوڵی سەقامگیرکردنی پرۆژەکانی دەدات. هەوڵدانەکەی بە بەردەوامی دەبێت بە ڕابردوو. کورت نەفەسی ئێستا و داهاتوو هەروەها حەتمیەتی ڕژان بۆ ڕۆخانەی ڕابردوودا ویستی مرۆڤ نەخۆش دەخات. ویستی هێز ناتوانێت بە بەردەوامی لە ساتێکدا بمێنێتەوە، کە خۆی دەیەوێت. ئەو ساتەی کۆتایی بەخش و بڕاوەیە. بڕانەوەی ساتەکانیش ئاوسانی ڕابردووە.

چی ڕێگەچارەیەک بۆ لەناوبردنی ئەم نەخۆشییەی ویست بدۆزینەوە؟ ئەگەر تۆلە سەندنەوە تێکشکاندنی بابەتی تۆڵەکە بێت، ئەوا ڕاستەوخۆ

دەتوانین بڵێین، ڕێگەچارەی ئەم نەخۆشییە لەناوبردنی (کات)ە. ئەم تۆڵە سەندنەوەیەش بە دوو جۆر بە ئەنجام دەگەیەنرێت. لە لایەکەوە، شوێنکەوتنی ڕێگاکەی سوکرات و هاوبیرانێتی، کە بوونی مرۆڤ تێدا بە نەبڕاوە و نەگۆڕ لە ژوور کاتەوە دادەنێت. لە لایەکی دیکەوە پەنابردنە بەر ڕێگەچارەی شۆپنهاوەر و (بودا) و هەندێک سۆفی موسوڵمانیشە، کە باوەڕیان بە لەناوبردنی بوونە خەمخوار و بڕاوەکەیە و خۆ-تواندنەوەیە لە نێو بوونە گشتگر و هەمەکی و نەبڕاوەکەدا. ئەم بوونە گشتگرە لای شۆپنهاوەر (ویست) و بودا (نێرڤانا) و لای سۆفییەکانی، وەکو بایەزیدی بیستامی و حەللاج بوونی خوایە. لە هەر دوو حاڵەتەکەدا بوونە بڕاوەکە دەیەوێت لە تۆڵە سەندنەوەکەیدا دژی کات و بڕانەوەی بوونی، خۆی بە نەبڕانەوە و بەردەوامی بگەیەنێت. ئەمەش تێکشکاندنی بابەتە تۆڵە لێسەنراوەکە بەو واتایەی لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکاردێت نیە. تێپەڕکردن و خۆ گەیاندنە بە قۆناخ و شێوازێکی بوون لە ژوور ئاستی بابەتە تۆڵە لێسەنراوەکەوە، بە مەرجێک تۆڵەکەرەکە بە بەرزتر و تۆڵە لێسەنراوەکەش نزمتر خۆیان دەربخەن. بۆ نموونە بودا ناسێک یان سۆفییەک لە ڕێگەی تۆڵە سەندنەوەکەیاندا بە ناوی (زوهد)ەوە ژوور حەز و ئارەزووەکانی لەش و جیهانی ماتەری بەردەستیان دەکەون. ئەوان جیهان تێکدەر و ڕووخێنەر نین. دەیانەوێت خۆیان بە مەقامێکی بەرزتر بگەیەنن و بەم شێوەیە تۆڵە دەکەنەوە. بەڵام نیتشە بەم ڕێگایە قایل نیە. ڕێگەچارەیەکی دیکەی بۆ دیاری کردووین، کە بە بۆچوونی من لە بیروباوەڕی سوکرات و شوێنکەوتوانی مێتافیزیکی ڕووناکبینەوە نزیکە و بۆ هایدیگەریش نازانستانە و نافەلسەفیانەیە و زیاتر لە فۆرمێکی ئەفسانەیی (میتۆلۆجی) دا خۆی ڕازاندۆتەوە. ئەمەش گەڕانەوەی نیتشە بۆ

بیروباوەڕی فەلسەفی سوکرات ناگەیەنێت، چونکە جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان ئەم بۆچوونەی نیتشە تاکو ڕادەیەک نزیکبوونەوەی لە بیروباوەڕەکەی سوکراتدا هەیە. مەبەستی نیتشە لە تۆڵە سەندنەوە لە (کات)، کاتیش، وەکو ڕابردوو، بەو جۆرەی هایدیگەر لە واتاکەی دەکۆڵێتەوە ئەوە دەسەلمێنێت مرۆڤی بەرز کەسێک نیە شانازی بە ڕابردووەوە بکات و لەوێدا چەقیبێت و ناسنامەی خۆی لە سەر دابمەزرێنێت. مرۆڤی بەرز ڕقی لە ڕابردووە و تۆڵەی لێدەسێنێت. تۆڵە سەندنەوەکەش سڕینەوە و لە ناوبردنی ڕابردوو نیە. خۆ گەیاندنە بە داهاتوو. هەوڵدانێکی ئۆقرەنەگر و بەردەوام ڕەتکردن و ڕەتدانەوەی ڕابردووە. مرۆڤی بەرز لەم هەوڵدانەدا بە بەردەوامی خۆی دەگەیەنێتە ترۆپکە بەرزەکانی بوون و هاوکات دەیەوێت بەو بەرزییە بۆ هەمیشە بمێنێتەوە و نەمر بێت چونکە کات و بڕانەوەی ژیان هەڕەشەکردن و لەناو بردنی بوونە بەرزەکەیە. پێش ئەوەی کات ئەو بوونە لەناو بەرێت، بوونەکە دەبێت تۆڵەی خۆی بسێنێ و ڕێگە نەدات (کات) فرسەتی پێبهێنێ و کاڵای مەرگ و تراجیدیای بە بەردا بکات. بەو شێوەیەی لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، تۆڵە سەندنەوە لای شۆپنهاوەر و بودا و سۆفییەکان توانەوەی بوونی تاکە هەندکییەکەیە لە نێو بوونی هەمەکی و گشتگردا. یەکبوونە لەگەڵ ویستی هەمەکی و گەیشتن بە نیرڤانا و توانەوە لە بوونی خوادا. بۆ سوکرات و بیریارانی مێتافیزیکی ڕووناکبیرانە گەڕانەوەی بوونی مرۆڤە بۆ سەرچاوەیەکی مێتافیزیکی نەبراوە و نەمر. بۆ نیتشەش تۆڵە سەندنەوەکە و ڕێگەچارە بۆ نەخۆشیەکە گەڕانەوەی هەمیشەییە.[149]

تێگەیشتنی هایدیگەر لە چەمکی مرۆڤی بەرز و ئەو جۆرە بوونە

149- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٢٢٤.

پێشکەوتنخوازانەیە و بە ئاشکرا دژی تێگەیشتنی نازییەکانە لە نیتشە. بۆ هایدیگەر مرۆڤی بەرز (ڕەتدانەوە Negation)یەکی بەردەوام و نەبڕاوەیە. مرۆڤ تیایدا لە هیچ قۆناخێکی بوونیدا ڕەزامەندانە ڕاناوەستێت. لەم پرۆسەی ڕەتدانەوەیەدا بێجگە لە ڕەتدانەوە هیچ شتێکی دیکە نەگۆڕ و ڕەها نیە.[150] ڕەتدانەوەش دژوەستانێکی دیالێکتیکانەیە بەرانبەر ناوەرۆکی ئێستای مرۆڤ و خۆ گەیاندنە بەو ناوەڕۆکەی هێشتا پەیدا نەبووە و سەریهەڵنەداوە. لە مێژووی فەلسەفەدا ئەو ناوەڕۆکە دامەزرێنراوەی ئێستای مرۆڤ لە سەردەمی ئەفلاتون و ئەریستۆوە بە لایەنێکی هۆشەکی ناوزەد کراوە و مرۆڤیش بە (ئاژەڵێکی هۆشیار) دانراوە. ئەم پێناسەیەش بنەڕەتی مێتافیزیکی خۆی هەیە و بوونی مرۆڤ بۆ دوو سەرچاوەی لە یەکدی بە دوور و جیاواز (ئەستو لەگەڵ گیان) دەگەڕێنێتەوە. مرۆڤیش، لەبەر ئوەی لەشی هەیە دەچێتە ڕیزی ئاژەڵەکانی دیکەوە. هاوکات بە پێچەوانەی ئاژەڵەکانی دیکەوە ناوەڕۆکێکی جیاوازی هەیە، کە خاوەنی بیرکردنەوە و هەڵێنجاندنە. ئەگەر جینەکانی لەشی مرۆڤ و مەیمون بە پلەیەکی زۆر لە یەکدییەوە نزیک بن و لێکبچن، ئەوا (هۆش) مرۆڤ دەپارێزێ و لە مەیموونی جیادەکاتەوە .لەبەر ئەمە دەتوانین بڵێین، مرۆڤ مەیموونێکی هۆشیارە. نیتشە بەم جیاوازییەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ قایل نیە و لە بۆچوونی ئەودا مرۆڤە ناشرینەکان (نزمەکان) و مەیمونن و ئەو جیاوازییەیان دۆڕاندووە. مرۆڤی بەرز، کە زادەی ئێستایە، لە ئێستادا ناژی و ڕوو لە داهاتووە. خۆی لە سەر ئەم جیاوازییە ناناسێ و ناوەڕۆکی (ئێستای ناکات بە خاڵی جیابوونەوەی لە ئاژەڵ. هەوڵدەدات ئەو ناوەڕۆکە ڕەتبداتەوە و خۆی لە ئاستی ئاژەڵ و مرۆڤە نزمەکاندا بەرزتر دابنێت. ئەم

150 - هەمان سەرچاوە. لاپەڕە ٢١٧.

کارەش، وەکو پڕۆژەیەکی فەلسەفی بوون، هایدیگەر گوتەنی، بە ڕێگای ڕەتدانەوەی بەردەوام ڕوودەدات. ڕەتدانەوە چەکی بە هێزی مرۆڤی بەرزە و ئاژەڵ و مرۆڤە نزمەکان نەیانتوانیوە پەیدای بکەن. کەسێکیش بتوانێت ئەو چەکەی هەبێت و بەکاریبهێنێت بە بەردەوامی لە پەرەسەندن و گەشەکردندا دەبێت و بوونی نابێت بە ناوەڕۆکێکی وەستاو و گیرخواردوو. کەوابوو، جیاوازی بنەڕەتی مرۆڤ و ئاژەڵ لە (هۆش)دا نیە، لە هێزی ڕەتدانەوەدایە. ئەو هێزەیە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە و مرۆڤێکیش بەرز و ئەویدی بە نزم دادەنێت. گلەیی نیتشە لە پێناسەکە (مرۆڤ ئاژەڵێکی هوشیارە) لەسەر ئەوە نیە مرۆڤ خرابێتە ڕیزی ئاژەڵەوە. نیتشە باوەڕێکی تەواوی بە ئاژەڵ بوونی مرۆڤ هەیە چونکە دژی باوەڕهێنان بە سەرچاوەیەکی مێتافیزیکی هۆشەکی بۆ بوونی مرۆڤ ڕادەوەستێت. یەکێک لە ناکۆکییەکانی نیتشە لەگەڵ ئەفلاتون و ئەریستۆ و دێکارتدا لە سەر ئەو خاڵەیە، کە ئەم فەیلەسوفانە بوونی مرۆڤ بۆ لایەنێکی هۆشەکی بەرز و لە جیهان دابڕاو دەگەڕێننەوە.[151] لەش، لای ئەفلاتون و ئەریستۆ و دێکارت، لایەنی ئاژەڵی مرۆڤ دیاری دەکات بۆ نیتشە ڕاستەقینەی ئەم بوونەیە. بە بێ لەش مرۆڤ نیە یان مرۆڤ لەشە نەک ناوەڕۆکێکی گیانەکی دێکارتی. بەڵام ئەگەر ئێمە باوەڕ بەو لایەنە مێتافیزیکییە شاراوەیەی بوونی مرۆڤ نەکەین، چی شتێک هەیە ئەم بوونە لە بوونی ئاژەڵ جیا بکاتەوە؟ ئایا نیتشە باوەڕی وایە مرۆڤ بە مەیموونی ماوەتەوە و جیاوازی لەگەڵ

151 - ئەفلاتون و ئەریستۆ و دێکارت لە زۆر ڕووەوە بۆچوون و سیستەمی مێتافیزیکییان لە یەکدییەوە جیاوازە. بەڵام دەتوانین نزیکبوونەوە و لێکچوونی بیروباوەڕە مێتافیزیکییەکەیان بەرانبەر بوونی مرۆڤ بسەلمێنین. تەنانەت من کەلتووری دێکارتییم بە (ئەریستۆیی- دێکارتی ناوزەدکردووە. (بڕوانە: محەمەد کەمال، بوون و داهێنان، دەستگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، لاپەڕە، ٧).

ئاژەلدا نیە؟ بۆ زۆر کەس بە تایبەتی ئەوانەی پەیڕەوی مێتافیزیکی ڕووناکین دەکەن، ڕەتدانەوەی (هۆش) یان (ناوەڕۆکی گیانەکی) لەناوبردنی جیاوازی (ناوەڕۆکی)یە لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا. لەم ڕووەوە، لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا دەبینین نیتشە مرۆڤی بە ئاژەڵ داناوە چونکە جیاوازییەکی مێتافیزیکی و بنەڕەتی لە نێوان ئەم دوو بوونەدا نابینێت. ویستی هێزیش، کە ناوەڕۆکی هەموو جۆرە بوونێکە لە بوونی ئاژەڵ و مرۆڤیشدا هەیە. بەڵام چییەتی و چەندەکی ئەو ویستە لە ئاژەڵەوە بۆ مرۆڤ دەگۆڕێت. لەگەڵ ئەم گۆڕانەدا جیاوازییەکانیش سەرهەڵدەدەن. ئەگەر ویستی هێزی مرۆڤ لە نێو (ئێستا)دا مایەوە و نەیتوانی (ئێستا) ڕەتبداتەوە و ڕەتبکات ئەوا بە ئاژەڵی دەمێنێتەوە. لەگەڵ ڕەتدانەوە و ڕەتکردنێکی بەردەوامدا خۆی بە پلەیەکی بەرزتری بوونی دەگەیەنێت و بە ئاژەڵی نامێنێتەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت لەو پلە بەرزەدا واز لە (لەش) دەهێنێت و دەبێت بەبوونێکی لە (ئەستو) بەدەر. مرۆڤ لەشە، لە هیچ قۆناخێکی بوونیدا بە بێ لەش نیە. ئەوەی ڕەتی دەداتەوە و ڕەتی دەکات ناوەڕۆکی ئێستایەتی.[152]

لەگەڵ ڕەتدانەوەی هۆش و ئەم ناوەڕۆکەی بوونی مرۆڤدا، کە لایەنێکی گرنگی مێتافیزیکی هیچگەرایەتییە کێشەیەکی دیکەی گرنگ خۆی لەبەردەممان قوتدەکاتەوە و هایدیگەر لە بەرگی سێیەمی نووسراوەکەی لە ەر نیتشە باسیکردووە. بۆچوونی (بایۆلۆجییانە)ی نیتشەیە بۆ بوونی مرۆڤ، کە نازییەکان زانستانە تەفسیریان کردووە و بۆ مەبەستی ڕامیاری خۆیان بەکاریانهێناوە. هایدیگەر بە پێچەوانەی نازییەکانەوە تەفسیری ئەم بۆچوونەی

152 - Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol. 3, p. 224.

کردووە. هایدیگەر بۆ هەڵوەشاندنەوەی تێگەیشتنی نازییەکان لە بۆچوونی (بایۆلۆجییانە) ی نیتشە بۆ ڕەگوڕیشەی (ئێتیمۆلۆجی) زاراوە فەلسەفییەکە گەڕاوەتەوە. ئەو خاڵە ڕوون دەکاتەوە، کە مەبەستی نیتشە لە بایۆلۆجی لە زانستی بایۆلۆجی ئەمڕۆوە جیاوازە و نابێت هاوتەراز بکرێن. زاراوەی بایۆلۆجی لێکدراوە و لە دوو بەش پێکهاتووە. (بایۆ) لەگەڵ (لۆجی). وشەی (لۆجی) دەخرێتە پاش زۆر وشەی دیکە (سایکۆلۆجی، سۆسیۆلۆجی، ئەیستمۆلۆجی)، کە واتای لێکۆڵینەوە، زانست دەبەخشێت. بۆ نموونە سایکۆلۆجی بە واتای دەروون ناسی، لێکۆڵینەوە لە دەروون، خوێندنی دەروون یان زانستی دەروونی دێت و لەو بەشە دەکۆڵێتەوە، کە بە (دەروون) ناوزەد دەکرێت. بایۆ (*Bio*) بەشی یەکەمی زاراوەکە وشەیەکی یۆنانییە واتای (ژیان) دەبەخشێت. فەلسەفەی نیتشەش لە ژیان دەکۆڵێتەوەو دەیەوێت بنەرەتی ژیان و چییەتی ژیانمان پێبناسێنێت. ئەم بۆ چوونەش لەدوو ڕووەوە لە (بایۆلۆجی) ئەمڕۆوە، وەکو زانستێک جیاوازە. یەکەم لەو ڕووەوە، کە بایۆلۆجی بە گوێرەی پێناسە زانستییەکەی و توێژینەوە ئەکادیمییەکەی لە چییەتی و کارکردنی ئەندامەکانی لەشێکی زیندوو دەکۆلێتەوە. بەڵام ئامانجی نیتشە لەمەوە دوورە و ئەو هەوڵینەداوە زانستانە کارکردنی ئەندامەکانی لەش بناسێت. دەیەوێت لە واتای ژیان (Bio) تێبگات.[153]

لەگەڵ ئەم تێگەیشتنەدا خاڵی دووەمی جیاوازییەکەمان لا ئاشکرا دەبێت. ئەویش تێڕوانینی مێتافیزیکیانەیە نەک زانستانە لە بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشەدا. بایۆلۆجی (زانستانە) ئەو پرسیارە فەلسەفی و مێتافیزیکییە ناکات چۆن ئەندامەکان کاردەکەن و

153- هەمان سەرچاوە، بەرگی سێیەم، لاپەڕە٣٩.

سەرچاوەی جوڵان و گۆڕانیان چییە. زانایەکی بایۆلۆجی دەزانێت دڵی مرۆڤ چۆن کاردەکات و چۆن خوێن بە سەر لەشدا دابەش دەکات، بەڵام ئاماژە بۆ بنەڕەت و سەرچاوەی ژیان ناکات. ئەگەر ئاماژە بۆ ئەو بنەڕەتە بکات ئەوا زانستانە بیرناکاتەوە و توێژینەوەکەی دەبێت بە مێتافیزیکی. پەرەسەندنی ژیان و پێشخستنی بۆ نیتشە لەناوبردنی کەم ئەندامێتی و ڕەشەکوژی ڕەگەزێکی دیکە نیە. دەزانین نیتشە بە ئازاری لەشەوە ژیاوە و نەخۆش بووە. بۆ ئەو تەندروستی و ژیانی بێئازار خەو بووە. تەنانەت ئازار و نەخۆشییەکەی ناودەنێت (سەگ)، چونکە، وەکو سەگ لەگەڵیا بەوەفا بوون و بەجێیان نەهێشتوە.[154] لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە پرۆژەی بایۆلۆجی نیتشە مێتافیزیکییانە بناسرێت چونکە زانستانە مامەڵە لەگەڵ ژیاندا ناکات[155] .

هایدیگەر لە بەرگی چوارەمی پەرتووکەکەیدا هەوڵی ڕوونکردنەوەی ڕاڕەوی مێتافیزیکی هیچگەرایەتی نیتشەی داوە. ئەویش، وەکو ئێمە دەڕوانێتە ئەم ڕاڕەوە هیچگەرایەتییە و لە جۆرەکانی دیکەی هیچگەرایەتی جیادەکاتەوە و ناویدەنێت (هیچگەرایەتی کلاسیکی).[156] لە پێشتر بۆ جیاکردنەوەکەی هیچگەرایەتی ڕەشبینانەی شۆپنهاوەر

---

154– Friedrich Nietzsche. "Seventy-Five Aphorisms", in *Basic Wri - ings of Nietzsche,* translated by Walter Kaufmann, p. 174.

155- نیتشە لەگەڵ ئەفلاتوندا لە سەر لەناوبردن و قەلاچۆکردنی کەسانی کەم ئەندام هاوڕا نیە. ئەفلاتون جێگای کەسانی کەم ئەندام لە کۆمارەکەیدا ناکاتەوە. نازییەکانیش کەسانی کەم ئەندامیان لەگەڵ نێرینەخوازەکان و قەرەج و جولوکەدا ڕەشەکوژکرد.

156- Martin Heidegger. *Nietzsche,* vol. 4, p. 56.

لەوەی نیتشەوە هیچگەرایەتییەکەی نیتشەمان بە (هیچگەرایەتی بەرنامەگەری) ناوزەد کرد. ئەم جیاکردنەوەیەش لە سەر ئەو زەمینە خۆی ڕاگرت، کە ڕەتدانەوە و ڕەتکردن تیایدا بوون بە دوو کۆڵەکەی خۆڕاگر بۆ بۆچوونە مێتافیزیکییەکەی نیتشە و لەوێوە گرنگی داهێنانمان دیاری کرد. ئەو خاڵەمان ڕوونکردەوە، کە هیچگەرایەتی نیتشە خۆی بەو دیو هیچگەرایەتی دەگەیەنێت و دەبێت بە ڕاڕەوێکی بەرنامەگەری، لەم ڕووەوە بۆچوون و ڕاڤەکردنەکەی هایدیگەر لەگەڵ ئەوەی ئێمەدا ناکۆک نیە، بەڵام هایدیگەر هۆی ناونانی هیچگەرایەتییەکەی نیتشەی بە (کلاسیکی) ڕووننەکردۆتەوە. مەبەستی هایدیگەر لە (کلاسیک) دەگەڕێتەوە بۆ هیچگەرایەتییەکەی ئەفلاتون مەبەستەکەی ئێمە (لە بەرنامەگەرایەتی) هیچگەرایەتی نیتشەدا دیار و ئاشکرایە و ڕوونکراوەتەوە. تێگەیشتنی هایدیگەر لە (هیچگەرایەتی کلاسیکی) نیتشە لە دوو خاڵی سەرەکییدا کۆ دەبنەوە: یەکەم، هایدیگەر لەو باوەڕەدایە ئەم هیچگەرایەتییە ئاکامی گەشەکردن و پەرەسەندنی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی ڕۆژئاوایە. فەلسەفەی ڕۆژئاوا لە ئەفلاتونەوە بنەڕەتی بوونی بۆ جیهانێکی بەرز (ترانسدێنتاڵ) گەڕاندۆتەوە. ئەو جیهانە بەرزە پاش تێکەڵبوونی بیروباوەڕی ئایینی لەگەڵ فەلسەفەدا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە ئاشکراتر دەستنیشان کراو بوو بە بوونی خوایەکی خاوەن دەستەڵاتێکی ڕەها. ئەم گۆڕانکارییانە لە بیرکردنەوەی فەلسەفیدا یان باشتروایە بڵێین لە مێتافیزیکدا، لە سەردەمی نیتشەدا گەیشتە قۆناخێک، کە پێویستی بەو خوایە نەمێنێت و ڕاستی بوون لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەمین پەلکێش بکات.[157] نیتشە دوا بیریار و قارەمانی سەردەمەکەیەتی و نێونەرایەتی هەڵوەشاندنەوەی ئەو

157- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە٨ ، هەروەها بڕوانە لاپەڕە٥٣.

جۆرە مێتافیزیکە دەکات و بە کوشتنی خوا بانگەشەی هیچگەرایەتی و سەردەمێکی نوێمان بۆ دەکات. بیرکردنەوەی فەلسەفییانە تیایدا ڕادیکالانە دەبێت بە دەنگی ڕەسەنی مرۆڤ و خاوەنی ئەو زەمینەی مرۆڤ لە سەری دەژی. کۆتاییهێنان بە مێتافیزیکی ڕووناکبینانە و سەرهەڵدانی هیچگەرایەتی لەم پرۆسە مێژووییەدا (لەو ڕووناکی و تیشکی ئەستێرە کوژاوەیە دەکات، پاش کوژانەوەشی ڕووناکییەکەی ماوەتەوە.)[158] خوای مێتافیزیکی ڕووناکبین لە کۆنەوە، وەکو ئەو ئەستێرەیە نەماوە بەڵام ئاسەواری ماوەتەوە. نیتشە بە دامەزراندنی مێتافیزیکییە هیچگەرایەتییەکەی ئەو ئاسەوارە هەڵدەوەشێنێتەوە. خاڵی دووەم ئەو پێنج بنەڕەتەن یان کۆڵەکەیەن، وەکو (مردنی خوا، هەڵوەشاندنەوە و داهێنانی بەها، ویستی هێز، مرۆڤی بەرز، گەڕانەوەی هەمیشەیی) بە دیدی هایدیگەر هیچگەرایەتی نیتشەی لەسەر ڕادەوەستێت.[159] ئەم پێنج بنەڕەتەش پێکەوە گرێدراون و پەیوەندییەکی پێویستیان لە نێواندا هەیە. بەڵام گرنگترین بنەڕەت لە نێوانیاندا مردنی خوایە، کە هایدیگەر جەختی لە سەر دەکات و بە بنەڕەتی یەکەمی دادەنێت و تەنانەت دەیکات بە پێشمەرجێک بۆ چوار بنەڕەتەکەی دوایی. ئەمەش حوکمدانێکی بێبناخە نیە و ڕاڤەکردنێکی گونجاو و ئۆنتۆلۆجییانەیە بۆ فەلسەفەکەی نیتشە. لەگەڵ مردنی خوادا هەموو بەهاکان هەڵدەوەشێنەوە و بێبەها دەکرێن چونکە لە مێتافیزیکی ڕووناکبیندا (خوا) سەرچاوە و داهێنەری بەهاکانە. بە مردنی خوا ئەو سەرچاوەیەش دەڕوخێ و مرۆڤ ناچار دەبێت خۆی بەهاکان دابهێنێت. داهێنانی بەهاکان پێداچوونەوە و پاکسازیکردنی بەها هەڵوەشێنراوەکان نیە. لەگەڵ مردنی خوادا

158- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٤.

159- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٩.

دەبێت بەها کۆنەکان یان ئەو بەهایانەی لەو سەرچاوەیەوە دەرچوون بە تەواوی ڕەتبدرێنەوە و ڕەتبکرێن و بەهای نوێ دابهێنرێت.[160] ئەو مرۆڤەی خۆی بە بکوژی خوا و داهێنەری بەهاکان دادەنێت، کەسێکی ترسنۆک و زەبوون نیە، مرۆڤێکە باوەڕی بە (ویستی هێز)ی خۆیەتی و پاش مردنی خوا سەربەستانە بۆ سەقامگیرکردنی ئەو ویستی هێزە تێدەکۆشێت و دەیەوێت بە بەرزی بژی. مرۆڤی بەرز، وەکو لە پێشتر باسمانکرد، لەگەڵ مردنی خوادا لە دایک دەبێت و ویستی هێزی دەبێت بە سەرچاوەیەکی نوێ بۆ بەهاکان. ژیانی مرۆڤی بەرز لەم ڕوانگە بێبرواگەری و هیچگەرایەتییەوە ڕەوت و گۆڕانکاری بەرەو داهاتوویەکی ڕووناک و نەبڕاوە و پڕمەبەستی لە پێشتر دانراو نیە. هاوکات بە بێهودەیی و گۆڕانکاری و پەیدابوونی کوێرانە و لەواتا بەدەر دانانرێت. ژیانی مرۆڤی بەرز لە بەر ڕۆشنایی مێتافیزیکی ڕووناکبینی و مێتافیزیکی هیچگەرایەتی ڕەشبینیدا ناناسرێت. ئەو شێوە مێتافیزیکەی لە واتای ئەم جۆرە بوونە دەکۆڵێتەوە هیچگەرایەتی (کلاسیکی) نیتشەیە، کە دەستەڵاتی داهێنان لە مێژوودا بە مرۆڤ دەبەخشێ و مرۆڤ بە داهاتووی خۆی دەگەیەنێت. ئەمەش لەگەڵ هەڵوەشاندنەوە و داهێنانی بەهادا دەردەکەوێت، "هەڵوەشاندنەوەی بەهاکان کارێکی پێویستە و واتا بە جیهان دەبەخشێت. دەبێت ئەو جیهانە پێکبێت، کە مرۆڤ تیایدا بتوانێت ناوەڕۆکی خۆی دابهێنێت. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش پێویستە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی بەهاکانەوە بکەوینە ڕێ و لە ویستگەیەکی بێ بەهاییەوە بەرەو داهێنانی بەهاکان گەشتەکەمان دەسپێبکەین."[161]

مرۆڤی بەرز بە ویستی هێزییەوە لە بێ بەهاییەوە ڕوو لە داهێنانی

---

160- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٦.

161- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە ٤٤.

بەها نوێکان دەکات. بۆ ئەو ڕاستی و بەهاکان لە ئاسمانەوە دانەبەزێنراونەتە سەر زەمین. (زەمین) نیشتمانی ڕەسەنی مرۆڤ و ڕاستی و بەهاکانە. مرۆڤ و ڕاستی و بەهاکانی (لێرە) پەیدابوون و مێژوویین. لە بەرئەوەی (زەمین) لە (ئاسمان) دابڕاوە و ڕاستەقینەی دووەمیان پوچەڵ کراوەتەوە، گۆڕانکارییەکانی مێژوو لە ئاسمانەوە بەرە و زەمین و جارێکی دیکە بەرەو ئاسمان ناکەونەڕێ، بەڵکو لە سەر زەمین، بە بێ جێهێشتنی زەمین ڕوو دەدەن. ئەم جۆرە جوڵان و گۆڕانکارییەش (لە زەمینەوە بۆ زەمین) شێوازێکی خولە یان بازنەیی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاڵەی لێوەی دەرچووە. ئەم جۆرە گەڕانەوەیەش لە نێو ئەم جوڵانە بازنەییەدا هەمیشەییە. لە نێو سوڕانەوەکەیدا گیری خواردووە و (گەڕانەوەی هەمیشەیی) بە بوونی مرۆڤی بەرز داوە.[162]

هایدیگەر بۆچوونی مێتافیزیکی نیتشە بە ئەفلاتونی دادەنێت. لەگەڵ ئەمەشدا دەزانین نیتشە ڕەخنەگرانە بەرانبەر ئەفلاتون و ڕاڕەوە هۆشەکییەکەی ڕادەوەستێت. ئایا هایدیگەر چۆن بەم باوەڕە گەیشتوە؟ لە چی ڕوویەکەوە مێتافیزیکی ئەفلاتون و نیتشە بە یەکدی دەگەن؟ بە بیروڕای هایدیگەر (مێتافیزیک) لە ئەفلاتونەوە دەستپێدەکات و ئەم فەیلەسوفە یەکەم کەس بووە هەوڵی گەڕانەوەی بنەڕەتی بوونی بۆ ڕاستییەکی بەرز (ئایدیا) داوە و لەم بەستێنەشەوە مێتافیزیک دەبێت بە مێتا-گوتارێکی (ئایدیالیستانە).[163]

<u>بنەڕەتی بوون بۆ</u> ئەفلاتون (ئایدیا) یان (فۆرمە هەمەکییەکان)ی

162- هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٧.
163 - هەمان سەرچاوە، لاپەرە164.

جیهانی ئەودیو ئەستووە . لە سەرو ئەم ئایدیایانەوە،[164] ئایدیای چاکە Goodness یان **agathon** بەرزترین ئایدیا و بنەڕەتی هەموویانە .[165] ئەوەی سەرنجی هایدیگەری ڕاکێشاوە و بووە بە بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی لێکچوونی مێتافیزیکی ئەفلاتون و نیتشە دانانی بوونە بنەڕەتییەکەیە بە (ئەگاتۆن) **agathon** چاکە یان ئایدیا. بوون بۆ ئەفلاتون (ئایدیا)یە، ئەو ئایدیایەش (چاکە)یە، کە لەو فۆرمە هەمەکی و لە ئەستو بەدەرەدا دەبێت بە چاکەی ڕەها. چاکەش، وەکو دەزانین (بەها)یە. کەوابوو، لۆجیکانە دەگەینە ئەو باوەڕی، کە (بوون) بەهایە یان بنەڕەتی هەموو هەبوویەک، کە (بوون)ە، بەهایە. ئایا ئەمە چی پەیوەندییەکی بە بۆچوونی نیتشەوە هەیە لە کاتێکدا نیتشە باوەڕی بە جیهانی بەرز نیە و پەیڕەوی مێتافیزیکی هیچگەرایەتی دەکات؟ بۆ هایدیگەر ئەگەر (بوون) وەکو خۆی نەناسرێت و بەشتێکی دیکە و جیاوازتر لە خۆی دابنرێت ئەوا بیروباوەڕی فەلسەفی لەو ڕاستەقینەیە نامۆ دەبێت و نیتشە گوتەنیش نامۆ بوون لە ڕاستەقینە هۆکاری (ڕووخان) و خلیسکانە بەرە و وێرانە خاکی شارستانیەت. لێرەدا ئەفلاتون نەیتوانیوە ئەو ڕاستەقینەیە بناسێ و بە شتێکی دیکەی داناوە. بە ئایدیا یان چاکەی ڕەها ناوزەدی کردووە. بێگومان ئەم شێوە مێتافیزیکە لە

164 – ئایدیا (idea) لە زمانی ئینگلیزی بە واتای (بیر-بیرۆکە) دێت.

165– شەهاب ئەلدین سوهرەوەردی، کە بە (المقتول) یان (شێخ الاشراق) ناسراوە سودی لەم بۆ چوونە مێتافیزیکییەی ئەفلاتون وەرگرتووە. لە پەرتووکەکەیدا (حکمةالاشراق) ئەم بۆچوونە بە ئیشراقی دادەنێت و بەرێزەوە ناوی ئەفلاتون دەهێنێت. من لە نووسراوێکمدا لە بەراوردکردنی فەلسەفەکانی سەدرە دینی شیرازی و هایدیگەردا بە درێژی لەم لایەنەی ئەفلاتون و کاریگەرێتی ئەفلاتون بە سەر فێرگەی ئیشراقەوە دواوم. ئەم نووسراوەم لە کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی لە سەر ( مەلاسەدرا) لە تاران لە ساڵی ٢٠٠٤ دا خوێندەوە.

سەر دەستی ئەریستۆ و دێکارت و کانت دا گۆڕانکاری بە سەردا هاتووە. هێشتا ئەم بیریارانەش خۆیان لە کاریگەریێتی ئەفلاتون ڕزگار نەکردوە و لە سەر هەمان زەمینەی مێتافیزیک مامەڵەیان لەگەڵ (بوون) کردووە. نیتشەش دوا فەیلەسوفی گەشەکردنی ئەم شێوازی بیرکردنەوە مێتافیزیکییەیە لە سەردەمەکەماندا پەیڕەوی ئەفلاتون دەکات و (بوون) بۆ (بەها) دەگەڕێنێتەوە و (ویستی هێز)، کە بە بەهای دادەنێت، دەکات بە بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی هەبووەکان و بوونی مرۆڤ.[166] مەبەستی هایدیگەر لەم تەفسیرەیدا بۆ مێتافیزیکی نیتشە، کە لە نووسراوێکی دیکەشدا بەناوی **Contributions to Philosophy** باسیکردووە، تێهەڵکێشکردنی واتای (چاکەی ڕەها)، (ئەگاتۆن) و (ویستی هێز) نیە. بەو جۆرەی ئەفلاتون چاکەی ڕەها لە بەرزترین نهۆمی ئەنتۆلۆجی دادەنێت، نیتشە ناڕوانێتە ویستی هێز. هاوکات لە دوو لایەنەوە بۆچوونە مێتافیزیکییەکانی ئەفلاتون و نیتشە لە یەکدییەوە نزیکن: ئەم دوو بیریارە (بوون) یان فەرامۆش کردووە و بە (بەها) دایانناوە، ئەو بەهایەش، کە بۆ نیتشە (ویستی هێز)ە لە هەمان کاتدا سەرچاوەی (چاکە)یە و دەتوانین لەبەر ڕۆشنایی بیروباوەڕی نیتشە دا بە بەهای چاکەی دابنێین.[167] ئایدیا لە مێتافیزیکی ئەفلاتوندا زادەی بیرکردنەوەی بوونێکی بیرکەر نیە، ئایدیایەک نیە لە نێو بیرکردنەوەدا بێت و بە بێ بیرکردنەوە نەبێت، بوونێکی بابەتگەرانەی لە دەرەوەی بیرکردنەوەدا

---

166- Martin Heidegger. *Nietzsche*, vol. 4, p. 177.

167- پەرتووکی (- *Contributions to Philosophy (From Enoning*، بەرگی (سێیەمی) ی بەرهەمە بڵاوکراوەکانی هایدیگەرە لە ساڵی ١٩٨٩وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی. ئەم پەرتووکە بە شاکارێکی فەلسەفی هایدیگەر پاش (بوون و کات) دادەنرێت.

هەیە. مەبەستی ئەفلاتون لە ئایدیای چاکە ئەو چەمکە هەمەکییە نیە لە نێو بیرکردنەوەدا بە ڕێگەی ڕووتکردنەوەی لە جیاوازییەکان سەریهەڵدا بێت. ئایدیا لە نێو داکەوتی جیهانە بەرزەکەدا بوونێکی ئۆنتۆلۆجی هەیە و بابەتێکە لە ژوور بیرکردنەوەی مرۆڤەوە بۆ هەمیشە دامەزراوە. لە بەر ئەم شێوە بۆچوونە و تێگەیشتنەیە لە چییەتی و چۆنیەتی ئایدیاکان مێتافیزیکی ئەفلاتون، لەگەڵ ئەوەدا ئایدیالیستانەیە بە ڕیالیستانە و بابەتگەرانە دەناسرێت. ئایدیای چاکەی ڕەها، هاوکات، کە سەرچاوەی هەموو هەبوویەکە و ئایدیاکانی تریش دەخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە، لە نێو جیهانی نزمدا نیە و بوونێکی بەرز و جیاوازی هەیە. بێجگە لەوەی بەرز و ڕەهایە بۆ هەمیشە (وەکوخۆی) دەمێنێتەوە و ناکەوێتە ژێر کاریگەرێتی گۆرانکارییەکانەوە. ویستی هێز لە مێتافیزیکی نیتشە دا لایەنی لێکچون و جیاوازیش لەگەڵ ئایدیای ئەفلاتوندا هەیە. لە لایەکەوە، وەکو ئایدیای ئەفلاتونی ناوڕۆکی بوونە و (هەیە و نیە)ی هەموو شتێکی لە سەر ڕادەوەستێت. ئەمەش جەخت لە سەر بابەتگەرێتی یان شێوازی ئۆنتۆلۆجی ویستی هێز دەکات. بەڵام ئەگەر ویستی هێز ناوەڕۆک و بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجی هەموو شتێکی هەبوو بێت، ئەوا دەبێت بوونی مرۆڤ و ناوەڕۆکی مرۆڤیش بگرێتەوە.

بەم جۆرە ویستی هێز، وەکو ئایدیا بە تەنیا بابەتێکی دەرەکی نیە و ڕاستەقینەیەکی ناوەوەی مرۆڤیشە. ئەمەش مێتافیزیکی نیتشە لە شێوازێکی بابەتگەرانەی ڕووتدا دەرناخات و بەرگێکی خۆگەرایەتی بابەتگەرایەتی بە بەردا دەکات. ئەمە جیاوازییەکی گرنگە لە نێوان ئەفلاتون و نیتشەدا، لەمەش گرنگتر ئەو خاڵەیە، کە (ویستی هێز) بەهایەکی نەگۆڕ و چەسپاو نیە و (وەکو خۆی) نامێنێتەوە و بە

پێچەوانەی ئایدیای فیۆمیتافیزیکی ئەفلاتونەوە لە گۆڕانکاری و پەرەسەندنی بەردەوامدایە. بیروڕای هایدیگەر لە سەر لێکچوونی بۆچوونی مێتافیزیکیی ئەفلاتون و نیتشە تاکو ڕادەیەک دروست و گونجاوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لایەنی جیاوازی ئەم دوو سیستەمە مێتافیزیکییەش ئاشکرایە و بە ئاسانی دادەمەزرێت.

توێژینەوەکەی هایدیگەر لە سەر نیتشە لەو کاتەدا، کە بیرکردنەوەی فەلسەفی لە ئەڵماندا لە ژێر پاڵەپەستۆی ئایدیۆلۆجی نازییەکاندا دەژیا و بیروباوەڕی نیتشەش بە زۆر ڕاکێشرایە ژێر سێبەری ئەم ئایدیۆلۆجییە ڕامیارییەوە شایەنی باسکردنە. هایدیگەر بوێرانە، بە پێچوانەی هەندێک مامۆستای فەلسەفەی سەردەمەکەی، کە سازشیان بۆ ئەو ڕژێمە دەکرد و لە ڕوانگەی بۆچوونی پارتە دەستەڵاتمەدارەکەوە دەیانڕوانیە نیتشە، هەڵوێستێکی پارادۆکس و زەمینەیەکی جیاوازتری بۆ خۆی لە ئاستی نیتشەدا هەڵبژارد.[168] هایدیگەر دەیزانی تاوانێکی گەورە بەرانبەر ئەم فەیلەسوفە کراوە و ڕێگەچارەیەکیش بۆ بەرگری کردن لە نیتشە ڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕەکەیەتی لە شێوازێکی ڕاست و گونجاودا. لەبەر ئەمە نازییەکان ڕاڤەکردنەکەی هایدیگەریان بە پارادۆکس و نایار دەبینی چونکە هایدیگەر (ڕاستی) ناوەڕۆکی فەلسەفەی نیتشەی بە بێ شێواندن و سازشکردن بۆ دەستەڵاتی ڕامیاری بە خوێنەر دەناساند. ئەم هەڵوێستە پارادۆکسەی هایدیگەر بە تەنیا بەرگریکردن لە نیتشە نەبوو، بەڵکو پاراستنی بیرکردنەوەی فەلسەفی بوو لە گەندەڵی بۆچوونی بیر تەسکانەی ڕامیاری و شێواندنی ئەو

168- مەبەست لە پارادۆکس هەڵبژاردنی هەڵوێست و بیرکردنەوەیە کە لەگەڵ نەریتی باو یان بیرکردنەوەی دامەزرێنراودا ناکۆکە و تێهەڵکێش ناکرێت.

بیرکردنەوەیە بە دەستی سیاسەتمەدارەکان. ئەگەر ئێمە نیتشە بە دوا فەیلەسوفی بیرکردنەوەی مێتافیزیکیی و بە کۆتایی ئەو کۆتاییە و بە سەرەتای سەرەتایەکی نوێی بیرکردنەوە لە سەردەمەکەماندا دابنێین پێویستە ڕێگە نەدەین دەستە چەپەڵە ڕامیارییەکان جوانی و بەرزێتی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەم فەیلەسوفە گەندەڵ بکەن، تاکو سەردەمەکەمان بەو گەندەڵییە دەستپێنەکات. ئەو فەیلەسوف و بیریارانە، وەکو هایدیگەر و یاسپەرز و ڤایتمۆ و کاوفمان، کە لە سەردەمی نازییەکان و پاش ئەوانیش نیتشەیان پاراست، هەستیان بەم لێپرسینەوە مێژووییە لە ئاستی بیرکردنەوەی فەلسەفیدا دەکرد. ئەوان دەیانزانی بیرکردنەوەی فەلسەفی لەگەڵ مەرگی فەیلەسوفدا کۆتایی نایەت، بەڵکو بە دەستەمۆکردن و شێواندنی لە لایەن دەستەڵاتێکی ڕامیارییەوە بۆ مەبەستی گەندەڵی خۆی، دەمرێت و لەگەڵ مردنەکەیدا ڕۆژێکی تاریک دەهێنێتە کایەوە. پارێزەرانی نیتشە دەیانزانی سەردەمەکەمان لەو سەرەتایەوە سەرهەڵدەدات، کە نیتشە خستۆتیە گەڕ، بۆیە دەبوایە بۆ مسۆگەر کردنی سەردەمێکی نوێتر و کۆتایهێنان بە سەردەمی پێشو یان هەڵوەشاندنەوەی نەریتی باو پاراستنی نیتشە سەرەتاکە مسۆگەر دەکات و مێژووی بیرکردنەوەی فەلسەفی ڕوو لە بەرزایی و ترۆپکی چیایەکی دیکە دەکات. بەم پاراستنە و دەرخستنی (ڕاستی) ناوەڕۆکی فەلسەفەی نیتشە، ئەم فەیلەسوفە لە ماوەیەکی کەمدا توانی کاریگەرێتی گەورە بە سەر بۆچوونی فەلسەفی سەردەمەکەمان بگێڕێ. جێگایەکی دیار بۆ خۆی داگیر بکات و بیریاران و فەیلەسوفەکانی سەردەمەکەمان سودی لێوەرگرن. ڕۆلاند بارت ، میشێل فوکۆ و ژاک دێریدا و گلیس دێلیوز و ژین بۆدلیرالد و گەلێکی تریش، لەبەر ڕۆشنایی بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشەدا مامەڵەیان لەگەڵ کێشە فەلسەفییەکانی سەردەم

كردووە و خۆيان بە قەرزاری ئەم فەيلەسوفە دادەنێن. دوو كێشەی گرنگ بۆ ئەوان بوون بە دوو كۆڵەكەی ئەستووری بيركردنەوەی فەلسەفی سەردەم: (مردنی خوا) و (مردنی بكوژی خوا). كوشتنی خوا و مردنی ئەو كەسەی خوای كوشت دوو ڕووداوی بنەڕەتی فەلسەفی سەردەمەكەمانە، كە هەردووكيان دەبن بە بناخەی مێتافيزيكی هيچگەرايەتی نيتشە. ئێمە، لێرەدا بە دوو شێوە لە هيچگەرايەتی نيتشە تێدەگەين. شێوەی يەكەميان، لە (مردنی خوا) وە يان ڕەتدانەوەی (سەدەمێكی هۆشەكی) و (غايەدەر) بۆ بوون دەستپێدەكات. دووەميان وابەستە بە بۆچوونەكەی هايديگەرەوە. لەوێدا سەرهەڵدەدات، كە نيتشە واز لە بوون دەهێنێت و بە (هيچ) ی دادەنێت و بنەڕەتی هەموو شتێك بۆ (بەها) يان (ويستی هێز) دەگەڕێنێتەوە. بۆ نيتشە وەڵامی پرسيارە ئۆنتۆلۆجييەكە ئايا شتێك هەيە؟ لەبەر ڕۆشنايی (ويستی هێز) دا ئامادە دەكرێت . لەم ڕووەوە نيتشە فەيلەسوفێكی دژ بە مێتافيزيك نيە چونكە (ويستی هێز) بۆ ئەو پرنسيپاڵێكی مێتافيزيكی و بنەڕەتی هەموو شتێكە. دروستە خوا لای نيتشە مردووە و نيە، بەڵام هێشتا (شتێك) هەيە بوونی هەموو هەبووەكان ڕاگرێت، ئەويش (بوون) نيە، بەڵكو (ويستی هێز) يان بەهای ويستی هێزە. ئەم كێشەيە بۆ هايديگەر سەرەكييە و مێتافيزيكی نيتشە و ئەفلاتونی لە يەكدی پێ نزيك دەكاتەوە. بۆ ئەو فەيلەسوف و بيريارانەی ناوم بردن مردنی ئەو باوكە مێتافيزيكييە و ڕوخاندنی ئەو دەستەڵاتە ڕەهايە گرنگە و دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی هەموو زانين و بەهايەكی هەمەكی. ئەوان بە بيستنی ئەو هەواڵە مەستن و جيهانێكی جياواز دەبينن و تێگەيشتنێكی نوێيان بۆ بوونی مرۆڤ دەستكەوتووە. مردنی خوا ڕوودانێكی ئاڵۆزە و لەگەڵ خۆيدا زەمينەی زۆر بيروباوەڕ و

دۆگما، کە لە پێشتر باسمانکردووە، هەڵدەوەشێنێتەوە. مردنی خوا لە هەمانکاتدا هەڵوەشاندنەوەی زانین و بەها و ڕاستییە هەمەکیی و نەگۆڕەکانە. ڕووخاندنی سێبەرەکانێتی، شکاندنی بتەکان یان دەسگا کۆمەڵایەتییەکانە، کە لە سەر بوونی دامەزرێنراون و لە هەمووشیان گرنگتر مردنی ئەو مرۆڤەیە، کە بە خاوەنی ناوەرۆکێکی نەگۆڕ و خۆرسکێکی چەسپاو ناسراوە. مرۆڤ لەگەڵ کوشتنی خوادا خۆشی کوشتوە و بە مردنی ئەو مرۆڤێکی نوێ و (بێ ناوەڕۆک و بێ خۆرسک) پەیدابووە. مرۆڤێکە بێ (خۆ) و بێ ناوەڕۆک لە نێو مێژوودا، بە بەردەوامی هەوڵی خۆ دۆزینەوە و داهێنانی ئەو ناوەڕۆکە دەدات. ئەم بۆچوونەی نیتشە بووە بە بنەڕەتی ئەنترۆپۆلۆجی بوونخوازی و بونیادگەری و پاش بونیادگەری.

بۆ شوێنکەوتوانی ئەم فێرگە فەلسەفییانە بوونی مرۆڤ لە سەر بنەڕەتێکی مێتافیزیکی لە پێشتر و نەگۆڕ ڕاناوەستێت. مرۆڤ هەر چییەک بێت یان چی ناوەڕۆکێکی هەبێت، ئەو چییەتیەی هۆکرد و دەستکردی مێژووییە و لە ژوور مێژووەوە بڕیاری لە سەر نەدراوە. هاوکات جیاوازییەکی سەرەکی لە نێوان توێژینەوەی بوونخوازی و بونیادگەری و پاش بونیادگەری هەیە. لە بوونخوازییدا مرۆڤ بوونێکی داهێنەرانەی هەیە و خۆی بڕیار لە سەر ناوەڕۆکی خۆی دەدات، بە تایبەتی ئەگەر ئەو بوونە ڕەسەن بێت و نامۆ نەکرابێت. لە بونیادگەری و پاش بەنیادگەرییدا ناوەڕۆکی مرۆڤ هۆکردی سترەکچەرێکی مێژووییە، کە مرۆڤ لە نێویدا دەژی و ناتوانێت خۆی لێدەرباز بکات. ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە بوونی مرۆڤ بەرەو (ناچارەکی) دەبات و لە ڕۆڵی مێژوویی خۆی ڕووتدەکاتەوە.[169]

169 - بڕوانە: محەمەد کەمال، کۆتایی (خۆ) و گەڕانەوە بەرەو ناچارەکی لە

مردنی مرۆڤ کۆتاییهێنانە بەو بۆچوون و لێکۆڵینەوانەی لە سەردەمی ئەفلاتونەوە تاکو تازەگەرایەتی بۆ تێگەیشتن لەم بوونە کراون. مردنی مرۆڤی تازەگەرایەتییە، کە خۆی بە خاوەنی خۆرسکێکی نەگۆر و ناوەڕۆکێکی لە ئەستو بەدەر و حەقزان و چەقی ڕاستییەکان دادەنێت. بۆ نیتشە و بیریارانی پاش نیتشە مرۆڤ ئەو ناوەڕۆکە گیانەکییەی دێکارت نیە بوونی لە ژوور مێژووەوە دامەزرابێت. بوونی مرۆڤ هیچە و لەو هیچەوە هەوڵی داهێنانی چییەتی خۆی دەدات. جیاوازی نێوان بۆچوونەکانی بوونخوازەکان و بونیادگەرییەکان و پاش بونیادگەرییەکانیش ئاماژە بۆ ئەو خاڵە دەکات، کە هەر یەکێک لەم بیریارانە بە شێوەیەکی جیا سودیان لە مردنی مرۆڤی تازەگەرایەتی وەرگرتووە. بەڵام هەموویان سورن لە سەر ئەوەی مرۆڤ ناوەڕۆکێکی گیانەکی نیە و دێکارتانە ناڕواننە بوونی مرۆڤ.

ئەوەی لێرەدا گرنگە و دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە، نزیکبوونەوەیەکە لە بۆچوونەکانی دێکارت و بیریارانی بونیادگەری و پاش بونیادگەری. ئەگەر بڕوانینە بۆچوونەکەی دێکارت دەبینین بوونی مرۆڤ بۆ ناوەڕۆکێکی گیانەکی (لە پێشتر) دامەزرێنراو گەڕاوەتەوە. ئەو ناوەڕۆکە لە پێشترە داهێنراوی مرۆڤ و دەستکردی ئەو بوونە نیە. لە لایەن دەستەڵاتێکی لە پێشتر و دەرەکییەوە، پێش پەیدابوونی، ئەو ناوەڕۆکەی بۆ دانراوە. بیریارانی بونیادگەری و پاش بەنیادگەری لەگەڵ ئەم بۆچوونەی دێکارتدا هاوڕانین و ئەو ناوەڕۆکە (لە پێشتر) پێدراوە ڕەتدەدەنەوە. لەو باوەڕەدان مرۆڤ (چی) بێت، ئەو چییەتیەی لە مێژوودا سترەکچەرە کۆمەڵایەتییەکان پەیدایانکردووە

---

بۆچوونەکانی پاش تازەگەرییدا، گۆڤاری ئایندە، ژمارە (٥٥) ساڵی ٢٠٠٤، سلێمانی، لاپەڕە١٠.

و پێکیان هێناوە. ناوەڕۆکی مرۆڤ بەم جۆرە چییەتیەکی گیانەکی (لە پێشتر) نیە، بەڵکو (چییە)تیەکی مێژوویی (لە پاشتر)ە. لە هەر دوو حاڵەتەکەدا (چییەتی لە پێشتر) و (چییەتی لە پاشتر) مرۆڤ ناکات بە خاوەنی خۆی و داهێنەری ئەو چییەتیە. ئەگەر مرۆڤ لە نێو سترەکچەرێکی بەرزی گیانەکییەوە یان سترەکچەرێکی مێژووییەوە (چییە)تیەکەی بۆ دانرابێت، ئەوا لە ژێر باری ئەو سترەکچەرە دەرەکییەدا (چی مێتافیزیکی یان مێژوویی) مەحکوم دەبێت و سەربەستییەکەی دەدۆڕێنێت. لەم پێگەیەوە دەگەینە ئەو ئاکامەی، کە تازەگەرایەتی و بونیادگەرایەتی و پاش-بونیادگەرایەتی لە ئێستگەی (ناچارەکی)دا بە یەکدەگەن و دەستەڵاتی داهێنان لە مرۆڤ دەسەننەوە.

ڕۆلاند بارت یەکێکە لە بیریارانی بونیادگەری، کە مردنی مرۆڤی تازەگەرایەتی لە بۆچوونەکانیدا لە سەر (نووسین) یان ئەدەب و هونەر بەکارهێناوە و گۆڕیویەتی بۆ (مردنی نووسەر). لەگەڵ ئەو پرسیارەدا مامەڵە دەکات، کە بۆ ناسنامەی نووسەر (ئایا نووسەر چییە؟) دەگەڕێت، مەبەستی بارت ئەوە نیە پێناسێک بۆ ئەو کەسە بدۆزێتەوە، کە بە نووسینەوە خۆی خەریک کردووە و بە نووسەر ناسراوە. پرسیارەکە شێوازێکی مێتافیزیکی هەیە و لە بوونی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە. مادامەکی هەموو نووسەرێک مرۆڤە و هەبوویەک، وەکو ئاژەڵ و دار و بەرد نابن بە نووسەر، ئەوا بێجگە لەوەی (نووسین) دەبێت بە چالاکیەکی مرۆڤانە، پێویستی تێگەیشتن لە سەرچاوەی ئەو چالاکییەوە سەرهەڵدەدات. ئایا مرۆڤ چییە، کە بەو چالاکییەش هەڵدەسێت؟ ئایا خاوەنی ناسنامە و خۆرسکێکی نەگۆڕە یان هیچە؟ ئایا بۆ تێگەیشتنمان لە نووسراوێک دەبێت لە ناخی نووسەر و

ناسنامە و کەسایەتیەکەشی بگەین؟ ئایا نووسراوەکە (دەق) ئەو کەسایەتیەمان پێدەناسێنێت؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە دەکەونە سەر تێگەیشتن و لێکدانەوەی فەلسەفیمان بۆ بوونی مرۆڤ. بارت، کە شوێنکەوتویەکی نیتشەیە، باوەڕی بە چییەتی ئەو بوونە، وەکو شتێکی نەگۆڕ و خاوەنی ناسنامەیەکی دیاریکراو نیە. (نووسەر) یان ئەو مرۆڤەی دەنووسێت (خۆ) یەک نیە خسڵەت و تایبەتمەندییەکانی دیاری بکرێت و بناسرێتەوە. ئەو کڵافەیەک چالاکی و ئەزمونە بە بێ زەمینە. لە بەر ئەمە خوێندنەوەی دەقێکی ئەدەبی نابێتە هۆی ناسینی نووسەر یان ڕێگەیەک بۆ گەیشتن بە ناخی نووسەرەکە و هەڵسەنگاندنی ئەزمونەکانی چونکە (نووسەر)نیە. هەروەها مەرجیش نیە لە ڕێگەی ناسینی نووسەرەوە لە دەقێکی نووسراوەکەی تێبگەین. هەر چەندە نووسراو یان دەق هەڵقوڵاوی ئەو سەرچاوەیە، بەڵام لە سەرچاوەکەیەوە دوورە و هاوکاتیش سەرچاوەکە (هیچ) شتێک نیە تاکو بتوانین بیناسین. لەگەڵ بە (هیچ) کردن و (مردن) ی نووسەردا لە ڕوانگەی نیتشەوە بارت گوتەنی (دەق) سەربەخۆیی وەردەگرێت و لە شێوازی بوونێکی جیاوازتر لە نووسەر خۆی دەردەخات. خوێنەریش دەبێت (دەق) بە بوونێکی جیاواز و سەربەخۆ دابنێت و بۆ تێگەیشتنی لەواتای ئەو دەقە بۆ ناخی نووسەر یان (خۆ) ی نووسەر نەگەڕێتەوە چونکە (خۆ) نیە.[170] ئەگەر بمانەوێت لە پارچە هۆنراوەیەکی (نالی) تێبگەین، کە دەڵێت،

لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە

170- Roland Barthes. *Image, Music, Text,* translated by Stephan Heath, New York: Hill and Wang, 1977. P. 143- 147.

دڵ ڕەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور.[171]

دەبێت بڕوانینە دەقە شیعریەکە و بیر لە (نالی)و ئەزمونی غوربەت و ئازاری دووره وڵاتی و تەنیایی ئەو شاعیرە نەکەینەوە چونکە (نالی) شاعیر و نووسەری ئەو دەقە (هیچ)ە و (خۆ)یەکی خاوەن ناسنامە و تایبەتمەندییەتێک نیە پێی بناسرێتەوە. نە خوێنەر دەتوانێت بە ڕێگەی ئەو دەقەوە لە ناخی نالی تێبگات، نە تێگەیشتنمان لە ناخی (نالی)یش یاریدەی تێگەیشتنمان لە دەقەکە دەدات. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو باوەڕە مێتافیزیکییە سەبارەت بە بوونی مرۆڤ، کە (خۆیەتی) مرۆڤ هەڵدەوەشێنێتەوە و بە ماکینەیەکی گوتە بێژی دادەنێت. ڕەتدانەوەی (خۆ)یەکی تەوەری بەو جۆرەی لە نەریتی مێتافیزیکی دێکارتییدا ئاماژەی بۆ کراوە بارت و چەند بیریارێکی دیکەشی گەیاندووە بەو خاڵەی، کە (خۆ) بێ ناسنامەیە. ئەگەر ناسنامەیەکیشی هەبێت، ئەوا ناسنامەکەی بونیادە دەرەکی و هۆکارەکانی دەوروبەری بە سەرییدا سەپاندوویانە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە لای بارت بوونی دەق و تێگەیشتنی ڕاستەوخۆ لە دەق و جیاکردنەوەی لە بوونی نووسەر، لە بوونی نووسەر و تێگەیشتن لە نووسەرەکەی گرنگترە. نکۆڵی لەوە ناکرێت، کە دەقێک لە نووسەرەکەی دەرچووە و دابڕاوە و بووە بە بابەتێکی نێو داکەوتێک هەموو کەسێک دەتوانێت بیخوێنێتەوە. پارچە شیعرەکەی نالی، وەکو بیرۆکەیەک لە نێو بیرکردنەوەی ئەو شاعیرەدا ناژی و بووە بە دەقێک لە بەر دەستی ئێمەدا. ئایا ئەو دەقە (شیعرەکەی نالی) بە بێ نالی چییە؟ بوونی دەق لە سەر بوونی نووسەری

171- مەلا عەبدول کەریمی مودەرس، دیوانی نالی ، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦. لاپەڕە. ١٩٧.

دەقەکە ڕاناوەستێت؟ من لێرەدا ناڵێم کەسێک نالی نەناسێ و ناوی نەبیستبێت ناتوانێت لە واتای ئازاری دوورە وڵاتی و تەنیایی تێبگات، کە لەو پارچە شیعرەدا شاعیر دەربڕیوە. دەتوانرێت دەقێک، وەکو بابەتێک فینۆمینۆلۆجییانە بخرێتە نێوان دوو کەوانەوە و لە هەموو شتێک داببڕێت و خوێنەر ڕاستەوخۆ لە واتاکەی بکۆڵێتەوە. بەڵام مامەڵە لەگەڵ دەقێکی ئەدەبیدا (وەکو شیعر) جیاوازترە لەگەڵ تێڕوانینمان بۆ دەقێکی زانستانە یان دەقێکی مێژوویی. دەقێکی زانستانە داوای ناسنامەی نووسەرەکەمان لێناکات، کەچی دەقێکی ئەدەبی بوونی نووسەرەکە بە سەرماندا فەرز دەکات. لەگەڵ خوێندنەوەی شیعرێکدا یان ڕۆمانێک دەمانەوێت نووسەرەکە بناسین. ئێمە ڕۆژانە دەقی زانستانە بەکار دەهێنین و پەیڕەوی واتاکەشی دەکەین. ئەو دەقە بوونی ئەو زانایە بە سەرماندا ناسەپێنێت، کە بۆ یەکەمجار دایڕشتوە. کاتێکیش نەبووە شیعرێکمان بۆ خوێندرابێتەوە و ناوی شاعیرەکەمان نەپرسیبێت. ئەمە یەکێکە لە خسڵەتە تایبەتمەندییەکانی دەقی ئەدەبی و داهێنانی هونەری.[172] هۆکارێکە بۆ نزیکی و کاریگەرێتی دەقی ئەدەبی بە سەر خوێنەرەوە چونکە لە نووسەر ڕووت نەکراوەتەوە و لە ناخی مرۆڤ دانەبڕاوە. دەقی زانستانە لە ناخی نووسەر و مرۆڤایەتی دابڕاوە، بووە بە (بابەت)ێکی ڕووتی دەرەکی و ڕاستەقینەیەکی داکەوت. دەقی زانستی ئەوەندە بابەتگەرانە و ڕووتەڵەیە، ئەوەندە لە سەرچاوەکەی دوور خراوەتەوە هەستی مرۆڤانەی پێوە نەماوە. بە پێچەوانەشەوە، دەقی ئەدەبی مرۆڤانەیە، وەکو بەشێکی گرنگی هەستی مرۆڤانە ماوەتەوە، کە لەگەڵ خۆیدا و لە نێو خۆیدا لایەنێک لە لایەنەکانی (چییە)تی نووسەر هەڵدەگرێ و دەریدەخات. دەق بوونێکی داهێنراوی هەیە.

172- بڕوانە: محەمەد کەمال، بوون و داهێنان، لاپەڕە١٣٠- ١٣٩.

بوونی داهێنراویش بە بێ بوونی داهێنەر نیە و نابێت. من ناڵێم ئەو بوونە داهێنەرە (ناوەڕۆکی گیانەکی) دێکارتە، بەڵام هاوکات نکۆڵی لەوە ناکرێت، کە سەرچاوەی دەقە. بۆ تێگەیشتنیش لە واتای دەق بە (تەواوی) پێویستە سەرچاوەکەی بناسرێت و نەخرێتە نێو قاڵبێکی زانستانەی ڕووتەڵەی بابەتگەرێتییەوە و هیچ پەیوەندییەکی بە مرۆڤایەتییەوە نەمێنێت. ئەگەر زانست و دەقی زانستانە مرۆڤایەتی بەجێهێشتبێت، دەقی ئەدەبی دەیەوێت ئەو دەلاقەیە بێت، کە مرۆڤایەتی بوونی خۆی تێدا دەردەخات و لەوێوە دەگات بەو داهاتووەی لە ئێستاوە خۆی تێدا دەبینێت.

هەروەها، بارت گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی مردنی نووسەر نەک بە تەنیا ئاکامێکی لۆجیکمەندانەی بۆچوونە ئۆنتۆلۆجییە هیچگەرایەتییەکەیە، بەڵکو پێویستییەکە بۆ تێگەیشتن لە دەق. لەگەڵ مردنی نووسەردا خوێنەر لە دایک دەبێت.[173] خوێنەر ڕۆڵێکی سەرەکی لە تێگەیشتنی دەقدا هەیە و نابێت خوێنەر خۆی بە ناسینی نووسەرەوە ماندوو بکات چونکە نووسەر نیە و ئەفسانەیەکە لە نێو مێتافیزیکی ڕووناکبنیدا دامەزراوە. تێگەیشتنی دەقیش لە خوێنەرەوە بۆ خوێنەرێکی دیکە دەگۆڕێت. ئەم گۆڕانکارییەش پەیوەندی بە چەند لایەنێکەوە هەیە. هەندێکیان بە دەقەوە و ئەوانی تریش بە خوێنەرەوە گرێدراون. ئەو لایەنانەی بە دەقەوە گرێدراون دەگەڕێنەوە بۆ دوو خسڵەت، کە لە نێو دەقدا هەن. تێگەیشتنی جۆراو جۆر لە سەر دەقێک لەوێدا ڕوودەدات، کە دەقەکە لە ڕووی واتاوە پڕ و دەوڵەمەند و فرە لایەن یان تەمومژاوی بێت. لایەنەکانی دیکەش، کە بە خوێنەرەوە بەستراونەتەوە پەیوەندییان بە جیاوازی نێوان تاکەکان

173- Roland Barthes. Image , Music, Text, p. 148.

هەیە. ئەم جیاوازییەش دەکەوێتە سەر تایبەتمەندییەتی خوێنەر و سەردەمەکانیان. تایبەتمەندییەکانیشیان وابەستە بە ئەزمونی جۆراوجۆری تاکەکانەوە. ئەگەر خوێنەرێک ئازاری دووره وڵاتی نەچێشتبێت و شەوانی تەنیایی لە وێرانە خاکی غوربەتا بە سەر نەبردبێت لە واتای پارچە شیعرەکەی (نالی) بە تەواوی ناگات و نازانێت بۆچی دڵی ئەو شاعیره بووە بە ئاو و لە نێو چاوەکانیەوە بە گریان دەبن بە بارانی فرمێسک و دەبارێنە سەر ڕوخساری شاعیر. ئەی ئەو خوێنەرە (کێ) یە، کە دەقەکە دەخوێنێتەوە و هەوڵ دەدات لە واتاکەی بگات؟ ئایا لەگەڵ مردنی نووسەردا ناتوانین بانگەشەی مردنی خوێنەریش بکەین؟ ئەگەر (نا)، لە سەر چی بناخەیەک یان بە چی حەقێک (نووسەر) بمرێنین و خوێنەر بژیەنین؟ ئایا نووسەر و خوێنەر سەر بە یەک بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجی وەکو یەک نین؟ ئایا هەر دووکیان (خۆ) نین؟ بۆ چی خوێنەر هەبێت و نووسەر نەبێت؟ لەگەڵ مردنی نووسەردا خوێنەریش دەمرێت چونکە نووسەر و خوێنەر لە بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجییەوە بوونیان وەکو یەکە. هەر دووکیان بوونێکی ئاگامەندانەی ناتەواو و بێ ناوەڕۆکیان هەیە. ئەوەی نامرێ و دەمێنێتەوە لەم حاڵەتەدا تەنیا دەقە.

ناگونجێت لە بۆچوونە مێتافیزیکییەکەی نیتشەوە خۆمان بە مردنی نووسەر بگەیەنین و خوێنەر زیندوو بکەینەوە. نابێت، ئەم کێشەیە، وەکو مردنی خوا و لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز تەماشا بکەین. خوا و مرۆڤی بەرز سەر بە یەک بنەڕەتی ئۆنتۆلۆجی نین و دوو بوونی جیاوازییان هەیە. لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز بە مردنی خوا ئاکامێکی لۆجیکمەندانە و پێویستییەکی مێژووییە، بەڵام لە دایکبوونی خوێنەر لەگەڵ مردنی نووسەردا سەرهەڵنادات. نووسەر هەبێت و نەبێت

خوێنەر لە تێگەیشتنی دەقدا سەربەستە و لە ڕوانگەی خۆیەوە مامەڵە لەگەڵ دەقدا دەکات. لە لایەکی دیکەوە (دەق) بانگەشەی پێشمەرجێک بۆ بوونی خۆی دەکات. دەق ناتوانێت ببێت بە بناخەی بوونی خۆی و بە بێ نووسەرەکەی بیر لە بوونی ناکرێتەوە. کاتێک دەقێک دەخوێنینەوە ئەو ڕاستەقینەیە لە پێشتر دەزانین، کە ئەو دەقە کەسێک نووسیویەتی. بوونی ئەو کەسە لە نێو کات و لە ڕووی لۆجیکیشەوە پێش دەقەکە دەکەوێت. نووسەریش دەقێکی دیکە نیە، بوونێکی جیاواز و ئاگامەندە و ئاگامەندانە دەقەکەی داهێناوە و دەقەکە بەرهەمی بیرکردنەوە و ئەندێشەی ئەوە. ئەگەر نووسەر (خۆ)یەکی ئاگامەند نەبێت، بوونی ئەو کۆمەڵێک پەیوەندی نێو سترەکچەرە مێژووییەکە بێت وەکو تاکێک چۆن دەناسرێت؟ چۆن نووسەر دەقێکی ئەدەبی دەنووسێ و هاوکات بەرهەمەکەی خۆشی دەناسێتەوە؟ چی شتێک هەیە لە بوونی نووسەردا بەردەوامی بە بوونی بدات؟ ئایا پارچە شیعرەکەی نالی زادەی بیری شاعیرەکەیە یان ڕەنگدانەوەیەکی ڕووتی نێو ئەو سترەکچەرەیە (نالی)تێدا دەژی؟ ئەم پرسیارانەی لێرەدا یەخەمان دەگرن ئێمە بەرەو دێکارت و نەریتە مێتافیزیکییەکەی پەلکێش ناکەن. ئەوەش ناگەیەنێت، کە کەموکورتی بۆچوونی بیریارانی پاش تازەگەری لە ئاستی بوونی مرۆڤدا ناچارمان بکات بە گومانەوە بڕوانینە نەریتی هیچگەرایەتی. ئەم کەمووکورتییە بۆ نەریتە هیچگەرایەتییەکەی نیتشە ناگەڕێتەوە، بەڵکو پەیوەندی بە شێوازی توێژینەوەی بونیادگەری و پاش بونیادگەریەوە هەیە. ئەوان لەگەڵ نیتشەدا نەریتی دێکارتی و مێتافیزیکی ڕووناکبینیان ڕەتداوەتەوە. باوەڕیان بە دامەزراندنی خۆرسک و ناوەڕۆکێکی لە پێشتر بۆ بوونی مرۆڤ نیە چونکە ئەو ناوەڕۆکە لە پێشترە لە لایەکەوە جەخت لە سەر بوونێکی هۆشەکی لە پێشتر دەکات و

دووەمیش مرۆڤ بە مێژووەوە نابەستێتەوە و ناچاری دەکات. لەگەڵ ئەم هەنگاوە مێتافیزیکییە گرنگە و پرۆژە فەلسەفییە ڕادیکاڵەدا بوونی مرۆڤیان کردووە بە داشی دامەی کایەکانی مێژوو یان سترەکچەرە کۆمەڵایەتییەکە و بەستویانەتەوە بە ناوەڕۆکێکی لە پاشترەوە، کە خۆی داهێنەری نیە و ناتوانێت بیگۆڕێت.

دوای بارت، میشێل فوکۆ بیریارێکی دیکەیە، کە بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە کاریگەرێتی بە سەر بۆچوونەکانیەوە جێ هێشتوە. فوکۆ ئەوەندە لە ژێر ئەم کاریگەرێتییەدا بیریکردۆتەوە (ویستی هێز) یان (هێز) بە گشتی، کە ناوەڕۆکی بوون و چەمکێکی سەرەکی فەلسەفەی نیتشەیە بووە بە هەوێنی بۆچوونەکانی و تێگەیشتنی بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ئەپستمە و کایەکانی ڕاستی و پەرەسەندنی مێژوو. (هێز) لە نێو تۆڕی پەیوەندییەکاندا سەرەتا و کۆتایی هەموو شتێکە. هەرچ پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابووری و سێکسی لە مێژوودا هەبێت شێوازی ئەو پەیوەندییە لە سەر بنەمای (هێز) لە پێناوی پەرەسەندنی هێزدا پێکدێت.[174] مەبەستی فۆکۆ لە توێژینەوەکەی لە سەر (هێز) شیکردنەوەی بنەڕەتی بوون و لێکدانەوەیەکی مێتافیزیکییانە نیە. ئەو دەیەوێت لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستییەدا لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بوونی مرۆڤ تێبگات. فوکۆ لەم بارەیەوە دەنووسێت. "ئامانجی نووسینەکانم لە بیست ساڵی دواییدا شیکردنەوەی دیاردەی هێز نیە و ئەم بناخەیەی بوون نیە. دەمەوێ لە مێژووی شێوازە جیاوازەکان بدوێم، کە لە نێو کەلتورەکەماندا مرۆڤی، وەکو (خۆ) دەرخستوە."[175] هەروەها،

174- Paul Rabinow (ed.). *The Foucault Reader,* London: Penguin Books, 1986. P. 73.

لە سەرەتای بیرکردنەوەیدا فوکۆ (خۆ)ی تازەگەری ڕەتدایەوە و لەگەڵ نیتشەدا (خۆ)ی مراند. بۆ ئەو (خۆ) کانیاوی واتا و بەها و زانستەکان نیە، بەڵکو هۆکردی سترەکچەرە مێژووییەکەیەتی و شتێکە لە نێو ئەو سترەکچەرەدا پێکهاتووە و بوونێکی سەربەخۆ و سەربەستی نیە. تاکەکانی کۆمەڵ لە نێو تۆڕی سترەکچەرەکەدا مەحکوم کراون. ئەوان هەر چییەک بن، چییەتیەکەیان دەستگاکانی کۆمەڵ و (خێزان و فێرگە و ئایین) پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان چنیویانە و کردوویانە بەو کالایەی بە گوێرەی قۆناخە مێژووییەکەی بەکاربهێنرێت. ئەم تێگەیشتنەش لە بوونی مرۆڤ، لە پێشتریش باسمان کرد، گەڕانەوەیە بەرەو ناچارەکی و گیرخواردنی ویستی مرۆڤ بە تۆڕی سترەکچەرە دەرەکییەکەوە. بە بیروڕای من ئەمە لێکچونێکە لە نێوان بیردۆزی دێکارتی و بیروباوەڕی فەلسەفی بیریارانی بونیادگەری و پاش بونیادگەری. هەر دوو شێوازە مێتافیزیکییەکە، لەگەڵ ئەوەشدا، کە نایارن، لە سەر ئەو خاڵەی سەربەستی مرۆڤ ڕەت دەدەنەوە هاوبیروڕان.

بۆچوونەکەی فوکۆ لە ئاستی مردنی (خۆ)دا بە تەنیا نیتشەیی نیە. فەلسەفەی ڕامیاری و ئابووری (مارکس)یش ڕۆڵێکی گرنگی لە دامەزراندنی بۆ چوونەکەیدا هەیە.[176] فوکۆ، کە بۆ ماوەیەک لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسادا بووە، مارکسیانەش تەماشای بوونی مرۆڤی کردووە و ئەو بوونەی بە لایەنێکی مێتافیزیکی لە پێشترەوە نەبەستۆتەوە و بە ڕووداوێکی مێژوویی لە پاشتری داناوە. ئەم

175- هەمان سەرچاوە. لاپەرە ٧.

176- میشێل فوکۆ لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا لە ساڵی ١٩٥٠ پەیوەندی بە پارتی کۆمۆنیستی فەرەنساوە کردووە و بۆ ماوەیەکی کورت ئەندامی ئەو پارتە بووە.

بۆچوونەی فوکۆ لەگەڵ گەشەکردنی بیروباوەڕی فەلسەفییدا و نووسراوەکانی دواییدا بە تایبەتی The History of Sexuality , The Order of Things گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

لە توێژینەوەکانیدا سەبارەت ڕەوشت و سێکس ئاماژەی بۆ (خۆ) کردووە، کە مامەڵە لەگەڵ بەها ڕەوشتییەکان و سێکسدا دەکات. لە نووسراوەکیدا لە سەر مێژووی سێکس، کە لە سێ بەرگدا لە چاپدراوە فوکۆ داستانی گۆڕانکارییەکانی تێگەیشتنی مرۆڤ و کۆمەڵ سەبارەت سێکس ڕووندەکاتەوە. مەبەست لەم نووسینە گێڕانەوەی مێژووی سێکس و سێکسیزم نیە، فوکۆ هەوڵیداوە ئەوەمان بۆ ڕوونبکاتەوە، کە گۆڕانکارییەکان لە تێگەیشتنمان لە سێکس پەیوەندی بە ڕوانینمان بۆ (لەش) نیە. (سێکس) لەم ڕووەوە ئاماژە بۆ خۆدەرخستنی لەش، وەکو بابەتێکی سێکسی حەزلێکراو ناکات. زیاتر وابەستە بە تەکنەلۆجی خۆ و تێگەیشتنمان لە خۆ و لە سەرو ئەمانەشەوە تەکنەلۆجی دەستەڵات. لەوانەیە لە خۆمان بپرسین بۆچی لە کۆمەڵگای پیاوسالارییدا ڕیزپەری سێکسی (وەکو پەیوەندی سێکسی لە نێوان دوو نێر یان دوو مێدا) نەفرەتی لێدەکرێت و ڕێگەی پێنادرێت؟ بۆچی کۆمۆنیستەکانی سەردەمی ستالین و نازییەکان هەزارەها نێربازیان (هاوسێکسخواز) لەناوبرد؟ لە چی ڕوویەکەوە هاوسێکسخوازی هەڕەشە لە کەلتووری پیاوسالاری و کۆمۆنیزم و نازیزم دەکات؟ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەدا مامەڵە لەگەڵ (لەش)دا ناکەین و لە چیەتی هاوسێکس خوازی ناکۆڵینەوە. بەڵکو لە بەر ڕۆشنایی کەلتوورە پیاوسالارییەکەوە و دەستەڵاتە ڕامیارییەکەوە (کۆمۆنیزم و نازیزم) دەمانەوێت لە واتای (خۆ)، وەکو خۆیەکی سێکسگەری بگەین. لە کەلتووری پیاوسالارییدا

(خۆ) بە هەر دوو شێوەکەیەوە: خۆی نێرینەی خاوەن دەسەڵات و داگیرکەر و خۆی مێینەی داگیرکراو پەیوەندی بەرهەمهێنانیان لەگەڵ یەکدا هەیە. پەیوەندی سێکس لە ڕوانگەی ئەم بۆچوونەوە بەرهەمهێنانە. مێینە بەو زەمینە دادەنرێت، کە نێرینە دەیکێڵێ و تۆوی دەکات و بەرهەمەکەی بۆ خۆی دەبات. چییەتی بەرهەمەکە بە گوێرەی پێویستییەکانی کەلتوورە پیاوسالارییەکە لێکدەدرێتەوە. لەگەڵ باسکردنی پێویستییەکانی کەلتوورەکە وەڵامی پرسیارەکان لە بارەی هەڵوێستی کۆمۆنیست و نازییەکانیشەوە وەدەست دەکەوێت. بارودۆخی مێژوویی ئەو قۆناخەی کۆمۆنیستەکان و نازییەکانی تێدا دەژیان (مەبەستم لە کۆمۆنیستەکانی سەردەمی ستالینە) جەنگاوی بوو. جەنگ بووە هۆی کەمکردنەوەی ژمارەی نێرینە و ئەمەش زیانی بە دەستەڵاتی سەربازی و بەرهەمهێنان دەهێنا و پێویستی زۆرکردنی ژمارەی نێرینە لەناو کۆمەڵدا بوو بە داواکاری دەستەڵات و ئایدۆلۆجی. بە دیدی کۆمۆنیستەکان و نازییەکان (خۆ)ی مێینە لەم بارودۆخەدا دەبێت ببێت بە ماکینەیەکی زاو و زێ و پەیوەندی سێکسیش بەرهەمهێنەرانە بێت. هاوسێکسخوازی پەیوەندی بەرهەمهێنەرانەی نیە و لەم تەکنەلۆجییەی (خۆ)، کە کەلتوور و دەستەڵاتی ڕامیاری دەیسەپێنێت لادەدات. لە هاوسێکسخوازییدا بەرهەمهێنان حوکم بە سەر پەیوەندییەکەدا نادات و لەشی ئەویدی بە ماکینە ناکرێت، بەڵکو دەبێت بە دیاردەیەکی زەق و خۆشی بەخش. لەم ڕووەوە، پەیوەندی سێکسی لە نێوان دوو نێرینە یان دوو مێینەدا، لە کەلتووری پیاوسالارییدا و بۆ کۆمۆنیستەکان و نازییەکانیش، پارادۆکس و ڕیزپەڕییە چونکە پێویستییەکانی کەلتوورەکە پڕناکاتەوە.

ئەو خاڵە گرنگەی دەمەوێت بۆ ڕوونکردنەوەی گۆڕانکارییەکە لە بیروباوەڕی فوکۆدا سەبارەت (خۆ) ڕوونی بکەمەوە ئەوەیە، کە لە

بۆچوونە مێژوویی و ئەنترۆپۆلۆجییەکانماندا بۆ سێکس و پەیوەندی سێکسی دەبێت ئەو (خۆ)یە فەرامۆش نەکرێت، کە بە کارێکی سێکسی هەڵدەستێت. پەیوەندییە سێکسییەکە هیترۆسێکسوەڵ (سێکس لە نێوان نێرینە و مێینە) بێت یان هاوسێکسخوازانە (لە نێوان نێرینەکان یان مێینەکاندا)، ئەو کەسانەی پێیهەڵدەسن (خۆ)کانن، نەک تۆڕی پەیوەندییەکان و سترەکچەرە دەرەکییەکە. ناگونجێت بە بێ (خۆ) لە سێکس بدوێین، چونکە سێکس کارێکە بە بێ (خۆ) ڕوونادات و بوونی (خۆ) دەبێت بە سەرچاوەی کارێکی سێکسی. ئەوەی کارێکی سێکسی دەکات و چێژی لێوەردەگرێت، ئەو کارە لە هەرچ شێوازێکی تەکنەلۆجی سێکسدا بێت، (خۆ)یە. بوونی (خۆ)، وەکو پێویستییەکی لە پێشتر بۆ هەڵسوڕانی کارێکی سێکسی و دامەزراندنی پەیوەندییە سێکسیەکان لەگەڵ (خۆ) یەکی دیکەدا یان چەند (خۆ) یەکی دیکەدا خۆی دەسەپێنێت و تاکە کەسایەتی (خۆ)کانیش دەردەخات.[177] مەبەست لە (خۆ)

177- بێجگە لەو دووپەیوەندییە سێکسییەی لە نێوان تاکەکاندا، وەکو (هێترۆسێکسواڵ و هاوسێکسخوازی)، ئاماژەمان بۆ کردن پەیوەندی دیکەش هەیە. بۆ نموونە پەیوەندی یەک لایەنی Monogamy و فرەلایەنی Polygamy. پەیوەندی یەک لایەنی، کە تاکو ئەمڕۆ ماوەتەوە، بناخەیەکی پتەوی دەستگای خێزانە و کەلتووری پیاوسالاری هەوڵیداوە بیپارێزێت. لەم پەیوەندییەدا نێر (پیاو) لەشی مێیەکەی دەکات بە موڵکی خۆی و ڕێگا نادات پیاوێکی دیکە دەستی پێبگات. ڕەگوڕیشەی داگیرکردنی لەشی مێینە لە لایەن نێرینەوە بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە، کە لە بەر هۆکاری ئابووری پیاو ویستویەتی دڵنیابێت لەوەی منداڵەکەی (بە تایبەتی کوڕەکەی) منداڵی خۆیەتی و تۆوی پیاوێکی دیکە نیە. بەهای (ناموس) و ناموس پاراستنیش، کە نێرینە بە سەر مێینەدا سەپاندوویەتی بۆ ئەم هۆکارە دەگەڕێتەوە. لە بەر ڕۆشنایی ئەم توێژینەوەیەدا )شوکردن) بۆ مێینە بە نامرۆڤ کردنیەتی چونکە لەو ڕۆژەوە دەبێت بە موڵکی پیاوێک و ماکینەیەکی بەرهەمهێنەر بۆ ئەو.

و خۆدەرخستنی (خۆ) لەم بۆچوونەدا ساخکردنەوەی ناوەڕۆکی دەرەکی دێکارتی نیە. ناتوانرێت ئاماژە بۆ (خۆ)، وەکو ئاماژەکردن بۆ شتێک بکرێت و بەو جۆرەی شتەکە دەناسرێت و ناسنامەکەی دەدۆزرێتەوە، ناسنامەی (خۆ)ش ئاشکرا بێت. فوکۆ باوەڕێکی بنەڕەتی بەوەیە، کە (خۆ) شتێک نیە و هاوکات بوونێکیشە، کە، وەکو خۆی نامێنێتەوە. لە کاتێکدا مامەڵە لەگەڵ (ڕەوشت)یشدا دەکات جارێکی دیکە بۆ سەر (خۆ) دەگەڕێتەوە و باسی دەکات. بەڵام لێرەشدا (خۆ) بۆ ئەو پێکهاتەیەکی مێژووییە و لە نێو (کایاکانی ڕاستییدا) سەریهەڵداوە.[178] تاکەکان (خۆ)یان ناناسن چونکە (خۆ) نیە. ئەوان کلافەیەک ئەزموونن لە نێو تۆڕی کایەکانی ڕاستی و پەیوەندییە مێژووییەکاندا. ئەگەر تاکێکی باوەڕکەر و شوێنکەوتووی دۆگمایەکی ئایینی هەڵوێستێکی سوکراتی بەرانبەر مردن هەبێت، ئەوە ناگەیەنێت، کە ئەو باوەڕکەرە ناوەڕۆکێکی گیانەکییە و خاوەنی (خۆ) یەکی نەمرە.

ئەو بەو باوەڕە گەیشتوە چونکە ئەو باوەڕە لە نێو کایەکانی ڕاستی سەردەمەکەی خۆیدا و کەلتوورەکەی سەریهەڵداوە و لە نێو بیرکردنەوەی ئەودا موتوربە کراوە. چیەتی ئەو لە دەرەوەیدا پێکهاتووە و بە بوونیەوە گرێدراوە. بەم جۆرە (خۆ) نیە، بەڵام لە ناو کایەکانی ڕاستییدا پێکدێت و دادەهێنرێت.

جەختکردن لە سەر کایەکانی ڕاستی و تۆڕی پەیوەندییە مێژووییەکان بە بێ ئاوەڕدانەوە لە ویست و ئاگایی تاکەکان بۆ داهێنانی (خۆ) گەڕانەوەیە بۆ بابەتگەرێتی ڕووت و بایەخنەدان بە خۆگەرێتی، کە

178- James Faubion (ed.). *Aesthetics, Method, and Epistemology: E - sential Works of Foucault 1954- 1984,* vol. 2, New York: New Press. 1998. P. 117

لێرەدا ئێمە و هەموو ئەوانەی خۆگەرێتی و بابەتگەرێتی هاوتەراز دادەنێن و ئەم جیهانەش مرۆڤانە دەبینن دەخاتە نێو کەمپی نایارانەوە. بێگومان، من، وەکو دێکارت نکۆڵی لە ڕۆڵی بابەتگەرێتی ناکەم و ئەم لایەنەش بە قوربانی خۆگەرێتی ناکەم. بەڵام ئەگەر (خۆ) لە دەرەوەیدا بوونی پێکهاتبێت تاک، وەکو کەسێکی ئاگامەند چی ڕۆڵێکی مێژوویی دەبینێت؟ چۆن دەبێت بە داهێنەر؟ لەگەڵ ئەم پرسیارانەدا فوکۆ بەرەو کێشەی (هونەر) ڕادەکێشین، کە خۆشی نەیتوانیوە ئاوەڕی لێنەداتەوە و بیروڕای خۆی لە سەر دەربڕیوە. فوکۆ لە نووسراوێکیدا لە سەر هونەر دەڵێت، "ئەوەی سەرنجم ڕادەکێشێت ئەوەیە، کە لە کۆمەڵی ئێمەدا هونەر بووە بە شتێک پەیوەندی بە بابەتەکانەوە، نەک ژیانەوە هەیە. هونەر بووە بە بەشێک بۆ پسپۆڕان و هونەرمەندان. ئایا ژیانی هەموو کەسێک هونەر نیە؟ بۆچی چرایەکی سەر مێز یان کۆشکێک هونەر بێت و ژیانمان هونەر نەبێت؟"[179] ژیانی تاکێک دەبێت بە هونەر ئەگەر تاکەکە وەکو هونەرمەند داهێنەر بێت و ژیانیشی بەرهەمێکی داهێنراوی خۆی بێت، نەک پێکهاتەیەکی لە دەرەوە دانراو. لە کۆمەڵی ئێمەدا، بە تایبەتی لەگەڵ پەرەسەندنی تەکنەلۆجیا و تەنینەوەی ژیانمان بە تۆڕی تەکنەلۆجیا و کایەکانی ڕاستی تەکنەلۆجیاوە تاک بووە بەو پێکهاتە لە دەرەوە دامەزرێنراوەی فوکۆ باسی دەکات و بوونی مرۆڤی لە سەر دادەنێت. بەڵام لەگەڵ پرسیارەکەیدا "بۆچی چرایەکی سەر مێز یان کۆشکێک هونەر بێت و ژیانمان هونەر نەبێت؟" لەو خەتە لادەدات و بەرەو گرنگی خۆگەرێتی دەڕوات. هونەر و داهێنان دوو کێشەی بنەڕەتی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی سەردەمە، کە لە پەنجەرەی

---

179 - Paul Robinow(ed.). *Ethics: Essential Works of Foucauit 1954-1984,* vol. 1, London: Penguin Books, 1997. P 261.

ئەم دوو کێشەیەوە دەڕوانینە ئاسۆیەکی نوێ و داهاتوویەکی ئەو دیو کایەکانی ڕاستی سەردەمی تەکنەلۆجی. منیش لەگەڵ فوکۆدا لەو خاڵەدا، کە ژیانی هەموو تاکێک دەبێت بە بەرهەمێکی هونەری دابنرێت هاوڕام. بەڵام چۆن ژیان و بەرهەمی هونەری دەخرێنە ڕیزەوە؟ چی خسڵەتێکی تایبەت هەیە ژیان و بەرهەمی هونەری لە یەکدی نزیک دەکاتەوە؟ بەرهەمی هونەری لە ئاکامی پرۆسەی (داهێنان)ەوە پەیدا دەبێت. داهێنانیش پەلکێش کردنی بوونێکە لە نەبوونەوە. پەیدابوونێک لە بوونەوە بۆ بوون بە داهێنان دانانرێت. لەم ڕووەوە هونەرمەند داهێنەرە و بەرهەمەکانی داهێنانی (شتێک)ە، کە لە پێشتر نەبووە. سەرنجدان لە ژیانیش، بە تایبەتی ژیانی مرۆڤە ڕەسەن و خۆناسەکان، ئەوانەی لە ناو کایەکانی ڕاستییدا نابن بە داشی دامە و نامۆ نین داهێنان و هونەرانە یە.[180] ئێمە بە بێ گەڕانەوە بۆ بونیادی ئۆنتۆلۆجی بوونی مرۆڤ و تێگەیشتن لەو بونیادە لە بەر ڕۆشنایی فەلسەفەی بوونخوازییەوە ناتوانین بەراوردی ژیان و بەرهەمی هونەری بکەین. پێویستە ئەو خاڵە بسەلمێنین، کە ژیان داهێنانە. ئەمەش لە سەر ئەو بەستێنە خۆی ڕادەگرێت، کە بنەڕەتی بوونی مرۆڤ بە ناوەڕۆکێکی لە پێشتر و نەگۆڕەوە

180 - من لەکۆڕێکدا لە سەر( شیعر و فەلسەفە)، کە بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ لە سلێمانی ١٤/٤/٢٠٠٤ بۆیان سازکردم ئەم خاڵەم باسکردووەو لەمەش دوام چۆن هونەر لە سەردەمی تەکنەلۆجیا دەبێت بە هێزی ڕزگاریکەر. لە کۆڕێکی دیکەشدا بەناوی (دازاین و خوێندنەوەیەکی نوێی هایدیگەر)، کۆمەڵەی بوونخوازانی ئوستراليا لە٢/٦/٢٠٠٥ لە مالبۆرن بۆیان سازکردم جەختم لە سەر ئەو خاڵەکرد، کە (داهێنان) پێشمەرجە بۆ بوونی مرۆڤ چونکە مرۆڤ خاوەنی ناوەڕۆکێکی لە پێشتر دامەزرێنراو نیە و هەر چی بێت، ئەو چییە تیەی، ئەگەر ڕەسەنانە بژی، خۆی دایدەهێنێ.

نابەستێتەوە. بوونی بۆ (هیچ) دەگەڕێنێتەوە. لەو (هیچ)ەوە، بەو هەژارییەوە و بێ ناوەڕۆک مرۆڤ هەوڵی دامەزراندنی ناوەڕۆکی خۆی دەدات و دەبێت بەوەی خۆی دەیەوێت. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە مرۆڤ دووچاری دوو ڕێگای جیاواز دەبێت. لە لایەکەوە، دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی ئەو سترەکچەرەی تێیدا دەژی و شوێن دۆگمای نێو ئەشکەوت دەکەوێت و بە نامۆیی دەمێنێتەوە و بوونی دەبێت بە نارەسەن. ئەمەش ئەو بارودۆخەیە بونیادگەرییەکان و پاش بونیادگەرییەکان بە سەر بوونی هەموو تاکێکدا جارێک بە ناوی سترەکچەر و جارێکی دیکە کایەکانی ڕاستی و تەکنەلۆجیای خۆ و دەستەڵات ناوزەدی دەکەن. ڕێگەی دووەمیش، ئەو ڕێگایەیە مرۆڤی بەرزی نیتشە و بوونخوازەکان (وجودیەکان) دەیگرنە بەر. لەم ڕێگایەدا مرۆڤ خۆی تەسلیمی دەستەڵاتە دەرەکییەکان و دۆگمای ئەشکەوت ناکات و داهێنەرانە ژیانی خۆی دەکات بە پرۆژە و لە نەبوونی و هەژاری بوونیەوە، لە بێ ناوەڕۆکی و بێ واتایی ژیانەوە، ناوەڕۆک و واتا بە بوونی دەبەخشێت. لە قۆناخی دوایی گەشەکردنی بیرکردنەوەی فەلسەفییدا فوکۆ خۆی لەم بۆچوونە بوونخوازیانەوە نزیکردۆتەوە، لەو باوەڕەدایە، کە (خۆ) (ناوەڕۆک) نیە، بەڵام پێویستە تاکە کەسەکان (خۆ) پێکبهێنن و ببن بە خاوەنی (خۆ)ی خۆیان.[181] ئەمەش بە بیروڕای من لەو زەمینە ئۆنتۆلۆجییەوە سەرهەڵدەدات لە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد و لەگەڵ کێشەی (کایەکانی ڕاستی) و دەستەڵاتی زاڵبووی سترەکچەری دەرەکییدا ناکۆکە.

جین فرانسوا لیۆتارد بیریارێکی دیکەی پاش تازەگەرییە لە ژێر

181 - Paul Rabinow. *Ethics: Essential Works of Foucault 1954- 84*, vol. 1, p. 290.

کاریگەرێتی نیتشەدا بۆچوونەکانی لە سەر ڕاستی و مێتاگۆتار یان بیردۆزە و بوونی مرۆڤ ڕووندەکاتەوە. لە پەرتووکەکەیدا *The Postmodern Condition* (1979) دژی بنەڕەتگەرایی ڕادەوەستێت و مێتاگوتارەکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا، بە مێتاگوتاری مارکسیەکانەوە ڕەتدەداتەوە.[182] لەو باوەڕەدایە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی مێتافیزیکی بنەڕەتگەرایەتی، کە لە پێشتر بە مێتافیزیکی ڕووناکبین ناوزەدمانکرد، بنەڕەتەکانی ڕاستی و زانین و بەها هەمەکییەکان لەناو دەچن و هیچ بیروباوەڕێکی فەلسەفی و زانستی ناتوانێت لافی (مێتا-گوتار) لێبدات و بیردۆزەیەک دابمەزرێنێت، کە لە بەر ڕۆشناییەکەییدا هەموو دیاردە و ڕووداوەکان تەفسیر بکرێن. ئەو جۆرە بانگەشە و خۆ بە حەقزانینە هەڵوێستێکی تازەگەرانە بوو، کە لە سەر بناخەی مێتافیزیکە ڕووناکبینەکە هەڵچنرا بوو. لەگەڵ ڕەتدانەوەی ئەو شێوە مێتافیزیکییەدا تازەگەرایەتی تێپەڕ دەکەین و خۆمان بە قۆناخێکی دیکەی بیرکردنەوە دەگەیەنین، کە مێتاگوتار تیایدا ناژی و دەبێت بە سەردەمی ڕێژەگەرایەتی و گۆڕانی بەردەوام و ژیانەوەی جیاوازییەکان و حوکمکردنی وردە گوتارەکان.[183] نیتشە و لیۆتارد لە سەر ئەو خاڵە هاوڕان، کە جەخت لە سەر تێپەڕبوون لە تازەگەری دەکات و بۆ هەر دووکیان، ئەگەر فێرگەیەکی فەلسەفی ئەمڕۆ خۆی بە خاوەنی مێتاگوتار یان بیردۆزە دابنێت ئەوا نەیتوانیوە قۆناخی تازەگەری و ڕۆشنگەرایەتی جێ بهێڵێت و خۆی بە قۆناخی

182- لیۆتارد هەموو جۆرە مێتاگوتارێک ڕەتدەداتەوە. من لێرەدا ناوی مێتاگوتاری مارکسیم هێناوە، چونکە ئەم بیریارە مارکسی بوو. وەکو فوکۆ لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسادا کاری دەکرد.

183- Jean- Francois Lyotard. *The Postmodern Condition: A Report on Knowledeye*, translated by Geoff Bennington and Brian Massumi, Munchester: Manchester University Press, 1997. PP. 37- 38.

سەردەمەکەمان بگەیەنێت. لەم ڕووەوە، هەندێک بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی سەردەم بە تایبەتی فەلسەفەی مارکسی لە بۆچوونی بیریارانی پاش تازەگەرییدا نەیتوانیوە خۆی بە قۆناخێکی نوێتر بگەیەنێت و لە نێو کەلتووری تازەگەرایەتییدا ماوەتەوە. ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی چەند بیریارێکی، وەکو فوکۆ و درێدا و لیۆتارد..هتد، کە هەڵگری بیروباوەڕی مارکسی بوون و لەگەڵ لایەنە چەپەکانی فەرەنسا کاریان کردووە، ئەو دوورگەیە بەجێبهێڵن و زیاتر خۆیان لە نیتشە نزیک بکەنەوە چونکە بیرکردنەوەی فەلسەفی نیتشە و مێتافیزیکی هیچگەرایەتی (بەرنامەگەری) گۆڕانکاری بنەڕەتی لە بیرکردنەوەی فەلسەفی و تێگەیشتنی نوێتر لە شارستانیەت و ناوەڕۆکی مێژوومان بۆ دەخاتەگەڕ. جین بۆدلیێرالد بیریارێکی دیکەی نەریتی پاش تازەگەرییە لەگەڵ لیۆتاردا گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی، کە سەردەمەکەمان پاش سەرهەڵدانی فەلسەفەی نیتشە گۆڕانکاری بە سەردا هاتووە و جیهان بووە بە جیهانی تاکە بێ (خۆ) کان و سڕینەوەی جیاوازی نێوان ناوەوەو دەرەوە و ناوەڕۆک و ڕواڵەتیان. لەم سەردەمەدا بۆ بیریارانی پاش تازەگەری جیاوازی و فرە لایەنی ڕاستییەکان بە سەر بیرکردنەوەدا زاڵن و دەتوانرێت ڕووداوەکانی مێژووش، ڕاستییەکان بەو جۆرەی پێکهاتوون لە ناو شوشەی تەلەفزیۆنی کەناڵە فرەکانەوە بناسرێن.

لیۆتارد لەو باوەڕەدایە (پاش تازەگەری) بارودۆخێکی Condition تایبەتە بۆ قۆناخی پاش-پیشەسازی و ئاماژەش بۆ لایەنی نەزۆک و چەقوەستاوی تازەگەری دەکات. تازەگەری، کە دەرەنجامی فەلسەفەی ڕۆشنگەرانەیە هەوڵی دامەزراندنی زەمینەیەکی فەلسەفی بۆ بیرکردنەوەی زانستانە و ڕامیاری سەردەمەکەی داوە. بۆ ئەم

کارەش پەنای بردۆتە بەر(مێتا-گۆتار) یان پێکهێنانی بیردۆزە.[184] لێرەدا، بۆ لیۆرتاد و بۆدلیرارد و بیریارانی دیکەی پاش تازەگەری (مردنی خوا) لە فەلسەفەی نیتشەدا بۆتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی (مێتا-گوتارەکان) یان مردنی بیردۆزە و مردنی دەستەڵاتی دەوڵەتی سەرکوتکەر و تۆتەلیتار و هەمووگەرایەتی. سیستەمەکانی بیرکردنەوە و نەریتەکان جیاوازی و فرە لایەنی بە سەریاندا زاڵدەبن و لە بەر ڕۆشنایی وردە گوتارەکاندا واتاکانیان لێکدەدرێتەوە بە بێ ئەوەی هیچ کام لەم وردە گوتارانە لەوانی دیکە بە ڕاستر دابنرێت و هاوکات بتوانێت (هەموو) لایەنەکانی ئەو سیستەمە بگرێتەوە و توێژینەوەیەکی گشتگرانە و هەمەکیمان بداتێ. بەم جۆرە پاش تازەگەری لەگەڵ مردنی خوادا جەنگاوەرانە دژی دەستەڵاتی (خۆ)ی تازەگەری و مێتا-گوتار و تۆتەلیتاری ڕادەوەستێت و لە سەر زەمینەی ڕێژەگەرایەتی و وردەگوتارەکاندا بناخەی سەرەتایەکی نوێمان بۆ ڕەنگ ڕێژدەکات.

گلیس دیلوز بیریارێکی دیکەی پاش تازەگەرییە ئاوەڕێکی (جیدی) لە نیتشە دابێتەوە و گرنگی و کاریگەرێتی ئەم فەیلەسوفە بە سەردەمەکەمانەوە ڕوونبکاتەوە. دیلوز، کە مامۆستای فەلسەفە بوو لە فەرەنسا، لەساڵی ١٩٦٢ پەرتووکێکی بە زمانی فەرەنسی **Nietzsche et la Philosophie**. بڵاوکردەوە.[185] دیلوز هەوڵیداوە بە پێچەوانەی هایدیگەرەوە، کە نیتشەی بە دوا بیریاری مێتافیزیکی ناوزەد کرد، لە فەلسەفەی نیتشە بکۆڵێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش لە

184- هەمان سەرچاوە. لاپەڕە ٨

185- ئەم پەرتووکەی دیلوز لەساڵی ١٨٩٣ لە لایەن (H. Tomlinson) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و بڵاو کراوەتەوە.

سەرەتاوە ئاماژەی دوو خاڵ دەکات، کە بوون بە بناخەی بیرکردنەوەی فەلسەفەی نیتشە. یەکەم ویستی هێز و دووەم هەڵوەشاندنەوەی بەهاکان.[186] ئەم دوو خاڵە چی پەیوەندییەکیان بە بیرکردنەوەی پاش تازەگەری هەیە؟ چۆن دیلوز ئەم پەیوەندییە ڕووندەکاتەوە؟ ئێمە لە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەو کێشەیە کرد، کە ویستی هێز بۆ نیتشە، هەر چەندە بنەڕەت و ناوەڕۆکی هەموو بوونێکە، ڕاستیەکی هەمەکی و بەرز نیە. ویستی تاکەکان و هەندەکییە. ئەمەش ئەوە دیاری دەکات، کە ویستی هێز لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دی جیاوازە و وەکو خۆی نامێنێتەوە. کەوابوو ویستی هێز ڕاستیەکی نەگۆڕینە، کە بۆ هەمیشە لەو ناوەڕۆک و شێوەیەدا بمێنێتەوە. بوونێکی جیاوازە و سەرچاوەی جیاوازییەکانە. بوونی جیاوازییەکان لە سەر ویستی هێز ڕادەوەستێت و پەیوەندییەکی ئۆنتۆلۆجییان لەگەڵ یەکدا هەیە. جیاوازییەکان لە نێو مێژوودا سەر هەڵدەدەن چونکە ویستی هێز جیاوازە و لە گۆڕاندایە. لە لایەکی دیکەوە سەرهەڵدانی جیاوازی لەو سەرچاوەیەوە، کە نیتشە گوتەنی ناوەڕۆکی بوونە، دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی بەهاکان. بەردەوامی لە سەرهەڵدانی جیاوازی و گۆڕانی ویستی هێزدا پرۆسەی بەردەوام بوونی هەڵوەشاندنەوەی بەها کۆنەکان و دامەزراندنی بەها نوێکانە. پرۆسەیەکە لە بێ بەهاییەوە بەرەو داهێنانی بەهاکان دەکەوێتەڕێ.[187]

جەختکردن لە سەر جیاوازییەکان جێگرتنی ئەم ڕاستییە لە نیتشەوە بۆ بیریارانی پاش تازەگەری کاریگەرێتی بە سەر بیرکردنەوەی (ژاک دێریدا) دا تۆمارکردووە. دێریدا ئەم ڕاستییە فەلسەفییە

186- Gilles Deleuze. *Nietzsche and philosophy*, translated by H. Tomlinson, London: Athlone Press, 1983. P. 1.

187 - هەمان سەرچاوە. لاپەڕە. ٣.

(ئۆنتۆلۆجییە)ی لە بۆ چوونەکانیدا لە نووسراوی Writing and Difference دا بۆ کێشەکانی واتا و تێگەیشتن و ڕاڤەکردنی دەق بەکارهێناوە. هەروەها لە نووسراوێکی دیکەیدا White Mythology لە چەند شوێنێکدا لەمەڕ بیروباوەڕی نیتشە دواوە. لە ڕاستیدا، لە ساڵەکانی هەفتادا خوێندنەوەی فەلسەفەی نیتشە و نووسین و سێمینار و کۆنفرانس لە سەر بیروباوەڕی ئەم فەیلەسوفە لە فەرەنسا بوو بە نەریت و باوی ئەکادیمی و ڕۆشنبیری. کەم بیریار و ڕۆشنبیری فەرەنسی هەبوو ئاماژە بۆ نیتشە و فەلسەفەکەی نەکات. هەندێک جار لە بەر ڕۆشنایی تەفسیرەکەی هایدیگەردا و جاری دیکەش بە پێچەوانەی هایدیگەرەوە یان (نا-هایدیگەر کردنی نیتشە) لە کێشەکەیان دەکۆڵییەوە.

# بەشی حەوتەم
# سەرەنجامەکان

لە سەرەتای ئەم نووسینەوە ئەو خاڵەم باسکرد، کە خوێندنەوە و تێگەیشتن لە فەلسەفەی نیتشە کارێکی ئاسان نیە و خوێنەر و توێژەر ماندوو دەکات. ئێستاش لە کۆتایی ئەم بەرهەمەدا هەست بەو ماندوو بوونە دەکەم. بەڵام ئەوەی گرنگە پێشکەش کردنی ئەم بەرهەمەیە لە شێوازێکی ڕێکوپێکدا و ئاسان کردنەوەی کارەگرانەکەیە بۆ خوێنەر. هەوڵم داوە بیروباوەڕە فەلسەفییەکانی نیتشە، کە لە بەرهەمەکانیدا پەرش وبڵاو بوونەتەوە و بە میتافۆر دەربڕاون لەم توێژینەوەیەدا کۆبکەمەوە و بە گوێرەی تێگەیشتن و بۆچوونی فەلسەفی خۆم لە واتاکەی بکۆڵمەوە. مەبەستی سەرەکی من لەم توێژینەوەیە، لە سەرەتای گەشتەکەمەوە و تێگەیشتنم لە نیتشە هەوڵدانێکە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتیانەی ئەم بیریارە لە جیهانی بیرکردنەوە دا هێناویەتە کایەوە، کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی نەریتێکی مێتافیزیکی و فەلسەفی نوێ دژی تازەگەری. ئەگەر بیرکردنەوەی فەلسەفی ئەمڕۆ توانیبێتی تازەگەری ڕەتبکات و خۆی بە قۆناخێکی نوێی پاش تازەگەری بگەیەنێت، ئەوا ناتوانین لەو گۆڕانکارییە بە بێ ئاوەڕدانەوە لە نیتشە بگەین. نیتشە خاوەنی ئەو گۆڕانکارییەیە و فەلسەفەکەشی سەرەتای ئەم سەرەتا نوێیەیە، کە بە پاش تازەگەری ناوزەد کراوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی نیتشە لەم گۆڕانکارییەدا بە پێویستم زانیوە بۆ چوونەکانی ئەم فەیلەسوفە لەمەڕ بوونی مرۆڤ باس بکەم و بۆ ئەم مەبەستەش لە واتای تراجیدیاوە بەم کارە هەستاوم. لەم بەشەدا لەگەڵ ڕوونکردنەوەی واتای تراجیدیا، کە نیتشە پەنای بۆ کێشەیەکی ئەدەبی و هونەری بردووە و لە میتافۆری وزەکانی دیۆنسیس و ئەپۆلۆدا باسیکردووە، من تراجیدیام گەیاندۆتە سەر ئەو زەمینە مێتافیزیکییە هیچگەرایەتییەی نیتشە پەیڕەوی کردووە. لەوێوە پەیوەندی نێوان بوونی مرۆڤ، وەکو بوونێکی تراجیدی و مێتافیزیکی هیچگەرایەتیم باسکردووە. میتافیزیکی هیچگەرایەتی، کە نیتشە لە ژێر کاریگەرێتی شۆپنهاوەردا بانگەشەی بۆ دەکات، بە پێچەوانەی مێتافیزیکی ڕووناکبینی، بنەڕەتی بوون بۆ (هیچ) دەگەڕێنێتەوە. ئەم هەڵوێستە مێتافیزیکییەش دوو ئەنجامی فەلسەفی گرنگ دەهێنێتەکایەوە، لە لایەکەوە بناخەی هەموو زانین و بەها و ڕاستییەکی هەمەکی و ڕەها و نەگۆڕ هەڵدەوەشێنێتەوە. لە لایەکی دیکەوە بێ واتایی و بڕانەوە بە بوونی مرۆڤ دەبەخشێت. ناوەرۆکی بوون لە هیچگەرایەتی نیتشەدا، بە پێچەوانەی هیچگەرایەتیەکەی شۆپنهاوەریش، ڕاستیەکی هەمەکی نیە، ویستێکی ڕەهای ژیان نیە، بەڵکو ویستی هێزە یان ڕاستییەکی هەندەکییە، کە هەمیشە لە گۆڕاندایە و جۆرا و جۆرە. ئەمەش بۆتە هۆی سەرهەڵدانی (جیاوازی) لە نێوان هەموو دیاردەکانی ئەو ڕاستییەدا و لەناوبردنی ناسنامەی نەگۆڕ و مانەوەی بوونەکان، وەکو خۆیان، کە بووە بە یەکێک لە کۆڵەکە بنەڕەتییەکانی بیروباوەری پاش تازەگەری. لەم بۆ چوونەوە نیتشە دژی ئەو سیستەمە فەلسەفییانە ڕادەوەستێت هەوڵی دۆزینەوە و دامەزراندنی بناخەی مێتافیزیکی و بیردۆز و میتا-گوتارەکان دەدەن.

بۆ گەیشتن بەم سەرەتایە نیتشە لەگەڵ ڕووخاندن و ڕەتدانەوەی مێتافیزیکی ڕووناکبیندا قۆڵی لێهەڵکردووە و هەواڵی مردنی خوا بە خوێنەر دەگەیەنێت. (مردنی خوا)، کە کێشەیەکی هەرە گرنگی نێو بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشەیە پێگەیەکە بۆ مردنی مرۆڤی تازەگەری و کوشتنی (خۆ)ی تازەگەری و هاوکات لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز. ئەم فۆرمەی بوونی مرۆڤ لە فۆرمی بوونی مرۆڤی نزم یان ناشرین جیاکراوەتەوە. جیاوازییەکەیان لە سەر بنەڕەتێکی ئۆنتۆلۆجی دانەمەزراوە و فینۆمینۆلۆجیانەیە. ئەوەی دەبێتە هۆ بۆ سەر هەلدانی جیاوازییەکە هەڵوێستی مرۆڤ و هەڵبژاردنی فۆرمەکەی بوونیەتی. مرۆڤی بەرز یان نزم لەو فۆرمەدا نایەتە جیهانەوە بەڵکو خۆی ئەو فۆرمەی بوونی هەڵدەبژێرێت. بەرزێتی بوون خۆرسکێکی نەگۆڕ و زکماک نیە و دیاردەیەکی فینۆمینۆلۆجی یان مێژووییە و لەگەڵ شۆڕشە مێتافیزیکییەکەدا و هیچگەرایەتی بەرنامەگەرییدا دەستپێدەکات. مرۆڤی بەرز بوونێکی خۆناس و ڕەسەنی هەیە. ڕەسەنیەتی ئەم بوونە لەخۆ-هەڵبژاردن و داهێنانی بەهاکانیدایە، کە هاوکات ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی نەریتی باو و کەلتورە بازاڕییەکەیە. بوونێکە بووە بە خاوەنی چارەنووسی خۆی. هەوڵدەدات لە داهاتوودا بە بەردەوامی خۆی بە ترۆپک و بەرزایی دیکە بگەیەنێت، بە مەرجێک هیچ لەم بەرزایی و ترۆپکانە نابن بە دوا ترۆپک و دوا ویستگەی پرۆژەکانی بوونی. لەگەڵ سەرهەڵدانی مرۆڤی بەرزدا، کە بوونێکی ڕسکاوی هەیە و پلان و نەخشەیەکی لە پێشتری بۆ دانەنراوە، پرۆسەی داهێنانی بەهاکانیش دەبێت بە پرۆژەیەکی سەرەکی ئەم بوونە. پرۆسەکە ڕەوتێکی ژوورکێشی پەرەسەندوی بەردەوامە و لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی بەها کۆنەکانەوە دەکەوێتە گەڕ. لەم بێ بەهاییەوە، یان ڕەتدانەوەی بەها هەمەکی و

نەگۆڕ و چەسپاوەکانەوە مرۆڤی بەرز ڕوو لە داهێنانی بەهای نوێ و گونجاوتر دەنێت. ئەم پرۆسەیەشە لە بوونی مرۆڤی بەرزدا یان ئەو بوونە ڕسکاو و بێ واتایەدا، مێتافیزیکی هیچگەرایەتی نیتشە لە نێو تەمومژی ڕەشبینی و بێهودەییەکی نەزۆکدا ڕزگار دەکات و هێز و توانایەکی لەبن نەهاتوو بە مرۆڤ دەدات و ئەم شێوە میتافیزیکەش دەکات بە (هیچگەرایەتی بەرنامەگەری). ئەم شێوە هیچگەرایەتییە مرۆڤ لە ئاستی بێهودەیی ژیاندا بێ دەستەڵات ڕاناگرێت و دەیکات بە قارەمانی مێژوو. ئەم مرۆڤە بەرزە یان قارەمانەی نیتشە خەونی پێوە بینیوە تاکێکی زەبوون و نائومێد و ڕەشبین نیە. تاکێکە لە بێهودەیی ژیانەوە بەرەو داتاشینی واتا و بەها بۆ ژیان ڕێدەکات و هەوڵدەدات ببێت بەوەی خۆی دەیەوێت. قارەمانێکە دژی دۆگماکان، بتە دامەزرێنراوەکان، ڕاستی و بەها هەمەکییەکان، بنەڕەتە نەگۆڕەکان و سیستەمە ڕاوەستاوەکان. بە بەردەوام لە نێو جەنگدایە و خۆی تەسلیم ناکات. قارەمانێکە، لە مێتافیزیکی ڕووناکبین و زانین و ڕاستی و بەهاکانی سەردەمی تازەگەری یاخییە و دەیەوێت خۆی بە سەردەمێکی نوێتر و ترۆپکێکی بەرزتری بیرکردنەوە و شارستانیەت بگەیەنێت. بەم جۆرە، توێژینەوەکامان جەختی لە سەر گرنگی ئەم چوار کێشەیە، لە فەلسەفەی نیتشەدا کردووە، کە بە بیروڕای من بیروباوەڕی فەلسەفی ئەم بیریارە دەکەن بە سەرچاوەی بۆچوونەکانی پاش تازەگەری و سەرهەڵدانی بیرێکی فەلسەفی نوێ لە مێژوودا:

یەکەم. ڕوخانی بنەڕەتێکی مێتافیزیکی نەگۆڕ و بانگەشەکردنی مێتافیزیکی هیچگەرایەتی-بەرنامەگەری. ئەمەش جیاوازییەکی سەرەکییە لە نێوان مێتافیزیکی نیتشە و هیچگەرایەتی ڕەشبینیدا. نیتشە لەو تاوانەش دوور دەخاتەوە، کە هەندێک لە ڕۆشنبیران

دەیخەنە پاڵی و بیرکردنەوە فەلسەفییەکەی بە ڕەشبین و نەزۆک دادەنێن.

دووەم. لە دایکبوونی مرۆڤی بەرز ڕووداندێکی گرنگە و فەلسەفەی نیتشە یان باشتر وایە بڵێین هیچگەرایەتییەکەی بە مێژووەوە دەبەستێتەوە. ئەم ڕووداوەش پەیوەندی بە مردنی خوا و گەڕانەوەی بوونەوە بۆ (ویستی هێز) هەیە. مرۆڤی بەرز بێ بڕوا و خاوەن دەستەڵاتە و تاکێکە جیاوازە و داهێنەری مێژووە.

سێیەم. ڕاستی بوون یان ناوەڕۆکی بوون (ویستی هێز)ەو لە شێوازی هەندەکی و جۆرا و جۆردا خۆی دەردەخات و جیاوازییەکان دەسەپێنێت.

چوارەم. بوونی مرۆڤی بەرز پرۆسەی داهێنانی بەهایە. بوونێکە بەردەوام بەهاکان هەڵدەوەشێنێتەوە و بەهای نوێ دادەهێنێت.

باسی ئەوەشمانکرد، کە نیتشە بە میتافۆر بیروباوەڕە فەلسەفییەکانی خۆی دەربڕیوە. بەکارهێنانی میتافۆر بۆ دوو خاڵی سەرەکی دەگەڕێنەوە، کە لەم نووسراوەدا ئاماژەمان بۆ کردوون. یەکەمیان سەربەستی نووسەر لە بەکارهێنانی زمان و فۆرمە هونەرییەکاندا دەردەخات، دووەمیش وابەستە بە بۆچوونی مێتافیزیکی نیتشەوە و چییەتی ناوەڕۆکی بوون. بۆ نیتشە (چییەتی) بوون (ویستی هێز) ڕاستییەکی ناوەکی و ئارەزوویەکی (ڕەوان)ە. هێزێکە نا-هۆشەکی. زمانی پەخشانی و چەمکە زانستییەکان، کە بۆ ناسینی دیاردەکان بەکاردەهێنرێن بە تەواوی ئەو ڕاستییەمان پێ ناناسێنن. لەبەر ئەمە پەنابردنە بەر میتافۆر، بە تایبەتی مۆسیقا یان هۆنراوە بۆ دەربڕینی ئەو ڕاستییە ناوەکییە دەبێت بە پێویستیەکی مێتافیزیکی و ڕۆڵی فەیلەسوف و هونەرمەند، وەکو یەک دادەنرێن. هەر چەندە

توێژینەوەکەم و تێگەیشتنم بۆ نیتشە پەیوەندی بە بڕوای فەلسەفی خۆمەوە هەیە و بە تایبەتی تەفسیرکردنی تراجیدیا و هیچگەرایەتی و بوونی مرۆڤی بەرزم، لە بەر ڕۆشنایی فەلسەفەی بوونخوازییدا (بوونگەرایەتی) کردووە، دەبێت ئەو خاڵەش ڕوونبکەمەوە، کە بیریارانی پاش بونیادگەری و پاش تازەگەری لەگەڵ ئەم بۆ چوونەماندا هاوڕا نین. ئەوان بوونی مرۆڤ دەخەنە نێو کایەکانی ڕاستی و تۆڕی پەیوەندییە مێژووییەکانەوە. ئەمەش بە بیروڕای من لادانە لە ناوەڕۆکی تێگەیشتنی نیتشە لە بوونی مرۆڤی بەرز (سوپەرمان). ئەگەر مرۆڤ کەشتیەکی نێو زریانی دەریای کایەکانی ڕاستی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بێت و هەمیشە بەو سترەکچەرەوە گرێدرابێت، ئەوا ئەو مرۆڤە بەرزەی کە نیتشە بانگەشەی بۆ دەکات هەرگیز لە دایک نابێت.

لە بەشی (نیتشە، پاش نیتشە) لەگەڵ ڕوونکردنەوەی بە (نازیکردنی) نیتشەدا بۆ چوونەکانی (هایدیگەر)م بۆ بەرگری کردن لە نیتشە و بە (نازینەکردنی) بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی بە درێژی باسکردوە. هایدیگەر، یەکەم بیریارە، فریای نیتشە کەوتبێت و وانەکانی لە سەر نیتشە سەرەتایەک بوون بۆ دژوەستان بەرانبەر بەنازی کردنی نیتشە و هەوڵیدا ڕێنەکەوتن و نەگونجاندنی بۆچوونە فەلسەفییەکانی نیتشە لەگەڵ ئایدیۆلۆجی ڕامیاری نازییەکاندا شیبکاتەوە. وانەکانی هایدیگەر، کە لە چوار بەرگدا لە چاپدراون و بە چەند خاڵێک، وەکو (هیچگەرایەتی کلاسیکی و چییەتی مرۆڤی بەرز و هەڵوەشاندنەوەی بەهاکان و ڕوانینی بایۆلۆجییانەی نیتشە) ئەم ڕێنەکەوتن و ناکۆکیانەی نێوان نیتشە و نازییەکان باس دەکات.

توێژینەوە و تێگەیشتنی هایدیگەر، لە فەلسەفەی نیتشە، کە کاریگەرێتی دیاریکراوی بە سەر ئاوڕدانەوە و تێگەتشتن لە نیتشە دوای ڕوخانی نازییەکان تۆمار کردووە، جیاوازە لە تێگەیشتن و تەنانەت مەبەستی بیریارانی پاش تازەگەرییەوە. توێژینەوەکەی هایدیگەر دوور خستنەوەی نیتشەیە لە تێ نەگەیشتن یان تەرساکردن و هەڵگێرانەوەی ڕاستییەکانی بیروباوەڕە فەلسەفییەکەی. لەمەش گرنگتر، نیتشە بۆ هایدیگەر دوا نوێنەری ئەو نەریتە مێتافیزیکییەیە، کە لە ئەفلاتونەوە بەجێ ماوە و بوون لە سەر زەمینەی ناوەڕۆك Essence دادەمەزرێنێت یان بە ناوەڕۆکەوەی دەبەستێتەوە. بۆ بیریارانی پاش تازەگەری بیروباوەڕی فەلسەفی نیتشە سێ کێشەی بنەڕەتی هێناوەتەکایەوە، کە بوون بە کۆڵەکەکانی بۆچوونی پاش تازەگەری. فەلسەفەی نیتشە، کە سەر بە مێتافیزیکی هیچگەرایەتییە، لەگەڵ ڕەتدانەوەی سەدەمی هۆشەکیدا بۆ بوون، زەمینەی بنەڕەت و بنەڕەتگەری هەڵوەشاندۆتەوە. لە لایەکی دیکەوە، ئەو ڕەتدانەوەیە بۆتە هۆی مردنی (خۆ)ی تازەگەری و لەناو بردنی خۆرسک و ناوەڕۆکێکی نەگۆڕ لە بوونی مرۆڤدا. ئەم دوو خاڵەش لە ئەنجامدا ڕۆڵێکی سەرەکی لە سەرهەڵدانی جیاوازییەکاندا دەبینن، کە لەم توێژینەوەیەدا لە چەند شوێنێکدا باسمانکردووە.

بەم کۆتاییە ئاماژە بۆ سەرەتایەکی نوێ دەکەم. سەرەتایەک، کە تەنیا هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە زەخیرەی بیروباوەری فەلسەفی نیتشە. دڵنیام لەوەی خوێنەر لە هەندێک شوێندا لەگەڵ بۆچوونەکانی مندا هاوڕا نیە. ئەمەش زەمینەیەک بۆ سەرهەڵدانی (جیاوازی)یەکان خۆشدەکات و کەژێکی ڕۆشنبیرانە بۆ گەشەکردن و پەرەسەندنی بیروباوەری فەلسەفی سازدەکات. پێویستە ئەو

ڕاستییە ڕەچاو نەکرێت، کە جیاوازی نابێتە ڕێگر لە ئاستی پەرەسەندندا، بە پێچەوانەوە، ژیانی ڕۆشنبیریمان دەوڵەمەندتر و پێشکەوتووتر دەکات. مرۆڤی ئەمڕۆ جیاوازە و لەو جیاوازییەوە داهێنەرانە جیاوازییەکەی بوونی دەسەلمێنێت و دەیەوێت ببێت بەو بوونە جیاوازەی خۆی دەیەوێت.

# فەرهەنگۆک

ئەپستمۆلۆجی: زاراوەیەکی یۆنانیە لە دووبەش پێکهاتووە: ئەپستمۆ (زانین) و لۆجی (زانست)، کە واتای زانستی زانین دەبەخشێت. ئەپستمۆلۆجی لقێکی فەلسەفەیە و لە چیەتی زانین دەکۆڵێتەوە.

ئەنەلۆجی: شوبهاندن.

ئەستۆ: ماتەر Matter

ئەستویی: ماتەری .

ئەندێشە: ڕامان، خەیاڵ، Imagination

ئامێر: ئامراز، کەلوپەلی بەردەست.

ئیشراقی: جۆرێک لە بیرکردنەوەی فەلسەفیانەیە شەهابەدین سوهرەوەری (١١٥٣-١١٩٢) کە بە (المقتول) ناسراوە هێناوییەتە کایەوە.

ئۆنتۆلۆجی: زاراوەیەکی یۆنانیە لە دوو بەش پێکهاتووە: ئۆنتۆ (بوون) و لۆجی (زانست)، کە واتای زانستی بوون دەبەخشێت. لقێکی فەلسەفەیە و لە واتای بوون دەکۆڵێتەوە.

ئایینخواز: کەسێک ئایین بە سەرچاوەی ڕاستی و زانینی بەهاکان دانێت و شوێنی بکەوێت.

ئۆنتۆ-تیۆلۆجی: زاراوەیەکی لێکدراوە لە دوو بەش پێکهاتووە: ئۆنتۆ (بوون) و تیۆلۆجی (خواناسی). بەو جۆرە مێتافیزیکە دەوترێت، کە بنەڕەتی بوون بە سەدەمی هۆشەکی و یەکەم بۆ بوون لە ژوور هەموو هەبووەکانەوە دادەنێت و لەو باوەڕەدایە، ئەو

سەدەمەغایە و مەبەستی بە  بوون داوە. باشترین نموونە، بۆچوونە مێتافیزیکیەکەی ئەریستۆیە.
ئاکار: Morality زۆرجار لە جێگەی ڕەوشت Ethics دادەنرێت، بەڵام جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ ڕەوشتدا هەیە. هەرچەندە ئاکار و ڕەوشت لە چیەتی بەهاکانی، وەکو چاکە و بەختەوەری و ...هید. دەکۆڵنەوە لەڕەوشتدا  ئەم بەهایانە لە دەرەوەی ویستی تاکەکاندا دەمەزرێنراون. بۆ ئاکار بەهاکان  ویستی تاکەکانە.
ئاگامەندی ڕەها: ئاگامەندی بێسنوور و هەمەکی.

بابەت:  Object
بایۆلۆجی:  زاراوەیەکی یۆنانیە لە دوو بەش پێکهاتووە:
بایۆ(ژیان) و لۆجی  (زانست)، واتای زانستی ژیان یان ژیانناسی دەبەخشێت.
بوون: بوونی گشتگر، بنەڕەتی هەموو شتێکی هەبوو، بوونێک کەبوونی هەموو شتێکی لەسەر ڕاوەستاوە و خۆی پێویستی بەچی دیکە بۆ بوونی نیە.
بوونی دیاردە: بنەڕەتی دیاردە یان ئەو بناخەیەی دیاردەکەی لەسەر دامەزراوە.
بوونی ڕەها:  بوونی بێسنوور و تەواوکۆ و خۆبژێو.
بێبڕوا:  ڕەتدانەوەی بوونی سەدەمی یەکەم بۆ جیهان و بوونی مرۆڤ.
بیرەهەمەکییەکان: مەبەست لە فۆرمەبەرزەکانی جیهانی بەرزی ئەفلاتونە.
بیردۆزە: تیوری ، دیمانە.
بیری زگماکی: جۆرێکە لە بیرۆکەیان زانین بە دیدی دێکارت مرۆڤ

لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێتە جیهانەوە و سەدەمی هۆشەکی لەناو هۆشی مرۆڤدا دایناوە.
بێهودە: بێکەڵک و لە واتابەدەر.
بەڵگەنەویست: دیاردەیەک هێندە ئاشکرا بێت پێویستی بە بەڵگە و سەلماندنی بۆ بوونی نەوێت.

پارادۆکس: کێشەیەک ڕەتدانەوەی مەحاڵ بێت. بۆ نموونە، ناتوانین بڵێین لاکێشە خڕە.
پیرۆز: دەخرێتەپاڵ بوونێکی لە کەمووکورتی بەدەر یان بوونێک لە هەموو لایەنێکەوە پڕو تەواو بێت .
پەیوەندی زەروری: پەیوەندی نەگۆڕ، بۆ نموونە، ئاگر بەبێ گەرمایی نیە. پەیوەندی نێوان ئاگر و گەرمایی نەگۆڕ و زەرورییە.
پەیوەندی پێویست: پەیوەندییەکی دیالێکتیکی‌یە لە نێوان دوو هەبووی جیاوازدا، وەکو هۆ و ئاکام.
پەیوەندی دیالێکتیکی: پەیوەندی نێوان بابەت و دژە بابەت، لە ڕاوەستانیان بەرانبەری یەکدی بەبێ یەکدی نابن. پەیوەندییەکی پێویست، کە نەتوانین بە پێچەوانەوە بیری لێبکەینەوە.
پەیوەندی ناوەکی: پەیوەندییەک لە دەرەوە دانەمەزرێ.
پێشتر شتێک یان هۆکارێک پاش بوونی ئێمە بکەوێت، یان لە پێش ئەزموونی هەستەکیمانەوە سەری هەڵدابێت و پێویستی بەو ئەزموونە نەبێت.
پێشمەرجی ئەپستمرۆلۆجی: ئەو پێشمەرجە پێویستانەن، کە بەبێ ئەوان زانین پەیدا ناکرێت.

تازەگەری: بەو قۆناخە فەلسەفیە دادەنرێت لەگەڵ بۆچوونەکانی

رێنه دێکارت (١٥٩٦-١٦٥٠) دەستپێدەکات.

ترانسێندنتاڵ: بەرز، لە ژوور ئاگامەندییەوە.

تراجیدیا: جۆرێکە لە شانۆگەری، بۆ یەکەمجار یۆنانیەکان دایانهێناوە و لەمەڕ ناخۆشی بڕانەوەی ژیان دەدوێت. تراجیدیا زاراوەیەکی یۆنانیی‌یەو لەو زمانەدا واتای (گۆرانی بزن) دەبەخشێت. ئەمەش لەو نەریتەوە هاتووە، کە یۆنانیەکان (بزن) یان بۆ دایۆنیس (خوای سەما و مۆسیقا و مەستبوون) کردووە بە قوربانی و سەریانبڕیوە.

تیلۆ **Teleo**: وشەیەکی یۆنانیە واتە کۆتایی یان مەبەست.

جیهانگەری: بوون-لەناو جیهاندا. شێوازێکی تێگەیشتنە لە پێشمەرجی بوون- لەناو جیهاندا.

جیهانی ئایدیاڵ: جیهانی فۆرمەهەمەکیەکانی مێتافیزیکی ئەفلاتون.

جیهانی دەرەکی: جیهانی دەرەوەی بیرکردنەوە، داکەوت.

جیهانی ناوەوە: مەبەست لە جیهانی بیرکردنەوە و ئەندێشەیە، نەک ناوەرۆکێکی گیانەکی.

حەدەس: دەرککردنی ڕاستەوخۆ بە بابەتی دەرەوەی ئاگامەندی.

خۆ: زات Subject

خۆی بەرز: خۆیەک لە ژوور ئەزموونە هەستەکیەکانەوە یەکێتی لە نێوانیان دروست دەکات. خۆیەکە بەڕێگەی ئەزموونی هەستەکیەوە ناناسرێت.

خۆ پێزی: خۆ- خۆیی.

دەرچوون: لەم توێژینەوەیەدا بۆ ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی دۆگمای نێو ئەشکەوت بەکارمهێناوە. دەرچوون لەو ئەشکەوتە ڕەتدانەوە و ڕەتکردنی دۆگما باوەکەیەتی و ڕەهەندێکی (شوێن) یی نیە.

دابڕانی سەرمەدی: مردن، لەناوچوونێکی هەمیشەیی و بێگەڕانەوە.

داهێنان: پەلکێشکردنی بوونێک لە نەبوونەوە.

دووەلیست: بۆچوونێکی مێتافیزیکییە باوەڕ بە بوونی دوو ڕاستەقینەی هاوتەراز دەهێنێت، کە هیچیان پێویستی بەوی دیکە بۆ بوونی هەبێت.

دیاردەی بوون: خۆ دەرخستنی (بوون) لە شێوازێکدا.

دیالێکتیک: زاراوەیەکی یۆنانیە بۆ یەکەمجار زینۆی ئیلیا و سوکرات و ئەفلاتون بەکاریان هێناوە. هیگل و مارکس بەرەوپێشەوەیان بردووە و، وەکو شێوە لۆجیک داکەوت و گۆڕانکارییەکانی نێو داکەوتیان لەسەر ڕاڤەکردووە.

ڕەتدانەوە: (نەفی). هێزی دیالێکتیکییە و گۆڕانکارییەکان ئافەرید دەکات.

ڕەسەن: بوونێکی خۆ ناس و خاوەن خۆ.

ڕسکاو: بوونێک لە خۆیەوە پەیدابووبێت.

ڕادیکاڵ: بنەڕەت، بناخە، بنەما.

ڕاستی بەرز: ڕاستی ترانسێندنتاڵ. ڕاستییەک لە ژوور ئەزموونی هەستەکییەوە.

ڕاستی ڕەها: ڕاستیەکی هەرگیز نەگۆڕ.

ڕووداو: لە لۆجیکی ئەریستۆدا خسڵەتێکی ناوەڕۆکە، کەناوەڕۆک دەتوانێت بەبێ ئەو بمێنێتەوە و بوونی بەردەوام بێت. مرۆڤی پێست ڕەش هەیە. بەڵام پێست ڕەشی ڕووداوە، ئەگەر مرۆڤ پێستی

ڕەشیش نەبێت هێشتا مرۆڤە.
ڕووداوگەری: بۆچونێکی مێتافیزیکییە بنەڕەتی پێویست بۆ ڕووداوەکان ڕەت دەداتەوە.
ڕێکەوت: بێمەبەست.

زانینی هەستەکی: زانینێک بە ڕێگەی هەستکردنەوە پەیدا دەبێت.
زانینی هۆشەکی: زانینێک بە ڕێگەی هۆشەوەپەیدا دەبێت و هەمەکییە.

سەدەمی هۆشەکی: سەدەمی یەکەم لە فەلسەفەی ئەریستۆدا.
سەدەمی یەکەم: هۆکار یان بنووسی یەکەم. لە فەلسەفەی ئەریستۆدا ئەو بوونەیە، کە لەوەوە جوڵان و گۆڕانکارییەکان لە بووندا دەکەونە گەڕ بەڵام خۆی جوڵان و گۆڕانکاری تێدا ڕوونادات.
سەرمەدی: هەمیشەیی.
سوپەرمان: مرۆڤی بەرز، ئامانجی مرۆڤە لە فەلسەفەی نیتشەدا.
سێبەری خوا: پاسەواری مێتافیزیکی ڕووناکبینە، کە بە دیدی نیتشە پاش ڕەتدانەوەی ئەو شێوە مێتافیزیکییە دەمێنێتەوە.

شت: یەکگرتنی فۆرم و ناوەڕۆک.
شیکردنەوە: وردکردنەوەی واتای چەمکێک بۆ لایەنەکانی.

عیرفان: زانینی سۆفیگەرانە بۆ ناسینی ڕاستی (حەقیقەی).

فۆرم: شێوە.
فۆرمەلیست: شێوەگەرایەتی، بایەخدان بە شێوە و بایەخ نەدان بە

ناوەڕۆک.

فینۆمینە: دیاردە، خۆدەرخستنی بوون. ئەو لایەنەی بوونە خۆی دەخاتەبەر ڕۆشنایی زانین.

فینۆمینۆلۆجی: دیاردەگەری. ئەو میتۆدە فەلسەفییەیە ئەدمۆند هۆسرڵ بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر واتای دیاردەی بوون دایمەزراند.

کارەکی پڕاکتیک سەقامگیرکردنی بیردۆزە بۆ پێکهێنانی گۆڕانکارییەکان.

کلتووری بازاڕی: نەریتی باوو، کە زۆرینەی کەسانی نێو کۆمەڵ شوێنی دەکەون.

کۆیایی مێژوو: گەیشتن بەدوا قۆناخی پێشکەوتن لە مێژوودا. بۆچوونێکی هیگڵیانەیە و مارکسیانەیە. بە دیدی ئەم دوو فەیلەسوفە مێژوو لە ئەنجامی گۆڕانکارییە دیالێکتیکەکەدا دەگاتە قۆناخێک، کە هەموو ناکۆکیەکانی تێدا وون دەبێ و لەوە زیاتر پێش ناکەوێت.

کۆجیتۆ: گوتە بەڵگە نەویستەکەی دێکارت (من بیردەکەمەوە کەوابوو من هەم.)

گەڕانەوەی سەرمەدی: بیروباوەڕێکە لای نیتشە، گوایە ژیان لە سوڕانەوەیەکی سەرمەدی بازنەییدایە و تاکەکان جارێکی دیکە دوای مردن دەگەڕێنەوە بۆ جیهان. ئەمەش بیروباوەڕێکی کۆنە و لەلای هەندێ فەیلەسوفی یۆناندا، وەکو پایتاگۆراس پەیڕەوی کراوە و لە (سمسارا) ی ناو فەلسەفە و ئاینی هیندوسیشەوە نزیکە.

گومانکاری: گومانایەتی، دڵنیا نەبوون لە ڕاستی.

گونجاو پەیدابوو یان پەیدا کراو، داهێنراو. بۆ نموونە پڕۆژەکانی بوون گونجاون.

گۆڕانی ڕادیکاڵ: گۆڕانی بنەڕەتی.

مردن: پێشمەرجێکی ئۆنتۆلۆجیە بۆ بوونی مرۆڤ. کۆتایی هەموو پرۆژەکانی بوونە.
مێتافیزیک: زاراوەیەکی یۆنانیە لە دوو بەش پێکهاتووە: مێتا (پاش) و فیزیک (سروشت)، کەواتای پاش یان ئەودیو سروشت دەبەخشێت. (ئەندرۆنیکۆس) ی شاگردی ئەریستۆ، کە نووسراوەکانی مامۆستاکەی کۆدەکردەوە و پۆلێنی دەکردن بۆ یەکەم جار ئەم زاراوەیەی بۆ ئەو نووسراوانەی ئەرستۆ دانا، کە لە ڕاستی ئەودیو سروشت و جیهانی ئەستووەوە دەکۆڵنەوە. پاش ئەمە، زاراوەکە جێگەی خۆی گرت و بەو لقەی فەلسەفە دادەنرێت، کە بە دوای بنەڕەتی بوون و چیەتی ئەو بنەڕەتەدا دەگەڕێت.
مێتافور: شوبهاندن.
مێتاگۆتار: (مێتا) وشەیەکی یۆنانیە واتای (پاش یان ئەودیو) دەبەخشێت. مێتاگۆتار بۆ ئەو بیردۆزە و بۆچوونانە بەکاردێت، کە هەمەکین و لێکدانەوەیان بۆ هەموو ڕووداو و دیاردەیەک هەیە بەبێ ئەوەی جیاوازییەکانی نێوان ئەم دیاردە و ڕووداوانە بخوێننەوە.
منی بەرز: لە بیردۆزی دەرونشیکاری فرۆیدا لایەنێکی (خۆ)یەو خاوەنی دەستەڵاتی ویژدانی و بەها بەرزەکانە.
مردنی نووسەر: زاراوەیەکە ڕۆناڵد بارت لە لێکۆڵینەوەکانیدا بەکاریهێناوە. بە دیدی ئەم بیریارە تێگەیشتن لە دەقێکی ئەدەبی بە تێگەیشتن لە نووسەرەکەیەوە نەبەستراوە چونکە نووسەر شتێک نیە هەبێت. ئەوەی گرنگە خوێنەر و خوێندنەوەی دەقەکەیە.

نەبوون: هیچ.

ناڕەسەن: بوونێکی خۆنەناس و نامۆ، بوونێکی داگیرکراو.
نادیار: شاراوە، نەناسراو یان بوونێک زانینمان لەبارەیەوە نەبێت.
نازانمکاری: فێرگەیەکی مێتافیزیکییە و بانگەشەی نەزانینی ڕاستییە دوورەکانی بوون دەکات.
ناسنامە: خسڵەتێک یان چەند خسلەتێکی تایبەت بە بوونێک، کە بەوا یان بەواندا بناسرێتەوە.
ناچارەکی: فێرگەیەکی بوون و پرۆژەکانی بوونی مرۆڤ بە هۆ دەرەکییەکانەوە دەبەستێتەوە و سەربەستی و دەستەڵاتی داهێنانی مرۆڤ ڕەتدەداتەوە. دوو جۆر ناچارەکی هەن: گیانەکی و ماتەریاڵی.
ناچارەیی یان ناچارەکی: ڕارەوێکی مێتافیزیکی و ئاکارییە ڕووداوەکان یان گۆڕانکارییەکانی ناو مێژوو بە دەسەڵاتێکی دەرەکییەوە بێجگە لە دەسەڵاتی مرۆڤ دەبەستێتەوە.
نێرسیست: زاراوەیەکی یۆنانیە و لەو ئەفسانەیەوە هاتووە، کە گوایە (نێرسیس) لاوێکی جوان بووە و خۆی خۆشویستوە و ئاوەڕی لە کچە هەرزەکارەکانی دەورووبەری نەداوەتەوە. کچەکانیش داوایان لە خوا کردوە سزای بدات. ڕۆژێک، کە لە بەر ئاوی گۆمێکدا تەماشای خۆی دەکات دەکەوێتە نێو گۆمەکەوە و دەخنکێت و لاشەکەشی دەبێت بە گوڵی نێرگس و لە ئاوەکەوە دێتەدەرێ. ئەم زاراوەیە لە سایکۆلۆجیدا بۆ کەسێکی خۆویست بەکار دەهێنرێت.
ناوەڕۆکی گیانەکی: ناوەڕۆکێکی لە ئەستو بەدەرە لە فەلسەفەی دێکارتدا سەرچاوە و بنەرەتی (خۆ) ی مرۆڤە. ناوەڕۆکی گیانەکی بە گوێرەی بۆچوونەکانی دێکارت خۆیەکی سەربەخۆ و خۆبژێوو نەگۆڕە.
ناوەڕۆکی پێدراو: ناوەڕۆکێک مرۆڤ خۆی داینەهێنابێت.

نامۆیی: نامۆیی: ناڕەسەنی، بوونێکی داگیرکراو، خۆ نەناس.
ناماقوڵ: بێ بناخە، بێ مەبەست، شتێک هۆش نەیسەلمێنێ.
نۆمینە: بوون-لەناو-خۆی، جۆرێک بوونە بە بیروڕای کانت لە ژوور بوونی ئێمەوەیە و سەرچاوەی هەموو شتێکە.

هەندەکی: Particular
هەمەکی: Universal
هەموو Total: هەمەلایەنی، هەمووایوتی Totality
هەبوو: هەیەی بوونێکی پڕ و خاوەن چیەتیەکی نەگۆڕ.
هاوجنسخواز Homosexuality: حەزو ئارەزووی جوتبوونە لەگەڵ هاوجنسدا. بۆ نموونە، نێرینە لەگەڵ نێرینە و مێینە لەگەڵ مێینەدا.
هاوجنسنەخواز Heterosexuality : حەزو ئارەزووی جوتبوونە لەگەڵ ناهاوجنسدا، بۆ نموونە، نێرینە لەگەڵ مێینە و مێینە لەگەڵ نێرینەدا.
هەڵوەشاندنەوە: میتۆدێکە هایدیگەر لە توێژینەوەکانیدا بە تایبەتی لەسەر مێتافیزیک بەکاریهێناوە و لای هەندێک لە بیریارانی پاش تازەگەری ڕۆڵێکی گرنگی هەیە. (Deconstruction یان *Destruktion*)
هۆ: سەدەم.
هیچگەرایەتی: بۆ چوونێکی ئۆنتۆلۆجیە، کە بنەڕەتی بوون بە (هیچ) دادەنێت. لەم توێژینەوەیەدا باسی دوو جۆر هیچگەرایەتیم کردووە: هیچگەرایەتی ڕەشبین و ڕووناکبین، یان هیچگەرایەتی ڕەشبین و بەرنامەگەری.
هیچگەرایەتی بەرنامەگەری: زاراوەیەکە بۆ هیچگەرایەتی نێو

فەلسەفەی نیتشە بەکارمهێناوە.

هیچگەرایەتی کلاسیکی: زاراوەیەکە مارتن هایدیگەر بۆ هیچگەرایەتی نێو فەلسەفەی نیتشە بەکاریهێناوە.

ویستی هێز: ناوەڕۆکی بوونە لە فەلسەفەی نیتشەدا.

ویستی ژیان: ناوەڕۆکی بوونە لە فەلسەفەی شۆپنهاوەردا.

یۆتۆپیا: زاراوەیەکی یۆنانیە لە دوو بەش پێکهاتووە: (ou) هیچ و (topos) جێگا، کە واتای هیچ جێگا یان شوێنێک دەبەخشێت، ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمجار تۆماس مور لە ساڵی ١٥١٦ بەکاریهێنا. بە گشتی، یۆتۆپیا بۆ ئەو کۆمەڵگایە دادەنرێت، کە هیچ کەموکورتییەکی نیە و کۆمەڵگایەکی گەش و پەرەسەندووە، کە هێشتا پەیدا نەبووە یان لە هیچ شوێنێکدا نیە و دانەمەزرێنراوە.

# سەرچاوەکان

مەلا عەبدول کەریمی مودەریس، دیوانی نالی ، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.

مەلا عەبدول کەریمی مودەریس، دیوانی مەحوی ، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا .١٩٨٤

د. محەمەد کەمال ، فەلسەفەی هیگڵ ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

د. محەمەد کەمال ، بوون و داهێنان ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ، ٢٠٠٤.

د. محەمەد کەمال ، ( کۆتایی خۆو گەڕانەوە بەرەو ناچارەکی لە بۆچوونەکانی پاش تازەگەرییدا)، گۆڤاری ئایینده، ژمارە (٥٥) ساڵی ٢٠٠٤، سلێمانی.

د. محەمەد کەمال ، ناهێلیزم و ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە، چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٥.

Aristotle, *Metaphysics*, translated by Richard Hope, Ann Arbor Paperbacks, The University of Michigan Press, 1960.

Aristotle, *Poetics*, translated with an introduction with notes by Malcolm Heath, New York: Penguin Books, 1996.

Barthes, Roland, *Image, Music, Text*, translated by Stephan Heath, New York: Hill and Wang, 1977.

Bergson, Henri, *Introduction to Metaphysics*, translated by T. E. Hulme, Indianapolis: The Bobbs-Merrill Co., 1976.

Cahoone, Lawrence E., (ed.), *From Modernism to Postmodernism: An Anthology*, London: Blackwell, 1997.

Cate, Curtis, *Friedrich Nietzsche*, London: Pimlico, 2003.

Copi, Irving M., *Introduction to Logic*, New York: The Macmillan Co., 1963.

Deleuze, Gilles, *Nietzsche and Philosophy*, translated by Hugh Tomlinson, London: Athlone, 1983.

Faubion, James (ed.), *Aesthetics, Method and Epistemology: Essential Works of Foucault 1954-1984*, 2 vols, New York: New Press, 1998.

Foucault, Michel, *The Foucault Reader*, Paul Rabinow (ed.), London: Penguin Books, 1986.

Freud, Sigmund, "Totem and Taboo", in *The Standard Edition of the Complete Psychological Works of Sigmund Freud*, Vol. 13, translated by James Strachey, London: Vintage, 2001.

Freud, Sigmund, *Civilisation and its Discontents*, translated by Leo Bersani, New York: Penguin Books, 2002.

Freud, Sigmund, *Introductory Lectures on Psychoanalysis*, translated by James Strachey, New York: Penguin Books, 1991.

Harvey, David, *The Condition of Postmodernity: An Enquiry into the Origins of Cultural Change*, London: Blackwell, 2000.

Hegel, G. W. F., The Phenomenology of Mind, translated

by J B Bailhe, New York: Harper & Row publishers, 1967

Heidegger, Martin, “Question Concerning Technology”, in *Basic Writings*, translated by David Farrell Krell, London: Routledge, 1996.

Heidegger, Martin, *Being and Time*, translated by John Macquarrie and Edward Robinson, London: Blackwell, 1997.

Heidegger, Martin, *Contributions to Philosophy (From Enowing)*, translated by Perviz Emad and Kenneth Maley, Bloomington: Indiana University Press, 1999.

Heidegger, Martin, *Nietzsche*, 4 vols, translated by David Farrell Krell, New York: Harper and Row, 1991.

Heidegger, Martin, *Philosophical and Political Writings*, Manfred Stassen (ed.), London: Continuum, 2003.

Heidgger, Martin, *An Introduction to Metaphysics*, translated by Ralph Manheim, New Haven: Yale University Press, 1987.

Jaspers, Karl, *Nietzsche: An Introduction to the Understanding of his Philosophical Activity*, translated by C. F. Wallraf and F. J. Schmitz, Baltimore: Johns Hopkins University Press, 1997.

Kaufmann, Walter, *Nietzsche: Philosopher, Psychologist, Antichrist*, New Jercy: Princeton University Press, 1974.

Klossowiski, Pierre, *Nietzsche and the Vicious Circle*, translated by Daniel W. Smith, London: Continuum, 2005.

Lyotard, Jean-Francios, *The Postmodern Condition: A Report on Knowledge*, translated by Geoff Bennington and Brian Massumi, Manchester University Press, 1997.

Magnus Bernd and Higgins Kathleen M. (eds.), *The Cambridge Companion to Nietzsche*, Cambridge University Press, 1999.

March, Jenny, *Cassell's Dictionary of Classical Mythology*, London: Cassell, 2002.

Nietzsche, Friedrich, "Antichrist", in *The Portable Nietzsche*, translated and edited by Walter Kaufmann, New York: the Viking Press, 1972.

Nietzsche, Friedrich, "Beyond Good and Bad", in *Bascic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, introduction by Peter Gay, New York: The Modern Library, 1995.

Nietzsche, Friedrich, "Ecce Homo", in *Bascic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, introduction by Peter Gay, New York: The Modern Library, 1995.

Nietzsche, Friedrich, "Seventy-Five Aphorisms", in *Bascic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, introduction by Peter Gay, New York: The Modern Library, 1995.

Nietzsche, Friedrich, "The Birth of Tragedy", in *Bascic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, introduction by Peter Gay, New York: The Modern Library, 1995.

Nietzsche, Friedrich, "The Case of Wagner", in *Bascic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, introduction by Peter Gay, New York: The Modern Library, 1995.

Nietzsche, Friedrich, "The Genealogy of Morals", in *Bascic Writings of Nietzsche*, translated by Walter Kaufmann, introduction by Peter Gay, New York: The Modern Library, 1995.

Nietzsche, Friedrich, *The Gay Science*, translated by Walter Kaufmann, New York: Vintage Books, 1974.

Nietzsche, Friedrich, *The Twilight of the Idols*, translated by Thomas Common, New York: Dover Publications, 2004.

Nietzsche, Friedrich, *The Will to Power*, translated by Walter Kaufmann and R. J. Hollongdale, New York: Vintage Books, 1968.

Nietzsche, Friedrich, *Thus Spoke Zarathustra*, translated by Thomas Common, introduced by Nicolas Davy, London: Wordsworth Classics of World Literature, 1997.

Norris, Christopher, *What is Wrong with Postmodernism*, Bultimore: The johns Hopkins University Press, 1990.

Plato, "Phaedo", in *Plato's Complete Works*, edited with an introduction and notes by John M. Cooper, Indianapolis: Hackett Publishing Company, 1997.

Preminger, Alex, *Princeton Encyclopaedia of Poetry and Poetics*, Princeton University Press, 1975.

Schopenhaur, Arthur, *The World as Will and Idea*, 2 Vols, translated by E.F.J. Payne, New York: Dover Publication, 1969.

Seigel, Jerrold, *The Idea Of the Self*, Cambridge University Press, 2005.

Sophocles, *The Three Theban Plays*, translated by Robert Fagles, New York: Penguin Classics, 1984.

Sim, Stuart (ed.), *The Routledge Companion to Postmodernism*, London: Routledge, 2001.

Solomon, Robert and Sherman, David (eds.), *The Blackwell Guide to Continental Philosophy*, London: Blackwell, 2003.

Spinoza, Benedict, *Ethics*, translated by Andrew Royle, London: Everyman's Library, 1970.

Suhrawardi, Shahab al-Din Yahya, Hikmat al-Ishraq, (The Philosophy of Illumination), translated by John Walbridge and Hossein Ziai, Porov, Utah: Brigham Young University Press, 1999.
Tanner, Michael, "Nietzsche", in *German Philosophers*, Oxford: Oxford University Press, 1997.

Vattimo, Gianni, *Nietzsche: An Introduction*, translated by Nicolas Martin, California: Stanford University Press, 2001.

Wicks, Robert, *Nietzsche*, Oxford: Oneworld, 2002.

Wicks, Robert, Modern French Philosophy: From Existentialism to Postmodernism, Oxford: Oneworld, 2003.

# ئیندێکس

د



ر



ز



س